ENDESE

ڕۆمان

# سەردەمی گریانی بەڵقیس

جەبار جەمال غەریب





ناوی کتێب: سەردەمی گریانی بەڵقیس
ناوی نووسەر: جەبار جەمال غەریب
بابەت: ڕۆمان
نیگاری بەرگ: ئەمین زەکی بەگ
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٨
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٨٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٢١٠)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێ دراوە.

نیگاری بەرگ لە ئەرشیفی بنکەی ژینەوە وەر گیراوە

پێشکەشە بە بابم...

کە وەک زەنگیانە بەسەر تەواوی ڕۆمانەکەدا بڵاو بۆتەوە...

بەبێ ئەوەی لەناویدا ژیابێ...

جەمال غەریب دنیا بێ تۆ بەتاڵە.

# ١

یەکەم جار بوو ئاوا بێپرس لە ماڵێ بێتە دەرێ، پرس بە کەس نەکات و ڕێگا بگرێتە بەر، نەک بۆ بازاڕ و ماڵە خزم و سەردان، نا. بێتەدەرێ و ڕاست ڕێگای گەراج بگرێتە بەر. بەڵقیس بەدەگمەن بەتەنها هاتۆتە بازاڕیش، ئەو نەک ماڵ و سامان هەموو شتێکی بە موڵکی مێردەکەی دەزانی بە خۆشییەوە.

ئەو ئێستا هیچ نابینێ ڕێگایەکی قیری ڕەش و وژەی ترومبێل لە گوێیدا دەزرینگایەوە. هاوسەفەرەکانی بە دەنگی بەرز قسە دەکەن و پێدەکەنن و جگەرە دەکێشن. دەشێ هاواریان کردبێ و گریابیشن، بەڵقیسی مەلا محەمەدی میزان، ئاگای لەوان نییە و وەک پشکۆ داگیرساوە، بەلام لە ناخی خۆیدا.

ئێستا ئەو لە شار و ولات و زەمین دابڕاوە و تەنها بیر دەکاتەوە، ئەو هیی ئەوە نییە هەر وا سووک و ئاسان فڕێ بدرێتە ناو کێشەیەکی وا قورسەوە، تا ئێستا کە تەمەنی

چلوحەوت ساڵی تەواوە هەرگیز هێندە تەنها و بێچارە و غەمگین نەبووە.

"خوشکم لەکوێ دادەبەزی؟"

ئەو ئاگای لێ نییە. دەنگەکە دەبیستێ، گەیشتوونەتە ناو شار، جا ئەو دەپرسێ، "ئێرە هەولێرە؟"

"بەڵێ، نەتوت لەکوێ دادەبەزی؟"

"شەست مەتری لەکوێیە؟ وتیان لەوێوە، بە دەستەڕاستدا، دەچیتە... لای ئا، شوێنێک بە ناوی سەیداوا."

"ئەو شەقامە درێژە شەست مەترییە، بازنەییە، کوێی شەست مەتری، زانیمان، کوێی سەیداوا؟"

"هەر لای تەنکیەکەی سەیداوا."

شوفێرەکە وەک دۆست و ئاشنا سەیرێکی کرد و گوتی، "ئاسانە."

هەر لای تەنکیەکە دابەزی، یەکەم ئاشنای بەڵقیس لە هەولێر، ئاو بوو، خۆ کەسیش تا ئێستا لە نیازی ئاو تێنەگەیشتووە. چەند بەرد و بلۆکێک لە سێبەری تەنکییەکە دانرابوون. خەت و هێڵی سێڕسکێن و دامە. لەسەر بلۆکێک دانیشت. بەوردی ڕوانییە کۆڵان و دەرگاکانی دەوروپشتی، چەند کەس هاتن و چوون، لەوسەرەوە کچێک هات، قژی کاری بڕیبوو، زەرد بوو، بـــا دەیبرد. هەستایە پێ، لە دڵەوە تاسا و دڵخۆشیش بوو، چاوەڕێ نەبوو وا زوو بیدۆزێتەوە (هەوە، ڕۆیشتنەکەی، سنگی لەپێشی، هەنگاوی گەورەی، هەوە، خۆیەتی، ئەوە قژەزەردەکەیەتی) کچەکە ڕاست بەرەو ڕووی ئەو هات، لە جۆگەلە باریکەکەش پەڕییەوە، بەسەر کارتۆنی دامە و بەردەکاندا هەنگاوی هەڵێنا، ئەو هەر وا

حەپەساو تەماشای دەکرد. تێپەڕی، بێ ئەوەی سەیری بکات تێپەڕی. کچەکەی ئەو چاوەکانی سەوزن، سەوزێکی قووڵ، هەو نەبوو هەر وا دانیشتەوە. ئەو بەهەڵەچوونەش فێنکایەتییەکی بە دڵیدا هێنا، با هەویش نەبووبێ، خۆ ئومێدێکی پێ دابوو، لەوسەری کۆڵانەکە تا لای کارتۆنەکان هەناسەی کچەکەی بۆ هێنا.

ئەهریمەنێک، جادووێک دەستی وەشاندووە و ڕەنگی چاوەکانی گۆڕیوە بە قاوەییی تۆخ. ئاخ دوو چاوی سەوز چەند بێئومێدی کردووە. پێشتریش ئەو حەزی لێ بوو کچەکەی وەک خۆی چاوەکانی زەرد بن، زەردێک کەمالی حاجی بەکری مەڵکەنی شێتوهارکردووە، لەو ڕۆژەوەی چاوی پێ کەوت، نەیتوانی فەرامۆشی بکات، دەستی کاری نەگرت تا بەتەواوی دڵیی داگیر کرد، تا نەیخواست و نەیگواستەوە، ئۆقرەی نەگرت. لەو کاتەدا بەڵقیس مووچڕکێکی پێدا هات و گوێی لە دەنگی مێردەکەی بوو، "من بەرگەی ئەو گریانەی تۆ ناگرم، بەسە، کوڕەکانیشت شێت کرد."

"ناتوانم، ناتوانم تازە بەشی من هەر گریانە."

کەمالی حاجی بەکری مێردی، ئەو ڕۆژە نەیویست پێی بڵێ، "هێشتا گریانی قووڵی تۆ ماوە" نەیوت گریانەکەت هەڵگرە، نەیوت جارێ چیت دیوە. نەیوت تۆ دەبێ بگریەی و تا قیامەت نووکەت بێ.

بۆ خۆیشی نەیدەویست ژنەکەی بگریا، خۆ ئەو ژنەکەی خۆی لە دڵی خۆشتر دەویست، لەسەر ئەو خوێنی ڕژاوە. هەموو دنیای بە ژنەکەی گۆڕیبۆوە و خۆیشی بە براوە دەزانی. خزمەکانی پێیان وتبوو، "تۆ تازە هەموو شتێکت

دۆڕاند،" ئەویش وتبووی، "من بەڵقیسم بردەوە،" لە دڵی خۆیدا ئەوەشی بۆ زیاد کردبوو"دنیا بۆ ئێوە و بەڵقیس بۆ من." کەمالیش ڕاستی دەکرد، دنیا بۆ هەر کەسەو ڕاستییەکە، بۆ کەمالیش بەڵقیس بوو، بۆ ئەو دنیا یەک ڕاستیی تێدا بوو، ئەویش بەڵقیس بوو، بەڵقیسیش ڕەونەقێک، ئاوێکی پڕشنگدار لە چاوە زەردەکانیدا بوو، ئەو ڕەنگەش بەسەر تەواوی پێست و جیلوەی جەستەیدا بڵاو ببۆوە. تاقە کێشەی ئەوە بوو، ئەو ساڵەی بەڵقیسی گواستەوە نەیدەتوانی ماڵ جێ هێڵێ. دەستی لە کار گیرنەدەبوو، هەموو شتێک ببووە دەنگی بەڵقیس و بانگی دەکرد. کەمال حەوت دانە ساڵ لە بەڵقیس گەورەتر بوو، بەڵقیس پرسیی، "چۆن بە نیگایەک عاشقم بووی، خۆ جارێ نامناسی؟"

کەمال وتی، "من کوڕی حاجی بەکری بەزازم، تەنها کوڕە بەزاز دەزانێ بە نیگایەک ئاوریشم لە تەواوی قوماشی دنیا جیا بکاتەوە، ئاوریشمێک کرمەکەی لە دروستکردنیدا گیانی دابێ. ئەو قوماشانەی لە ئاودا ناچنەوە و تێک ناچن، دەگمەنن."

بەڵقیس وەک ئەو حەزی لەو قوماشانە نەبوو ڕەنگیان دەچۆوە، بەڵام لەوەدا لە یەکتر جیا بوون، بەڵقیس حەزی لە عەشقێک بوو، نەک ڕەنگی بۆ خۆیشی لە دڵدا بتوایەتەوە. ئەوانە بەسەر چوون، ئەو ئێستا لە دڵی منداڵەکانیدا تواوەتەوە، هەر بەشەی لە دڵی یەکێکیاندا، هەمووشیان لە دڵی ئەودا، گەورەکەیان بەندی دڵی برد و ئەوی دیکەیان شادەمار، یەکی دیکەیان ڕەگی خوێنهێن، کچە چاوسەوز و قژزەردەکەی، کولمە پان و ددان هەر وا تۆزێک کەروێشکانیەکەی، هیچی

بۆ نەمابۆوە بیبا، ئەو دوای پێنج برا هاتبوو، دوامنداڵی بوو، براکانی لە تێری، بەشی خۆیان لە دڵی بردبوو، ئەو تەنها ڕەنگی دڵی بۆ مابۆوە، ڕەنگەکەی بردبوو، ڕەنگەکە و بەس. بەبێ ئەو ڕەنگە گەش و ئاڵە پارچەکانی دیکەی دڵی، ئەو پارچانەی کەوتبوونە لای هەر پێنج برایەکەی، دەڕزین و بۆگەنیان دەکرد، بەبێ ئەو خوشکە هەنگوین و تاقانەیان، دڵی براکانیشی بێڕەنگ و خامۆش دەبوو، براکانی چی دیکە نەیاندەتوانی بەندی دڵی دایکیان بن.

بەڵقیس هەرگیز بە خەیاڵیشیدا نەدەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان بەلای ئەو تانکییە ئاوەدا تێپەڕێت، هەرگیز ئەو ناوەی نەبیستبوو، سەیداوا، هەر وا بیری بۆ ئەوە چوو کە سەید ئەو شوێنەیان ئاوەدان کردبێتەوە. ئێستا شتێکی لێ دەزانی، ئەو چاودێریی ماڵێکی دەکرد، ماڵێک و بەس، کۆڵانەکەیشی دیاری کردبوو، ئا، ئەوەی دەستەڕاست، تاک دەرگایە، ئەو هەر وا سەیری کۆڵانەکەی دەکرد، کوڕێک لەسەری ئەو سەرەوە پەیدابوو، ڕەشتاڵە، قژڕەش، توزێک باریکەلە و بالابەرز. ئا هەوە، ئەوە ئەوە، ئەو گەردەلوولەیە کە بەدوایدا دەگەڕێم. دۆزیمەوە، درۆیە هەموو قسەکانیان درۆیە، ئەوەتا هاتۆتەوە ئێرە، ئەوەتا بە چاوی خۆم دەیبینم.

بڕیاری دا جارێ نەجووڵێ و هەر لە شوێنی خۆیەوە لەو هەتیوە سەرچەورە بڕوانێ. تا دەگاتە ماڵی خۆیان،

"با بچێتە ژوورێ، جا بەتەواوی هەم لە خۆی و هەم لە ماڵەکەیان دڵنیا دەبم کە خۆیەتی، ئەو کات بەدوایدا دەچم، لە دەرگا نادەم و یەکسەر دەچمە ژوورێ، تەنها من دەزانم چی دەبینم."

خەریکە شاگەشکە بێ، ئەوەتا، ئەوەتا کچەکەم، ئەوەتا چاوە هەزار ڕەنگەکانی، کوڵمە پان و خڕ و گۆشتن و بەبریقەکانی، قژە ئاڵتوونییەکەی:

" خودایە تەنها یەک جاری دیکە دەست بەو قژە نەرم و ئاوریشمییەیدا بێنم."

هەر لەبەر ئەو قژەی، باوکی ناوی ناوە گەنمەشامی، گوایە قژی وەک ئەو تاڵە باریکانەیە دەوری گەنمەشامییەکەیان داوە، ئەوەش هەر لەبەر نەرمییەکەی.

"ئا دەچمە ژووری و خۆم گران دەکەم، تۆزێک بەخەمباری و هەندێک بە گلەیی و سەرزەنشتییەوە تەماشای دەکەم، بەڵام دەزانم ئەو کە سەری بەرز کردەوە و منی بینی (ڕووناکییەک لە دڵیەوە هاتە سەر ڕوخساری،) هەر بەئاستەم قژە شل و خاوەکەی لەسەر چاوی لا دا، یەکسەر هاوار دەکات، وەک منداڵەکەی جاران هاوار دەکات،

'دایکە، دایکە بەساقەی پێڵاوەکانت بم' وەک با بەرەو ڕووم دێ."

بەڵقیس دڵی، ناخی دڵی کچەکەی خۆی دەناسێ، لە بەرچاوی بێ یان دوور بێ، لە بەرچاوی بێ یان لە بنی دنیا بێ، دەزانێ دڵی چۆن لێدەدات. بەپەلە، خێرا و سەرلێشێواو، یان ئارام و لەسەرخۆ.

کوڕە هێواش هێواش سەر دەکەوێ، باریک و قژشۆڕە، هەوە، دڵنیایە هەوە، ڕاستە هەرگیز ئەو کوڕەی نەدیوە، نایناسێ، ئاشنای نییە، هەر پرسیویەتی و گەڕاوە، ناوونیشان و شێوە و ڕۆیشتن و هەموو شتێکی لەبەر کردووە، ئا هەوە، ئەوەتا وردەوردە دێ،

"با هەر بچێتە ژووریَ، ڕاست لەدوای ئەو ئەچم، نا وەک کەمال ناکەم، وەک کوڕەکانیشی ناکەم، هەموویان سەرشێت و تووڕە و هەڵەشەن، بۆ ئەوە نابن لە کارێکی ئاوادا لەگەڵت بن."

کەمال و کوڕەکانی تەنها ببوونە هەڕەشە و جنێو، جنێویان بە کچ و توخمی کچ دەدا، وەک بۆ خۆیان فریشتە بن و دڵیان نەبیَ. جنێویان بە گەنج و عەشق و برادەرایەتی و وەفا و جوانییش دەدا، جنێو بە هەولێر، کەمال وتبووی،

"کەس نەما، هەولێری حەیای من بەریَ! هیچی پیَ نالێم، هەر هیچ، پێلاوە بۆگەنەکانی دەخەمە سەر تەپڵی سەرم، من قوربانت ئەبم."

کە چاوی کەوتبووە سەر بەلْقیس توندتر وتبووی،

"ئاخر ئەوان زێرابیان نییە، شارەکەیان یەکپارچە بۆگەن و زبڵە، پێلاوە گواوییەکانی دەخەمە سەر تەپڵی سەرم، ماچیان دەکەم، دەبم بە نۆکەر و بەردەستیان، بەس با بیدۆزمەوە، با بەس دەستم بیگاتیَ، بۆخۆیان نا، گەڕەکەکەیان نا، ئەو شێخ و منارە و قەڵا نەگریسەشیان پێوە دەسووتێنم."

بەلْقیس سەرەتا هیچی نەگوت، نەیگوت کەمال وسبە، نەیگوت بیبڕەوە، نەیگوت هەموو کەس باسی عەشق و کچ و خۆشەویستی بکات، تۆ مەیکە، تۆ وسبە. نەیگوت کەمال واز بێنە با دەمت خوار نەبیَ، نا. بە پێچەوانەوە قسەکانی هەندیَ جار بەشێک لە تووڕەییی ئەویشیان خاو دەکردەوە، لە دڵەوە دەیگوت هەقیەتی، هەقیەتی خیانەتی لەگەڵ کراوە، کوژراوە، لە ناخەوە کوژراوە، لە ناخەوە نەزیفە، مافی خۆیەتی ئەویش حەقی خۆی بکاتەوە، لە تاریکیدا کچەکەی خۆی خەنجەری لیَ داوە.

ڕاستە کەمالیش عاشق ببوو، عاشقی بەڵقیس ببوو، شێت ببوو، برادەرەکانی گوتبوویان،

"عاشقی چی! کەمال شێت شێت بووە."

مەردانە هات داوای کرد و ئارامی گرت، بەرگەی تف و شەقی گرت، بەرگەی جنێو و سووکایەتیی گرت، بەرگەی هەڕەشە و لێدانەکانی گرت، بەرگەی چەقۆی ئامۆزا شەلاتییەکەی بەڵقیسی گرت و وازی نەهێنا. ئاخر دڵداری کورد دەبێ بەرگە بگرێ، بەرگەی لێدان و جنێو و هەڕەشە، ئەوە دیاری و پاداشتی خۆشەویستییە، هەموو لەپێناو دڵدارەکەی، خۆشەویستی لەو وڵاتەدا بە خوێوە دەخورێ، خوێی سەر برین، خوێیەکە جنێو و سووکایەتی و هەڕەشەیە. کەس نەبووە هەر ئاوا سووک و ئاسان خۆشەویستیی بەبێ خوێ خواردبێ.

کەمالیش خواردی، ئەوەی خوا پێی خۆشە خواردی، بەرگەی گرت و ئارامی گرت، تا گەیشت، تا بە بەڵقیس گەیشت. ئەوەتا ئێستا بزمارێک چۆتە بنپێی کەمال، بزمارێکی ژەنگاویی درێژ، لە بنی پێی ڕاچووە، تا سەر دڵی، تا سەر دڵی سمیوە.

"خۆزگە سەد خۆزگە ئەوەندە درێژ بایە دڵیشی کون کردبا."

کەمال وای گوتبوو. گوتبووی،

"خۆزگە ئەو دڵە نەفرەتییەی کون کردبام، تا ئەو ڕۆژە نەبینم، تا ئەو ڕۆژە نەبینم کە شێرپەنجە و ژەهرەماریش ناو بنێن خۆشەویستی."

کەمالیش ڕاستی دەکرد، خەبەرێکی ئاوا، نە گوللەیە

بیگریەوە، نە نەخۆشییە چارەی بکەی، نە مردنە سەبووریت بێ، ئەو هەواڵە هیچیان نییە و هەموویانە.

بەڵقیس لە بەرچاوی ئەوان وا نەبوو، یەک تاقە قسەشی بە کچەکەی نەگوت، هەر کە خەبەرەکەی بیست، کونێک، کانییەک لە چاویدا تەقی، بە جۆگەلە فرمێسک ڕژایە سەر کوڵمی، بە تەشت فرمێسک ڕژایە ناو کۆشی، بە لافاو فرمێسک ڕژایە ناو حەوشەی ماڵەکەیان، بە ڕووبار فرمێسک ڕژایە ناو گەڕەکەکەیان. بۆ یەکەم جار کەمال بەرامبەر فرمێسکەکانی بەڵقیس تەسلیم نەبوو، دڵی نەتوایەوە و ژنەکەی نەلاواندەوە، بەڵکو چاوی سوور و دەنگی پڕ بوو، باڵی بەڵقیسی گرت و گوتی،

"ئەو فرمێسکانە کۆتاییی پێ بێنە، ئێستا نا، کاتی گریانت زۆرە، کاتی گریانت کۆتایی نایەت، دەبێ سەردەمێک بە ناوی گریانی تۆوە بکرێ، ئێستا نامەوێ کەس بزانێ، نامەوێ وا زوو ئابڕووم بچێ، نا، نامەوێ کەس بەتەوسەوە پێم بڵێ، 'پێم ناخۆشە، بۆ مەسەلەی کچەکەت پێم ناخۆشە،' نا ئەوە من نیم بەرگەی شەرمەزاریی کوڕەکانم بگرم، ئێستا ئەو فرمێسکانە بگرەوە کاتی گریانت زۆر دەبێ."

ئەو نەیتوانی، بەڵقیس نەیتوانی فرمێسکەکانی بگرێتەوە، خۆ بەدەست ئەو نەبوو، خۆ بە قسەی ئەو نەدەڕژا، هەر وا وەک کەڵلەی سەری بووبێتە زەریای سەرشێت، بووبێتە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، چاوەکانی ببوونە تاڤگەکانی نیڤادا، فرمێسکی دەباراند، ئەو دەیویست یەک تاقە فرمێسک نەڕێژێ، ئەو دەیویست کچەکەی دەست بکەوێتەوە و بەو قژە زەردەی کە حەیای ئەوی بردووە، تا دوکان ڕای کێشێ

و لەوێ فڕێی بداتە ناو دەریاچەکەوە، تا ماسییەکان بیخۆن و ئاسەواری نەمێنێ، لەو چاوە پڕتەشەرانەی کەمال ڕزگاری ببێ.

ئەو لەوە تووڕەتر بوو بگریا، ئەو لەوە گڕگرتووتر بوو بگریا، سینگی لەناوەوە ڕادەژا، کەچی ئەو فرمێسکە نەفرەتییانە نەوەستان و نەوەستان.

ڕقی لە خۆی هەستابوو، ڕقی لە فرمێسکەکانی، لە چاوی، نابێ بۆ کچێکی سپڵە و سەرشێت بگریەی، بۆ کچێک بیر لە دایکی نەکاتەوە، تەنها بیر لە هەوەس و ناوگەڵی بکاتەوە، ئاخر کە کچێک کەتنێک دەکات، قاچی دەترازێ، ئەوە دایکی دەکەوێتە مەنجەنیقی لۆمە و تانەوتەشەرەوە. ئەوە دایکە دەکەوێتە بەر هێرش و جنێو، ئەوە دایکە دەبێتە نیشانەی تیری هەمووان، یەک ڕاستیش بۆ دڵی، بۆ ناو هەستوسۆزی. بەڵقیس هەم بۆ کچەکەی دڵی شکابوو، هەم هەمووان چاوی سەرزەنشتیان لەو بوو. ترسابوو، لە کەمالیش ترسابوو، لەو ڕستە پڕهەڕەشە و گومانەش ترسابوو،

"جارێ مەگریە، کاتت زۆر ئەبێ بۆ گریان،" پێشی وتبوو، "هۆی گرینگترت ئەبێ بۆ قژڕنینەوە."

ئاخر ئەو کەمالی باش دەناسی، پیاوی هەڕەشەوگوڕەشە نەبوو، پیاوی کەتن و کەتنبازی نەبوو. مەبەستی چییە؟ چیی لەبن سەرە؟ چ هەواڵێک دەزانێ؟

بەڵقیس باوەڕیشی نەدەکرد کچەکەی پشتی لەو کردبێ، پشتی تێ کردبێ و ئەوی خستبێتە بەر گەردەلوول، خۆ کچێکی سادە و ساویلکە نییە، خوێندوویەتی و ئەوە خەریکە زانکۆ تەواو دەکات، ئەو هەموو مامۆستا زانا و دانایە

دەرسیان پێ وتووە، نا شتێک هەیە ئەو وا ناکات، نهێنییەک هەیە، سیحرێکی لێ کراوە، دەنا ئەو دڵی بەسەر دایکیەوە دەر دەچێ. دەبوو کەس نا، بەڵقیس بیزانیبایە، هیچ سیحرێک جگە لە عەشق و شێتبوون دڵی کچ هەلاهەلا ناکات.

ئاخر ئەوان وا نەبوون، چەند جار، بەگەورەییش بەڵقیس سەری کچەکەی خستبووە سەر ڕانی خۆی، بەند و گۆرانیی بۆ وتبوو، "زاوای خۆم لە تیشکی هەڵدەکێشم، ناهێڵم حەوت ڕۆژان لە ماڵێ بێتە دەرێ، بە شانی خۆم ئاوی بۆ دەکێشم. کوڕێک بێ هاتبێ لەگەڵ باران و تەرزە، بە براکانی بڵێم خۆشەویستیی مێردی کچە تاقانەکەم بۆ ئێوە فەرزە."

***

دیسانەوە سەرنجی کوڕە باریکە، ڕەشتاڵە، قوپاوەکەی دا، دیسان گوتیەوە هەوە، خۆیەتی، ئەوەتا دەموچاوی هەمووی زیپکە و کونکونە، دەڵێی ئەهریمەن دەستی لێ وەشاندووە، بەراز پێیدا ڕشاوەتەوە. ڕاستە خەمی هەموو دنیا لە ناوچاوانی دایە، دەردی دنیا بە ڕوخساریەوەیەتی. ئەو وای بیستبوو، ئەوەتا واشە، کەمیشیان وتووە، "کرمی ڕەشی پیس."

کوڕە بێ خەیاڵ دەهات، بــــا، قژە چەورە ڕەشەکەی دەلەراندەوە. پانتۆڵێکی ڕەشی فشی لە پێ بوو، بلوزێکی ملداری دیسان ڕەش. بەڵقیس دڵنیا بوو هەوە، ئەو سەگەیە "کەماڵ حەقیەتی، ئەو پیاوە خانەدانە، کوڕە نازدارەکەی

حاجی بەکری مەڵکەندی، کوڕی بەزازە بەناوبانگەکەی سلێمانی بکەوێتە داوی ئەو هەتیووچەیە! ئاخ کچ چۆن پیاو ڕیسوا دەکەی، ئەگەر تۆ نەبی، ئەگەر دڵە مێشکەی تۆ نەبێ، بۆ ئەو هەتیوە دەتوانێ سڵاویش لە کەمال بکات."

بەڵقیس سەرەتا پێی وا بوو، ئێستاش خەریکە هەر وا دەکات، ڕاست بەرەو ڕووی بڕوات، ناوچاوی بکاتە تف، پێی بڵێ،

"هەتیوی کۆتربازی حیز، نەخۆشی دڵگوشراو، مێش و مەگەز و ماخۆلیا، کەست نەدۆزیەوە، بەسەر ئەو نوورەی دڵی منەوە نیشتیەوە."

نا ئێستا نایەوێ وا بڵێ، چاوەڕێ دەکات بچێتەوەماڵێ، جا بەتەواوی دڵنیا دەبێ ئەو گەمژەیەیە، لەدوای ئەو ڕاست دەچێتە ژووری، هاوار دەکات، قژی خۆی دەڕنێتەوە، ئەو گەڕەکەیان دێنێتە سەیر. ئەوەشی پێ باش نییە، وا ناکات، هێمن دەوەستێ و چاوەڕێ دەکات کچەکەی نیشان بدەن. نا، ئەوەش نا، دەپاڕێتەوە و بەسەر پێڵاوەکانیاندا دەکەوێ. نا، هیچ ناکات و ئارام وەک میوانێکی ئاشنا سڵاو دەکات. نا، شێواوە نازانێ چی بکات. ئەو کاتە کە چووە ژووری دەزانێ.

بەڵقیس دەردی دیبوو، زۆریش، بەڵام لە هیچیان تەنها نەبووە. جارێک عەشق پێش کەمال، قژی زەردی هەتیووێکی باریکە هەڵی خەڵەتاند، چاکیشی هەڵخەڵەتاند، جا کچ تەنها ئەو کاتانە ژیاوە کە هەڵخەڵەتاوە، کوڕە ناسک و قژدرێژ و سپیکار بوو، ئاخر کچ نییە ئەو کوڕەی دیبێ و عاشقی

نەبووبێ، دەنگە ناسکەکەی، سەد جار قژی بۆ لادا و چاوی لێ داگرت ئەو هەتیوە، نە سەرنجی دایە و نە وەڵامی دایەوە. هەر ناوی هاتبا، بەڵقیس سەد جنێوی شیرینی پێ دەدا، تانە و توونی دەهاویشت، بەڵام درۆ، لە دڵەوە عاشقی بوو، عاشقی هەموو شتێکی، هەتا عاشقی ئەو پێڵاوانەش بوو کە ئەو هەتیوە یاریی پێ دەکرد. بەوە تەواو نابێ، ئەو هەتیووە دوو عەیبی هەبوو، یەکەمیان زۆر بەلارولەنجە و ژنانە بوو، دڵی بەڵقیسی بەتەواوی پڕ نەدەکردەوە. دووەم ئەو هەتیوە لووسکەڵە سەد دۆست و دەنگی هەبوو، بەڵقیس لەلای دەستەخوشکەکەی وتبووی، "ئەوەی عاشقی کوڕەی سەد دەنگ بێ، واتا عاشقی کەس نەبووە." ئەو داخەی هەر لە دڵدا بوو کە لەگەڵ کەمال یەکتریان دی، کەمال گیرۆدەی بوو، کەمال وەک بروسکە و لافاو هێرشی هێنایە سەر دڵی، ئاسەواری کوڕە ناسکۆڵە و تام نێرەمووکەکەی لە بیرەوەریشیدا نەهێشت.

هێرشی کەمال هەر بۆ سەر ئەو نەبوو، بۆ سەر ماڵ و کۆڵان و گەڕەکەکەشیان بوو. خەمی ئەو عەشقە بەشێکی بچووکی کەوتبووە سەرشانی.

بەڵقیس کە تەرمی براکەشی لەقەراخ شار دۆزرایەوە، دیار بوو کە شەو کەوتۆتە کەمینی پاسەوانانی دەوڵەتەوە، دڵی سەد پارچە بوو، لەوەشدا ئەو تەنها نەبوو، ئەو کۆستە خەمی دایکی و باوکی و براکانی و خوشکەکانی و تەواوی شار بوو. لاشەکەیان لە سەرچنار دیبۆوە، بریندار ببوو، وتیان بەسکەخشکێ تا سەر ئاوەکە هاتووە، لەوێ ئەوەندە خوێنی لە بەر ڕۆیشتووە، تا

گیانی داوە، هەر بەڵقیس نا، بەتەنێ، هەموو خەڵکی شار تا مانگێک بە ترس و حەسرەتەوە ئاویان دەخواردەوە. ڕەنگی ئاوی تەنکی و بەلووعەکانیان لا سوور ببوو.

نا ئێستا وەک جاران نییە، لە خەمی ئەو جارەدا تەنها و بێکەسە، ئەوان کەمال و کوڕەکانیشی لە خەمی تۆڵەسەندنەوە و پیلان و بوغز و سەد شتی ترن، ئەو لە خەمی کچەکەیەتی، ئەو خەمە خەمی کەسێک نییە، خەمی سەد، خەمی هەزار کەسە، ئاخر خەم لە تەنهاییدا بەهێزە، سەد دەست و لاقی هەیە، ئا خەم بە کەسی تەنها دەوێرێ و کەوڵی دەکات، خەم وەک دۆست و ئاشنا ڕاست خۆی بە دڵتدا دەکێشێ، لێدانی دەگەیەنێتە هەزار، سینگت پڕ دەکات لە تەوژم و گڕ، لە چاوتەوە هەڵدەڕژێت و لە پەلوپۆت دەخات، ئەوە کاتێک خەمەکە تەنها هی خۆتە. خەم کە هی هەمووان بێ تا لە یەکتری وەر دەگرن و دەستاودەستی پێ دەکەن، گیانی دەر دەچێت و دەمرێ.

هیچ شتێک نییە کچەکەی بیری بەڵقیس نەخاتەوە، جریوەی چۆلەکە، تیشکی زێڕینی خۆر، شینیی ئاسمان. ئەوانی دیکە، کەمال و کوڕەکانی کچەکەیان لە دڵدا سڕیوەتەوە، تەنها بۆ بوغز و ڕق ماوە، بۆ تەمێکردن و سزادان ماوە. کوڕە گەورەکەی، کوڕە نازدارەکەی مەحموود، نۆبەرەکەی، تەنها خۆی دەزانێ بە چ دڵێک بەخێوی کردووە. ئەو کاتە ئەو کەماڵە کێوی بوو، نەیدەزانی ژن کە منداڵی بوو، دڵی وەک پەڕەی سیغار تەنک و وەک کرمە لینجەکان نەرم و سیکۆتینی دەبێتەوە، دەیەوێ دەستێک، سۆزێک هەبێ پێیەوە بنووسێ،

لەو کاتانەشدا هیچ دەستێک نییە وەک دەستی مێردەکەی گەرمی بکاتەوە. کەمال هەر پێی وا بوو منداڵبوون کاری ژنە و ئەو تەنها دەبێ دەنگ هەڵبڕێ و بڵێ، "کوڕمان بوو" هەفتەش تێپەڕی بوو جارێ کەمال سەری لە ژوورەکەی ئەو نەدابوو، ماچێکی کوڕە تاقانەکەی نەکردبوو. ئەویش دڵە کرمەلینجەکەی، ئا دەیویست دڵە کرمەلینجەکەی بەسەری داغبووی عەلادینەکەیاندا بدا، لە چزە و سووتانی ترسا، هەر وا وەک کرمەلینجەیەکی تەنها دڵە نەرمبووەکەی خستە سەر نووکی پەنجەی و ڕای وەشاند بە بنمیچە ساردەکەوە نووسا، ئیدی لەو ڕۆژەوە دڵی تواوەی ژنی زەیستان لەجیاتیی باوەشی مێردەکەی، بە بنمیچی ساردەوە نووساوە.

ناتوانێ بەڕقەوە ناوی کوڕەکەی بێنێ، ئەو ئێستا ژنێکی دڵسارد و منداڵی خۆی هەیە، تەواو وەک کەمال توانەوەی دڵی ژنەکەی نابینێ، وەک ئەویش دوکانی قوماشفرۆشیی داناوە وماڵیشی لە کۆڵانەکەی پشتەوەیانە. ئەوەیش کە هەواڵی خوشکەکەی بیست وەک پەیکەرێکی کریستاڵ بێت و زەبرێکی بەر کەوتبێ لە شوێنی خۆی داڕما. کە هەستاشەوە چەند هاوارێکی توندی کرد، مستی بە دیواری کەنتۆرەکەدا کێشا "خوشکەکەی بەبێ پرسی ئەوان لەگەڵ کوڕە هەولێرییەک ڕێک کەوتووە."

ئەو هەر لە منداڵییەوە کە تووڕە دەبێ سەری خۆی بە دیوار یان ئەرزەکەدا دەکێشێ. ئەو جارەش هەر وای کرد، لە دیوارەکە کشایەوە، بە هەموو هێزی، وەک بەران سەری بۆ دواوە بەرز کردەوە، ها دینگ، بەڵقیس ڕۆحی

هاتبووە سەری لووتی، ترسا، زانیی ئێستا خوێن فیچقە دەکات و دیوارەکە سوور دەبێ، دەزووەخوێن دێنە خوارێ و مەحموودیش دەکەوێتە سەر ئەرزەکە.

ویستی بیگرێ، دەستی نەگەیشتێ، گرتنی چی، ئەو تازە سەری داوەشاندووە، چاوەڕێی هاواری خۆی و بەزەییی دیوارەکە بوو، دینگ، ڕاست لەو کاتەدا، کەمال لەپەدەستی خستە سەر دیوارەکە، سەری مەحموود بەر پەنجە ئەستوورەکانی ئەو کەوت، بەڵام دیسانەوە مەحموود ناوچاوانی تەقی و کەوتە سەر زەویەکە. دوو پەنجەی کەمال شکان و دەستی ئاوسا بوو.

کەمال پێی وا بوو نامووس ئەو گوریسەیە لە ملی پیاو دەکرێ، لە بەرزییەوە بەری دەداتەوە، ئەو گوریسە بێشەرەفە بەقورسی درێژ دەبێتەوە و قوربانییەکەی ناکوژێ، نایکوژێت بەڵام لە ملیشی نابێتەوە. ئەو گوریسە دەکشێ ئەوەندەی پێت بگاتە زەوییەکە یان نا، بۆ ئەوەی ئەندازەی ئەو هەوایەی دەتەوێ لەگەڵت بەشکات، نە تەواو دەیگرێتەوە، نە وەک دیکتاتۆرە دڵنەرمەکان بەتەواوی هەوات لەسەر دادەخات و نەدەشهێڵێ پڕ بە سییەکانت هەوا هەڵمژی. هەوات بۆ ئەوە دەداتێ هەمیشە هەناسەسوار و سەرگەردان و ڕووڕەش بی.

مەحموود چاوی سوورڕا، کەفی کرد و هەناسەی تەنگ بوو، چاویان گرت، ئارام بۆوە، ئاویان بە دەمەوە کرد، هەستا و دانیشت، ڕوانییە دایکی، دەمی قفڵدراوە و فرمێسک بە جۆگەلە بە ڕوومەتیدا دێتە خوارێ. مەحموودیش گریا، گریا و لە بەر خۆیەوە ناوی خوشکەکەی هێنا، "نیان، نیان

چۆن ڕەگی ژیانت بڕیم و خۆشەویستیت وشک کردم،"
مەحموود بە خوێن باجی ئەو جیابوونەوەیەی دا، گریانەکەش بۆ پرسەی ئەو جیابوونەوەیە بوو.
کەمال پەنجە ئەستوور و شکاوەکەی ڕاوەشاند،
"کەس باسی نەکات، کەس ناوی نەهێنێ."

***

هێشتا بەڵقیس لەژێر سێبەری تانکیی ئاوەکەی سەیداوا هەڵدەستێت و دادەنیشێتەوە.
"من دەیدۆزمەوە، دڵم هەڵە ناکات، لەو گەڕەکەیە، لەو ماڵانەدایە، قیبلەنوماکەی من."
کوڕەکە هەر وا بەرەو سەر دەهات،
"قژە چەورەکەی، دەموچاوە کونکونەکەی، هەر وەک وتیان هەوە، سەروەرە، خوا ڕەشی بکاتەوە."بەڵقیس زمانی خۆی گەست و وتی،
"چۆن، چۆن ناوی ئەو سەگەم بە دەمدا بێ."
"ئەو نازانێ دڵی دایک مانای چییە! ئەو نازانێ خۆشەویستی چ نرخێکی هەیە، ئەو نازانێ ئولفەت، نامووس، ڕێز و وەفا مانایان چییە. کچەکەم، کچەکەی بەڵقیس چۆن، چۆن دەتوانێ، تەنها تۆ دەتوانی، بەس چۆن دڵت دێ لەو دوورەوە دڵم لەتلەت بکەی؟ تۆش ئەی سەگی سپڵە چۆن دەتوانی گیانم بکێشی، ڕۆحم لێ بستێنیتەوە بەبێ ئەوەی بتناسم و بمناسی؟"
بەڵقیس هەڵە نەبوو، کوڕە سەر چەورەکە ڕاست بەرەو

ئەو دەرگایە چوو کە ئەو دای نابوو، چوارەم دەرگا، لای ئەو دەرگایە لای دا و نزیک بۆوە، بێ ئەوەی لە دەرگا بدات، کردیەوە، کردیەوە و چووە ژوورێ.

بەڵقیس حەقی بوو بەو سەرکەوتنە زەردەی بێتێ، دەموچاوە نامۆکەی بە پێکەنین تۆزێک، هەر وا تۆزێک، هێندەی ئەو چەند دڵۆپە ئاوەی نانێکی پێ دەرشێنن و نەرمی دەکەنەوە، هەر ئەوەندە و کەمتریش، خەندە ڕژایە سەر ڕوخساری، بەڵام وەک نانەکە نەرم بۆوە، سوورایی چەند ساڵ پێشتر ڕژایەوە سەر کوڵمەکانی. چەند فرمێسکیکیش لە هەمان ئەو شوێنەی چاوی کە کون ببوو، ڕژایە سەر ڕوومەتی، بە فرمێسکی شیرین و مژدەی هەواڵی کچەکەی.

"دۆزیمەوە، ئیدی محاڵە ونی بکەم، دەستی کچەکەم وەک منداڵێک لە مەچەکی خۆم دەبەستمەوە و دەڕۆم، دەڕۆم بۆ شوێنێک کەس نەماندۆزێتەوە."

وەک شێت دەڕوا خێرا و بەپەلە، دەلەرزێ، هەموو لەشی دەلەرزێ، لەرزینی ژنێکی چلوپێنج ساڵە نا، لەرزینی ژنێکی هەشتاوپێنج ساڵە، لەرزینی دڵ هەرگیز حسابی تەمەن ناکات، خەریکە لاقی تێکەڵوپێکەڵ بن، خەریکە بکەوێ، سەر بەرز دەکاتەوە و فرمێسکە درشتەکانی دەڕژێنە سەر کوڵمە پانەکەی، بە خۆی دەڵێ،

"ئارام بە، هێمن بە، با کچەکەت شەرمەزاری دایکێکی لەرزۆک نەبێ."

ڕوومەتی سڕیەوە، گەیشتە بەردەرگاکە، تەنها بە لەپە دەستێک دەرگاکە کەوتە سەر پشت، کوڕە لە ناوەندی حەوشەکە بوو، حەوشە نا، بڵێ چاڵێکی بچووک، ئاوڕی

دایەوە، چ ببینیّ، ژنێک بە هەیبەتی ڕۆستەمی زاڵەوە هاتۆتە ژووریّ، چەند هەنگاویش هاتۆتە ژووریّ.

کوڕە ڕەنگەئەسمەر و ڕەشەکەی وەک تۆزی سەر کاغەز، بە فوویەک دەتەکێت و نامێنیّ، زەردێکی مەیلەوسەوز جێگای دەگرێتەوە، وەک ئەو منداڵانەی نەخۆشیی خوێنیان هەیە و چارەسەر نەکراون، دەمی خوار دەبیّ. سەرەڕای ئەو نەهامەتی و شڵەژانەش قسەیەک دەکات، دەنگیشی دەگاتە بەڵقیس، هەر دەنگە و بۆڵەیەکە، بەڵقیس نازانیّ چی دەڵیّ، ژنێکی باریک، چوکەڵە و ڕەشتاڵە لە ژوورێک لە خۆی تاریکتر دێتە دەریّ،

"من ئێستا لەگەڵ ئەو قەرەجانە چی بڵێم."

ئەوانیش هەر دەنگێکیان بیست و لەو تەشەرەی بەڵقیس نەگەیشتن. ژنەش وەک کوڕەکە تاسا و ڕەنگبردوو. کچێکی چواردە ساڵانی ڕیوەڵە لە داڵانەکە هاتە دەریّ، داڵانە تەنگەکەی نێوان دوو ژوورەکە، بەوپەڕی ترس و لەرزینەوە پەنجەی بۆ بەڵقیس ڕاکێشا، "ئەوە دەمانکوژیّ، ئەی هاوار لۆچی دەمانکوژی، ئێمە بێگوناهین؟"

کوڕەکەش هەر وای گوتبوو، گوتبووی، "لۆ دەمان کوژی؟"

بەلام ئەو دەنگی نەگەیشتبوو، دەنگی لە ناوەندی ڕیّ کەوتبوو.

ژنە ڕشتاڵە باریکەکە، هێزی کۆ کردەوە، بەرامبەر ئەو ژنە پڕگومانە وەستا و گوتی، "خوشکم ئاگات لەو دەمانچەیەی زوور سەرت بیّ، بزانە لۆ دوات کەتییە؟"

بەڵقیس تێنەگەیشت، دەمانچەی ژوور سەرت! "بۆ چی

دەبێ کەسێک بە دەمانچەوە دوای من بکەوێ!" ئەوەی بە خۆی وت. لە پەنجەرەکەی بەرامبەری، لە شووشە پەنجەرەکەی بەرامبەری خۆی دیت، وەک بەرامبەر ئاوێنە وەستابێ. وای زانی ڕوومەتەکانی کچەکەیەتی لە پەنجەرەکەوە دیارن. کاتێک چاوە زەقەکانی پشت سەری خۆی دیت لەناو پەنجەرەکە، ئاوڕی دایەوە، ئەو جار زانیی ئەوانە بۆ چی ترساو و حەپەساون. هەرچی ئیرادە و ئازایەتی هەبوو لێی ڕژا، هەر فێڵ و بەرنامەیەکی نهێنیی دای نابوو هەمووی بووە هیچ. بەرامبەر دەمانچەکە کەوتە سەر چۆک، وەک نزا بکات دەستەکانی بەرز کردنەوە، گوتی، "بۆخاتری ئەو خوایە تۆ لەکوێ پەیدا بووی، وەک جنۆکە دوای من کەوتووی؟"

"ئەمزانی ئەو نەفرەتییەت دۆزیوەتەوە، ببورە گەر وا نەبا نەتئەهێشت لەگەڵتا بێم."

بەڵقیس خەریک بوو لە تووڕەییبیان ببورێتەوە، هاواری کرد، "ئەو دەمانچەیە دانێ تا کەتنێکت نەکردووە مەحموود، ناو جەرگتان ڕەش کردووم."

# ٢

مەحمـوود کـوڕە گەورەکـەی بەڵقیـس لەگـەڵ چ تۆفانێـک هاتبـووە ئێـرە؟ بـە چ ژەهرێکـەوە دوای کەوتبـوو. چـۆن وەک خێو و جنۆکە لـە پشـتیەوە پەیدا بـوو، تـازە لـەوە تێدەگەیشـت ئـەو خێزانـە بۆچـی وا زراویـان چـووە. مەحمـوود گوێـی لـە هاوارەکـەی دایکـی بـوو، دیتـی چەنـد بەتونـدی کەوتـە سـەر ئەژنۆ، لەگەڵ ئەوەشـدا فەرامۆشـی کرد و چاوی لێی دزیـەوە، سـەیری نەکـرد. مەحمـوود کـوڕە گەورەکـەی بەڵقیـس هەسـت بەئـازاری خەڵـک دەکات، تێشـی دەگات، بـەڵام گوێـی ناداتـێ و پێـی لـێ دەنـێ، بـا دایکیشـی بـێ، بـا دایکیشـی بـێ و لـە بەرپێی کەوتبـێ، ئـەو دوای تۆڵـە کەوتـووە، تۆڵەسـتێنیش جگـە لـە غەنیمەکـەی کەسـی دیکـە نابینـێ. منداڵـەکان هەرگیـز بـۆ ئـەوە لەژێر یـەک لێفـە گـەورە نابـن تـا پشـتی یەکتـر بگـرن، تـا بەشـی خۆیـان بدەن بـە یەکتـری، نـا. منداڵـەکان بۆ ئـەوە لەژێر لێفەیەکدا گـەورە دەبن، لەنـاو یـەک قاپدا نـان دەخـۆن، دەرپێی یەکتـر لەپـێ دەکـەن، تەنهـا بـۆ ئـەوەی بەشـی یەکتـر بخـۆن و

ژیان لە یەکتر بستێننەوە، تەنها بۆ ئەوەی لەسەر نامووس یەکتر تفباران و ئەگەر پێویست بکات خوێنی یەکتریش بڕێژن. خزمەکان، برایەکان تەنها لە کاتی لێپێچینەوە و سزاداندا دەنگ بەسەر یەکتردا بەرز دەکەنەوە. مەحموود بەدەنگی بەرز هاواری کرد، "کوا بیهێننە دەرێ، نیان کوای؟ ئێستا نیانم نیشان دەن تا هەمووتانم گوللەباران نەکردووە."

بەڵقیس خەریک بوو ببورێتەوە، وەک ئەو ڕۆژەی ئەو بەڵایەی تێدا لەدایک بوو، ئەو ڕۆژەش ویستی ببورێتەوە مامانەکە زللەیەکە توندی لێ دا، یەکێکی دی کە نوقرچێکی لە سینگی گرت،

"چاو دانەخەی، تین بدە خۆت، لەهۆش خۆت بچی منداڵەکەت دەمرێ، بۆ خۆشت خوا دەزانێ..."

ئەو ڕۆژە ترسی لێ نیشت، هەر لەو ترسەش بوو نەبورایەوە، بەرگەی ئازارەکەی گرت و بێدەنگ فرمێسکی ڕشت، ئەوەندەی دەکرێ قاچەکانی لێک کردنەوە،

"بەرزیان بکەوە، تۆزێک، ڕانت بڵاو کەوە، ئاوا، زیاتر."

دەڵێی ئەو مامانە هەرگیز منداڵی نەبووە و هەست بە قاچکردنەوە ناکات، چوار پەنجە و نیو زیاتریش ببۆوە، لەگەڵ یەکەم زیقەی کۆرپەکە بەڵقیس بوورایەوە، ئەوەندەی دەکرێ خوێن و خوڕی زیاتر بێهێزکردنی لەگەڵ خۆی هێنا. کوڕ لەگەڵ لەدایکبوونی دایکی بێهۆش دەکات و لەگەڵ هاوار و توورەبوونی دڵی دەتوێنێتەوە. زیقەی ئەمڕۆی ئەوی کوشت، کوشتی و نەیبوراندەوە. ئەمڕۆ هەمان ئازار بوو، زیقەکەی گۆڕابوو بە هاوار و هەڕەشە، بەس بە پێچەوانەی یەکەم ڕۆژەوە نەدەکرا ببورێتەوە. مەحموود بازی دایە سەر کوڕە

باریکە قژ چەورەکە، ملە باریکەکەی گرت، هاواری بەسەردا کرد، "پێم بڵێ کوا؟ نیان کوا؟ بانگی بکە با بێتە دەرێ."

ژنە باریکە ڕەشە بێڕۆحەکە، کەوتبووە سەر چیمەنتۆکە، هاواری دەکرد، بەڵام دەنگی نەدەگەیشت، دەنگ و هاشەی هەناسەی ژنێک ناتوانێ فەزای تووڕەیی پیاو ببڕێ.

بەلّقیس پێی وا بوو، منداڵەکان چۆن لەدایک دەبن ئاواش دەژین. هەیانە غەمبار و هەژارانە و بێکەس لەدایک دەبێ، هەر واش دەژی. هەیانە پزیشک ئامادە، بەختەوەرانە لەدایک دەبێ، ئەویش ئارام ژیان بەسەر دەبات. هەیانە وەک مەحموودی کوڕی، ئاوا لە ڕۆژێکی خوێناوی و تاریک و پڕهاواردا لەدایک دەبێ، هەر واش دەژی. ئەو کوڕە سیویەک ساڵە، سیویەک جار مردنی تا بەردەرگا بۆ هێناوەتەوە.

بەلّقیس نەیدەزانی چ ڕۆژێک بوو، کەماڵ دەیزانی، ئەو ڕۆژەی سلێمانی تاریک، دڵەکان تاریکتر، سیو یەک ساڵی تەواو لەوەوپێش، ئەو ڕۆژەی شێخ مەحموود سلێمانیی ڕاچڵەکاند، سلێمانیی لەرزاند، بۆ خۆی نا، تەرمەکەی، ئەو ڕۆژە دەروێش غەفووری مامی بە بەلّقیسی وت، "هیچ نەخۆشییەک بە شێخ ناوێرێ، ئەو بە نەخۆشی نەمردووە، ئەو بەو هەموو حەسرەتەوە مرد، بۆ نەتەوەکەی، بۆ قورئانەکەی چووە دڵیەوە."

ئەو ڕۆژە دەروێش غەفوور دەسرە خوێناوییەکەی ڕادەوەشاند و بەناو خەڵکە خرۆشاوەکەی شاردا، ئەو خەڵکەی جەنازەی شێخیان بەسەر شانەوە بوو، هاواری دەکرد، "مەترسن، شێخ بەمردووییش ئەتانپارێزێ، بەمردووییش چاوی لێتانە، ئەوەتا، ئێستا، خۆی داوەتە بەر گوللەی ئەو

کافرانـە، سـەیری کـەن خوێنـی لـە بـەر ئـەڕوا، ئـەوە خوێنـی شـێخە."

خەڵک سەرسام و قوشقی، ئاخر کەسێک دوای چەند ڕۆژ لە مردنی، دوای هێنانـەوەی بـەو ڕێگا وشـک و دوورودرێژەدا، لـە بەغداوە بۆ سلێمانی، دوای وشـکبوونەوە دەمـاری خوێنـی لەشی، چۆن خوێنی لێ دێت؟

مامـە دەروێش غەفوور هـاواری دەکرد، "ئەو هەرکەسێک نییـە، ئـەو شـێخی شـێخانە، نـەوەی کاکـە ئەحمـەدی شـێخ و کوڕی شـێخ سـەعیدی شـەهیدە."

لەگەڵ ناوی کاکە ئەحمەدی شێخ هـەزاران کـەس سـەریان ڕادەوەشـاند و هاواریـان دەکـرد "فیـدات بـم یـا ڕەسـولەڵڵا." تەرمـی شـێخ بەسـەر شـانی خەڵکەکـەوە، خەڵکەکـە لـە جمینـدا بـوون، گوللەبـاران و هاوارهـاوار، زۆر کـوژران و برینـدار بوون، ئەو ڕۆژەش گوللەیـەک لـە تابووتەکـەوە بـەر ڕانـی شـێخ کـەوت.

مامـە دەروێـش غەفـوور دەسەسـرە ئاوریشـمە سـپییەکەی خـۆی دەر هێنابـوو، کـە دیـاری کەمالـی بـەزاز بـوو، ئـەو بـەو دەسـرە تەنهـا فرمێسـکی عیبـادەت و ترسـی خـوای دەسـڕی، بەو دەسرەیە خوێنی چۆڕاوەی تابووتەکەی شێخی سڕییەوە، هـاواری کردبـوو، "ئەوەتـا شـەهیدی خـودا، خوێنـی شـەهید بەزایـە ناچێ."

بۆیـە هەمیشـە دەیگوت، "ئـەو بەنەخۆشـی نامرێ، نەخۆشـی حەدی چییە خۆی لـە پێڵاوەکانیشی بدات."

کەمالی حاجی بەکری مەڵکەندیی بەزاز، مێردە سـەرشێت و عاشـقەکەی بەڵقیس، کـە زانیبووی، ژنەکـەی بـە منداڵەوەیـە،

شتێک وەک شانازی و پیاوەتی چووبووە ناو لووتە قەپەکەیەوە، سەریقورس، بەس تۆزێک بڵێندی کردبوو. ئاخر ئەو کوردە بوو، پیاوی کورد نابێ دڵخۆشی و گەشکەی خۆی بۆ ژنە بەئازار و کۆرپە تازەکەی دەر بخات. هەر کە لە کۆڵانەکەی ماڵی خۆیانەوە ون بوو، شتێک وەک چۆلەکە خۆی بە قەفەزەی سینگی دادا و ویستی بفڕێ. کەمال گوێی لە فڕەفڕ و پەلەپەلی باڵەکانی بوو، خوێنیشی فڕکانی بوو، پێکەنینی بوونەباوک، لە باوەشکردنی کۆرپە، خۆشییەک کەوتە سەر ڕوخساری، خەریک بوو دەموچاوی شەق بکات، کەچی پیاو دەبێ هەموو ئەو هەستانەی خۆی بشارێتەوە.

بەڵام دەبێ کەسێک بدۆزێتەوە، کەسێک بدۆزێتەوە یارمەتیی بەڵقیس بدات، ئا، ژنەکەی مامە غەفوور. گرمە و تەقە کەمالیان بەئاگا هێنایەوە، خەڵک بەکۆمەڵ ڕژانە ناو کۆڵانەکان و خۆیان پەنا دا، دەنگی مامە دەرویش غەفووری ناسییەوە، "ئەوەتا، ببینن، ئەوەتا خوێنەکەی، هێشتا خوێنی لە بەر دەڕوا،" مامە غەفوور شانازیی ئەوەی پێ بڕابوو کە گوللە و هەڕەشە و ترس نەیانتوانیبوو جەنازەی شێخی پێ جێ بهێڵن. تەرمەکەی جێ نەهێشت، نزا و هاوارەکانیشی دڵی خەڵکەکەی گەرم دادێنا، هەمووانی هان دەدا.

کەمالی حاجی بەکری بەزاز نەیتوانی لە کۆڵانەکە بێتە دەرێ و لە شەقامەکە بپەڕێتەوە، لەوێوە دیتی پۆلیسەکان دەوری مامە غەفووریان گرتووە.

ڕێژنە گوللەیەک بەرەو کۆڵانەکە کرا، کەمال و خەڵکەکە پەشۆکان، ژنێک دەرگای بۆ کردنەوە و ئەوانیش، ئەوانیش خۆیان فڕێ دایە ژوورێ. ژنە کەمالی بەزازی ناسییەوە و

کەمـال پرسـیی، "چـۆن ئەمناسـی، پێشـتر منـت بینیـوە؟"

ژنەکە گوتی، "ئەوەندەت قوماشی گران داومەتێ هەرگیز لەبیرم ناچیتەوە."

کەمـال دەیویسـت لـە ماڵەکـە بێتـە دەرێ. ژنەکـە گوتـی، "دڵگـران مەبـە، گاڵتـەم کـرد."

کەمـال گوتـی، "نـا لەبـەر ئـەوەم نییـە، ژنەکـەم بەمناڵەوەیـە، ئەبێ بڕۆم."

ژنەکـە هـەر لـە بـەردەرگاوە ماڵێکـی لەوسـەری کۆڵانەکـە نیشـان دا و گوتـی، "مامانێکـی زۆر شـارەزایە."

ژنەکە ڕاستی دەکرد، مامانەکە هیچ بیانوویەکی نەهێنایەوە و ڕاسـت دوای کەمـال کـەوت. بـەو گوللـە بارانـە کۆڵانەوکۆڵان تـا گەیشـتنە لای بەڵقیس، هـەر ئـەو مامانـەش بـوو زللەکـەی لـە بەڵقیس دا و پێی گـوت، "نەبورێیتـەوە، هـا ئـازا بـە، بێهۆش بیت خـۆت و منداڵەکـەت سـەلامەت نابـن."

***

لەگـەڵ هـاواری دووەم جـاری مەحمـوود بەسـەر ئـەو ژنـەدا، بەڵقیس لـە دڵـەوە گوتـی، "خۆزگـە بوورابامـەوە، خۆزگـە، نـە خـۆم بـام و نـە مناڵـم."

مامانەکە داوای ئـاوی شـلەتێنی کـرد، پـەڕۆ و پـەڕۆی دیکـە، کۆرپەکـە ڕووبارێک خوێنـی دەویسـت پێیدا بێتـە دەرێ. زەیـت، زەیتـی زەیتـوون، گرژبـوون، تیندانەخـۆ، هـاواری بەڵقیـس و گریانی منداڵەکە، هەناسـەیەکی بـە بـەر هەمووانـدا کردەوە، ئـەو هەناسـەیەی مەحمـوود ئێسـتا دەیـەوێ لێیـان بسـتێنێتەوە، پێش

ئـەوەی بەڵقیـس ببورێتـەوە و وێنـەی دەستەخوشـکێکی هاتـە بەرچـاو کـە دەیگـوت، "ئـەو دنیایە لـە سـەر منداڵێکی من پەکی کەوتبێ، شـەرت بێ نەهێڵـم بمبێ."

ئەو کاتە بەڵقیس هەر وای دەزانی ئەو دەستەخوشکەی بۆیە ئەوەندە ڕقی لە منداڵبوونە چونکە دایکی بەسەر منداڵەوە چووە.

کـە مامـە دەروێـش غەفـور بـە پـرچ و ڕیشـی ئاڵـۆزەوە هاتـە ژووری، بۆنـی حەڵـوا تـەواوی ماڵەکـەی خستبووە سـەر نەشـئەی خۆشـیی گریانـی کۆرپـە و دایکـی سـەلامەت. بۆنـی حەڵـوای ژنـە زاو لـە تەپڵـی سـەرکەوتنی جەنـگ و هەلهەلـەی ژنمارەکـردن دەچـێ. مامـە غەفـور هێشـتا دەسـڕەکەی بـە دەسـتەوە بوو، خوێنـی شـێخی پێوە، هـەر چەند وشـک ببۆوە، بـەلام دەبریسـکایەوە، ئـەو بـە ڕیـش و ڕوخسـاری خۆیـدا دەهێنـا، کـە زانیـی منداڵەکـە کوڕە، دەسـڕەکەی هەڵدایـە سـەر و وتـی، "مەحموودێـک دەمـرێ، مەحموودێـک لەدایـک دەبـێ."

ئیدی ناوی یەکەم منداڵی کەمال و بەڵقیس بووە مەحموود.

ئەوانـە هەمـووی لـە سـلێمانی ڕوویـان دا، ژانـی منداڵبـوون و بریندااربوونـی شـێخ و هـاوار و نـزای مامـە دەروێش غەفـور و یەکـەم زیقـەی بەدنیاهاتنـی مەحمـوود. ئێسـتا لـە هەولێـرن، ئێسـتا لەنزیـک تانکییـە ئاوەکـەی سـەیداوان، زیقـەی مەحمـوود بۆتـە هـاوار و گرمـە و نـەڕڕە، لـە ماڵێـک کـە هـەر هێنـدەی کولانـەی مریشـکێک دەبـێ، بەڵقیـس هـەردوو دەسـتی لەبـن پشـتێنی مەحمـوود نـاوە و بـە دەنگێکـی نووسـاو گوتـی، "تـۆ لەکـوێ پەیـدا بـووی؟ هەمـوو شـتێکت لـە مـن تێـک دا، مـن هەمـوو شـتێکم چـاک دەکـردەوە."

ژنە باریکەکە هێشـتا لەسـەر عەرزەکە کەوتبوو، مەحمـوود

قژە درێژە چەورەکەی کوڕەکەی گرت و بە هەموو هێزی بە جامی پەنجەرەکەیدا دا، جامە شەقەی لێ هات و کوڕەکە چاوی سووڕا، کچە هەرزەکارەکە هاواری کرد، "سالار، سالار، قوربانت بم کاکە سالار."

لەدواوە بە دەستە بێهێزەکانی یەک-دوو مستی لەپشتی مەحموود دا، گوتی، "تۆ براکەمت کوشت، هەی جانەوەر."

لەگەڵ وشەی سالار مەحموود دەستی شل کرد و کوڕە قژ چەورەکە، کە بە سالار بانگیان دەکرد، ئەویش کەوتە سەر عەرزەکە. ئاخر ئەو سەروەری بیستبوو. ئاخر ئەو نەفرەتی بەسەر سەروەردا دەباراند، کەچی ئەوە سالارە، هەر وەک ئەویش ڕەش و پیس و باریکە. بەڵقیس دەستی لە پشتێنی مەحموود بەر دا و لە کچە ترساوەکەی پرسی، "بۆ ئێرە ماڵی سەروەر نییە؟"

سالار هاتبۆوە سەر خۆی، نەک سەر خۆی بەتەواوی، بەڵام چاوی کردبوونەوە، بە دەموچاوە ئەسمەر و قژە چەورەکەیەوە زەردەخەنەی بۆ دەکردن. ویستی شتێک بڵێ، بەبۆڵەبۆڵ گوتیشی، "تۆش ناوت مەحموودە... بابیشم."

بەڵقیس دەیزانی ئەو سەروەرە نەگریسە ناوی باوکی مەحموودە، بۆیە بەرەو کوڕەکە چوو کە وتبووی ناوم سالارە، لێی پرسی، "ئەی براکەت، براکەت لەکوێیە؟"

ژنە سێبەرەکە کە لە دیتنی دەمانچەکە و هەڕەشە و هاوارهاوارەکە بووراببۆوە، گوتی، "ئەو نازانێ، ئەو نازانێ قسە بکات، ئەو لەسەر خۆی نییە."

بەڵقیس بەپەلە بەرەو ژوورە تاریکەکە چوو، "کوا نیان، کوا نیان لەکوێیە؟"

ژنە وەک دەنگ بەدوای بەڵقیسدا بنێرێ، گوتی، "ئێمە نازانین، من ئەو ناوەم هەر نەبیستووە."

بەڵقیس لە ژوورەکە گەڕا، مەکینەیەکی پەپوولەی درووماني ژنان لە بەر پەنجەرەکە دانرابوو، قوماشەکانی سەری ڕاکێشان و هەموو بەسەر یەکتردا کەوتن و پەرشوبڵاو بوونەوە، لەژێریانەوە کتێبێک بەر بۆوە، بەڵقیس نەیزانی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی دۆستۆیۆڤسکییە، کە کەوت وێنەیەکی لەناودا بەر بۆوە، بەڵقیس چاوی کەوتە سەر وێنەکە، نیان لەگەڵ کوڕێکی باریک و ڕەش لە مۆدێلی ئەو کوڕە سەرچەورەی دەرێ وەستابوو، کوڕێکی دیکەشیان لەگەڵ بوو، هەر لە خۆیەوە ئەو کوڕەی وەک دۆست و ئاشنا هاتە بەرچاو. نیان پێدەکەنی و کوڵمە پانەکانی خڕ ببوونەوە، بەڵام چاوی، قووڵاییی چاوە سەوزەکانی غەمبار بوون، غەمبارییەکی بێ بن، لە دڵی خۆیدا گوتی، "خودایە! کەمال چ چاوێکی بۆ ئەو کچەم جێ هێشتووە.

# ٣

ئـەو وێنەیـە لـە مانگـی سـێی ڕۆژێکـی هەتـاو، بـە سـێ دڵ و سـێ هەسـتی جیـاوە لـە بەغـدا، لـە باخچەکـەی کۆلێـژی ئـاداب، لـە بـەردەم بەشـی زمانـی ئینگلیـزی گیرابـوو، هـەر یەکـە لـە خەیاڵێکدا بـوون، تەنهـا لـە چـاوی کامێراکـەی ئەبـو سـەباحەوە بەیەکـەوە بـوون. ڕۆژێکـی هەتـاوی فێنـک، ڕێـک بیسـتی مانگـی سـێ، یـەک ڕۆژ پێـش نـەورۆز، ئـەو ڕۆژە نیـان تەمـی خەمێکـی لەسـەر ڕوخسـاری بـوو، تەمێـک بـە نیـازی ڕەوینـەوە بارگەوبنـەی دەپێچایـەوە. ئـەو سـاڵە نیـان هەوڵـی دابـوو، هەوڵـی فەرهـادی دابـوو کـە لـە دەزگیرانەکـەی جیـا نەبێتـەوە، دەسـتی بـە پووشیشـەوە گرتبـوو، بـەڵام هەمـوو چڵەپووشـەکانی کەنـار زەریـای عەشـقی ئـەو، هەمـوو چـڵ و پنچکەکان هەڵکەنـدران و فریـای نقوومبوونـی عەشـقەکەی نیـان و فەرهـاد نەکەوتـن.

ئـەم وێنەیـە ئەبـوو سـەباح گرتبـووی، کـە لـە کامێراکـەی بێدەنگتـر بوو.ئـەو کـوڕە ڕەشـتاڵە ئـەو ڕۆژە هـەر وا باریبـوو، پێشـتر نیـان ڕێکەوتـی نەکردبـوو، دۆسـتی سـەردار بـوو، دوای

وێنەگرتنەکەش نیان لەگەڵ میدیا و سەردار و شەماڵ، ئازاد و مەحەمەد پێکەوە چوونە چێشتخانەی قوتابییان و بەڕێز دانیشتن و نانیان خوارد و قسەی هیچیان کرد، ئەوان هیچیان دەربارەی قورسی ژیان و نەفرەتەکانی نەدەزانی. نەیاندەزانی سەردەمی خوێندن و قسەی هیچ خۆشترین سەردەمی ژیانە. ئەو ڕۆژە هێشتا نیان سێبەر بوو، هێشتا خەیاڵ و تراویلکە بوو، سێبەرێک نەدەکەوتە ناو ئاوی ژیانەوە، بیری لە شوێنێکی دوور یان شوێنێکی دیکە بوو، خۆی و خەیاڵی لە شوێنێک پێ کۆنەدەکرایەوە، میدیا دەیویست بیهێنێتەوە، دەیویست بیهێنێتەوە ناو ژیانەوە، لە شوێنێک کۆی بکاتەوە، میدیا گوتی، "خۆشەویستی هەر نەفرەت بووە، هێشتا شتێک ماوە بۆ دڵخۆشی، بۆ دڵگەرمی و متمانە، ئەویش دۆستایەتییە، هێشتا دۆستایەتی ماوە، هەمووان خۆشیان دەوێی."

ئەو تۆزێک، هەر وا قولانجێک بە هۆی پەیوەندییە خۆشەویستییە ڕووخاوەکەی لە برادەرەکانی دوور کەوتبۆوە. وای دەزانی هەمووان بە دۆڕاو و هەڵخەڵەتاو سەیری دەکەن، وای دەزانی هەر لە سەرەتاوە هاوڕێکانی ئەو کۆتاییە ڕەشەیان بۆ ئەو لە بەرچاو بووە و لەژێرەوە پێی پێکەنیون. بۆیە گوتی، "نا ئەزیزم نا. من زۆر پەلەم کرد، وەک شێت لە یەکەم ڕۆژی زانکۆوە تەسلیمی بووم و چاوم جگە لەو کەسی تری نەدیت، ئەوەش خۆتووشکردنە."

میدیا پێکەنی و سەیری چاوەکانی سەرداری کرد، "ئەو چاوحیزەش منی گیرۆدە کردووە."

"گوێی مەدەیە. خۆشەویستی گەورەترین درۆیە."

– خەریکە بۆی حیز بم، نامووسم لێ هەڵگیراوە بۆی."

تۆزێک پێکەنی، میدیا هەر وا گاڵتەچی بوو، نیانیش پێکەنی، میدیا گوتی، "لەبیرتە هەر یەکەم ڕۆژ لە بەردەم ئەو دایناسۆرە چیمەنتۆیەی مۆزەخانەی سروشتی پێی وتم، "تۆ فەرەنسییت؟" من وتم، "نا، لە بەشی فەرەنسیم" کەچی دیسانەوە حیزە وتیەوە "ئا فەرەنسی، دایکت، یا بابت،" دەشڵێ بابت، لادینیی خوێڕی.

میدیا قژە زەردە زێڕەکەی، چاوە شینە گەورەکانی، پێستە پەمەییەکەی هەموو شتێکی فەرەنسی بوو، بۆ خۆیشی لە بەشی فەرەنسی دەیخوێند. سەردار هەر بە زەوق و کەیفەوە پێی گوتبوو، "تۆ فەرەنسییت!"هەرچەندە میدیا کچی عەقاری بوو، کچی عەقاریی سلێمانییش هیچی وای لە فەرەنسی کەمتر نییە. ئاخر هەمووان دەیانزانی سەردار حەز لە کەس ناکات، نەک هەر ئەوە لە ناخەوە پێی وا بوو کەس حەز لەو ناکات، بۆیە هەرگیز خۆی نەدەشکاندەوە و هەوڵی بۆ کەس نەدەدا، ئەوەش ئەو دیوە ڕووکەشە بوو کە هاوڕێکانی دەیانزانی.

میدیا گوتی، "جا من چ بزانم، هەتاوەکە لە ڕوخساری دابوو، ڕیشە زەردە ئاڵتوونییەکەی شێتی کردبووم، خەریک بوو هەر لەوێ، هەر لە بەرچاوی ئەو خەڵکە لێوە ئەستوورە سەگییەکانی ماچ کەم. باش بوو نەمکرد، زۆر خوێنتاڵیشە، پێستی ئەستوورە و وەک کەر حیلکەحیلک بە دەنگی بەرز پێدەکەنێ."

نیان دەیویست بڵێ هەر هیی کەرەکە، بەڵام تۆزێک هەر وا تۆزێک پێکەنی. سەردار لەوسەرەوە سەری بەرز کردەوە و ڕووی لە میدیا و نیان کرد و گوتی، "ها ماڵی کێ وێران دەکەن، سەرتان بەیەکەوە ناوە."

میدیا گوتی، "هەر خوێڕی زۆرە."

نیان بەو قسەیە شکا، شکا و ڕووخا، ئاخر چاوەڕێ نەبوو کەس وا بیر بکاتەوە کە ماڵی کەسی وێران کردووە.

سەردار زوو دڵە بریندارەکەی نیانی بیر کەوتەوە، خێرا هەڵەکەی ڕاست کردەوە، گوتی،

ها میدیا ماڵی کێی تر وێران دەکەی؟ خواگرتوو بەو چاوانە فیرعەون تەسلیمت دەبێ."

میدیا گوتی، "جا تۆ ماڵت هەیە تا وێرانی بکەم ئێسکگران؟

هێواشتر کە تەنها نیان گوێی لێ بێ، زیاتر گوتی، "خوێڕییە، هەر قسەی زل دەزانێ."

***

کچ کە دەشکێ، هیچ شتێک چاکی ناکاتەوە، سەردار باڵی چۆلەکە و لاقی کەرەوانە و کەوی هەڵبستبۆوە، چاکیشی کردبوونەوە، بەڵام دڵی کچ، دڵە شووشە و بلورەکەی کچ چاک نابێتەوە، خۆ ئەوە نییە درزێک بدات و تەواو، یان دوولەت بێ، نا، دڵی کچ هەڵدەوەرێ، وردورد دەبێ و پارچەیەکی لە پارچەیەک گەورەتر نابێ. دڵی نیان لەوەش خراتر ورد ببوو وەک خۆڵوخاشاک. ئەوەش کاتێک کچ لە خوێنەوە عاشق بێ. سەردار چاری ئەو دڵانەی دەزانی، دەبوو ئەو دڵە وەک ئەوەی قوڕی ئەو ڕۆ بێ، جوان بە فرمێسک و ماچ و حەسرەت بشێلێتەوە، تێکەڵی کەیەوە، ئەو کات دەشێ بتوانی دڵێکی بە ئارەزووی خۆتی لێ دروست کەیەوە. ئەو دڵەی بۆ خۆشت دروستی دەکەیەوە زۆر لەو

دڵە بەهێزترە کە هەرگیز نەشکاوە. سەردار بارۆمەترەکەی کۆلیژی ئاداب، ئەوەشی دەزانی.

کوڕە قۆشمە و سمێڵزەردەکەی بەشی زمانی ئینگلیزی، دەیزانی کام کچ و چۆن عاشق بووە، کوڕە لات و زەبوونەکانیش عاشق دەبوون و شەڕیان لەگەڵ هەتاو دەکرد، تا چنگێکی بخەنە دڵیانەوە و بدرەوشێنەوە. ئەوەندە شێتانە خۆشەویستییان دەبەشییەوە کە ورە و توانایان بەشی مانگێکی نەدەکرد و تەواو دەبوو. بەڵام نیان نا، نیان ڕۆچووبوو، سەرەتا پێڵاوە شینە بنتەختەکانی، جا قاچ پتەو و بەبریسکەکانی، جا تووکە حەرامە زەردەکانی بەلەکی، تا تەپڵی سەری، تا قژە ئاڵتوونییە کارییەکەی چووبووە ناو عەشقە وێرانبووەکەی.

سەردار یەکەم نیگەرانیی لە چاوی نیاندا خوێندەوە، زووتر زۆر زووتر لەو ڕۆژەی وێنەکەیان لەگەڵ سەروەر گرت، نیان بە سەرداری وتبوو، "من خۆشم دەوێ، لە دڵەوە خۆشم دەوێ، حەز دەکەم دەستم بگرێت و بەس."

سەردار نەیویستبوو لەو بابەتە بدوێ، نیان هەر خۆی گوتی، "من بە وزەی دەستی، سێ مانگی تەواو لە بەر سەرما دەژیم."

فەرهاد لە وەڵامی ئەو قسانەدا بۆ سەردار پێی گوتبوو، "ئێمە تازە بۆ یەکین، چ پێویستە چاوەڕێ بکەین، وا بزانە لە ماڵێکداین."

دواتر لە گەرمەی داواکارییە نەبڕاوەکانیدا گوتبووی، "وا بزانە ژن و مێردین."

نیان ئەوەی بە دەستدرێژی زانیبوو، بە ئەتک و

حەیاچوونی زانیبوو، گریابوو، وەک نەفرەت و نارەزایی لە بەردەم فەرهاد گریابوو، ئەو ویستبووی بیگریێ وەک ئەوەی پەلاماری بدا، وەک بیەوێ بە زۆر و درندانە بیخاتە ژێر خۆی، نیان خۆی راپسکاند و دوور کەوتەوە.

لە کۆرنیشەوە، لەژێر هەموو دارخورما بالابەرزەکانی کەناردیجلە، لەسەر پیادەرۆ و پەرینەوە و لەسەر شەقامە سەرەکیەکەی ئەعزەمییە، هەر بە پێ هاتبۆوە، تا کۆلانە بەدارداپۆشراوەکانی وەزیرییە، نەیزانیبوو چەند رۆیشتووە، هەندێ جار بە چاوە سەوزەکانی و زۆر جاریش لە دلەوە گریابوو، تا گەیشتبۆوە سەنتەری بەریتانی، لەوێ سەرداری دیبوو، سەردار لە دیتنی ترسابوو، لەو هەموو غەمەی سەر روخساری نیان ترسابوو، چۆن دەکرێ کچێک بەو ناسکییە وا قورس خەمبار بێ، لەژێر دارپرتەقالە سەد ساڵەکەدا وەستان، جاران نیان بۆنی پرتەقالی لێ دەهات، بۆنی خەستی گولۆکی دارپرتەقالی لێ دەهات، ئێواران، ئەو ئێوارانەی تازە هاتبوون، ئەو کاتە شتێکیان لە منداڵی پێ مابوو، کەیفخۆش و سادە و پاک. ئەو رۆژانە لە چاوی نیاندا پرتەقالەکان رەنگیان دەدایەوە. سەردار بەغدا و وەزیرییە و ئادابیشی بیر بچێتەوە، ئەو ئێوارەیەی بیر ناچێتەوە کە نیانی رووەو خۆرنشین راگرت، داوای لێ کرد رووەو خۆرنشین بوەستێ، داواشی لێ کرد رێک سەیری خۆرە نارنجییەکە بکات، خۆرەکە لەناو چاوی نیاندا ئاوی دەکرد، هەموو بەغدا رەنگی چاوەکانی نیانی دەگرت، سەردار لە بەر تیشکی سوور و بێهێزی خۆرەکە هێند قووڵ سەیری چاوەکانی نیانی کردبوو تا ئەمرۆش وێنەکەی لە بەرچاو کاڵ نەبۆتەوە.

ئەو ڕۆژەی نیان لە کۆڕنیشەوە بە پێ هاتبۆوە، سەردار زراوی لە چاوەکانی چووبوو، قووڵ قووڵ و پڕتاریکی، پڕنەفرەت و حەسرەت و خۆشەویستی و تێک شکابوو، سەردار نەیتوانی بپرسێ، نیان گوتی، "ئێوەی کوڕان هەمووتان نەفرەتین، خۆشەویستی نازانن، کچانتان بەس بۆ یەک شت دەوێت، یەک شت و بەس، جگە لەو شتە هیچتان لە دەماغدا نییە."

سەردار قسەی نەکرد.

"یەک شت و بەس، خۆشەویستی و گریان و لاوانەوەتان تەنها درۆ و هەڵخەڵەتاندنە."

سەردار بۆ گۆڕینی بابەتەکە، بەڵام بە هەمان ڕەگی سەگییەتی ناخیەوە، گوتی، "نیوەی قسەکەت ڕاستە، کچمان بۆ یەک شت دەوێ، نیوەکەی دیکەت هەڵەیە، دەمانەوێ بۆ تەواوکردنی ڕۆحیشمان، بۆ تەواوکردنی ڕۆحی ناتەواومان."

نیان توورەتر "نا ئێوە ڕۆحتان نییە تا تەواوی بکەن، هەست و خۆشەویستیتان نییە. تەنها هەوەستان هەیە و تەواو. لە هەر تەمەنێکدا بن کچتان بۆ ڕابواردن دەوێ، بۆ دەستگەرمکردنەوە و مەمکگوشین و پۆزلێدان و حەیابردنی."

سەردار حەزی دەکرد نیان هەموو شتێ بڵێ، ناسۆری دڵی بەسەر ئەودا برێژێ، یا بەسەر ئەودا هاوار بکات، سینگی نیان جێگای هەناسەیەکی دیکەی تێدا نەدەبۆوە. هێشتا کراسە سپییەکە و تەنوورە خۆڵەمێشییەکەی دەوامی لە بەر بوو، قۆپچەکانی نیوەداخرا و شێواو و سەر سینگ گەچڵاو.

چوونە ناو کۆڵانەکانی وەزیرییە، ئێوارەکەی درەنگ بوو،

سێبەری دارەکان خەست و قورس بوون. باڵندە هەزار جۆر و هەزار ڕەنگەکان، بە فڕەفڕ و جریوەجریوەوە دەچوونە ناو گەڵا و لقی چڕی دارەکانەوە و خۆیان بۆ ئارامیی شەو ساز دەکرد. زیقەزیق، جا جریوە و جیکەجیک، جا نووزە و هەناسەی ئارام و چوونە ژێر باڵی یەکتری. سەردار گوتی، "تەنها باڵندەکان لە عەشقدا یەکتر ئازار نادەن."

نیان گوتی، "سەگەکانیش."

سەردار زوو ڕای خۆی گۆڕی و قسەکەی خۆی ڕاست کردەوە، بۆیە گوتی، "هەست دەکەم خۆشەویستی گوڵ و درەختیش بۆ یەکتر بەئازارەوە دەست پێ دەکات."

نیان وەستا، پشتی بە دارێکی ئەستوور و بەتەمەنەوە دا، کە دەشێ هی سەردەمی مەئموون بێ، بەوپەڕی ئارامییەوە سەیری چاوی سەرداری کرد، ئەویش گوتی، "ڕاستییەکە ئەوەیە، خۆشەویستی لە کاتی ئاساییشدا ئازار هێنەرە، هەر ئەو باڵندانە، بەدەم یەکترەوە، بەدەم جریوە و سەماوە، بەدەم لاوانەوەی یەکتر و لستنەوەی زمان و دەنووکی یەکتر، کە خۆشترین کاتی خوشەویستییەکەیانە، جا لەزەتی کورتی جووتبوون، سەردەمی درێژی ئازار، هێلکەکردن سزایەکی کەم نییە، هێلکەکردن واتا کورکبوون بۆ دوو هەفتە تا سێ هەفتە، کورکبوون واتا نەفڕین و هەڵنیشتن، سینگداغبوون بە توێکڵی ڕەقی هێلکەوە، تا تروکان، جا زیقەی جووجک، جا خواردنکێشانەوە، شەڕکردنی بەچکەکان لەسەر دەنکەهەرزنێک، ئەو هەموو ئەرک و ئازارە سزای عاشقبوونیانە."

زەردەیەکی نەرم ڕوخسارە نێفەرتیتییەکەی نیانی

گەشاندەوە، پێی گوت، "سەگباب هێند خۆش باسی عەشقی باڵندەت کرد، لە دڵەوە حەز دەکەم ببمە باڵندە و بۆ ئەبەد لەناو ئەو لقانەدا خۆم بشارمەوە. ئەو ئازارە بچێژم."

سەردار ئەو خۆشییەی بەهەل زانیبوو و گوتی، "چا هێلکەکردن و کڕکەوتن."

نیان لە قوولاییی دڵیەوە گوتی، "بەدەست خۆم بایە دەچوومە سەر شێوە و سروشتی بچووکترین باڵندە."

سەردار گوتی، "کچ دەتوانێ ببێتە باڵندە (نیان بە تیلەی چاوێک سەیری کرد) کچ دەتوانێ ببێتە باڵندە."

نیان بە چاووبرۆ پرسیی "چۆن؟" لە وەختێکدا هێشتا پشتی بە درەختەکەی مەئموونەوە دابوو.

"تەنها کچ دەتوانێ ببێتە باڵندە."

"لەکوێ؟"

"لە دڵی کوڕێکدا."

نیان چاوی داخست، خۆی بەرز کردەوە و بە تەواوی سەری بە درەختەکەوە نا، گوتی، "ئەو درەختە لە هەموومان بەخشندەترە، منی کردۆتە باوەش، بێ ئەوەی نیازیکی پێم هەبێ، ئەو شەقامە بەسێبەر دادەپۆشێ، لە دڵیشیدا جێگای ئەو هەموو باڵندەی کردۆتەوە. تۆش باسی کوڕ دەکەی، ڕاستە کچ وەک باڵندە دەچێتە دڵی کوڕەوە، بەلام کوڕان هەر ئەوەندەی دەستیان پێیان گەیشت، باڵیان دەکەن و بۆ جوانی دەیانخەنە سەر دەستیان."

سەردار تۆزێک دوور کەوتبۆوە، نیان پێش ئەوەی پێی بگاتەوە گوتی، "منیش چەند دەبەنگم قسە بۆ ئەو کەرە دەکەم."

سەردار ئاوڕی دایەوە، وەک بپرسێ، "چیت گوت؟"

نیان گوتی، "لە دڵی تۆدا چەند باڵندە دەفڕێ، کاکی فەیلەسووف؟"

لە وەختێکدا سەردار بەئاستەم دەستی نیانی گرت، گوتی، "سەردەمی من سەردەمی خۆشەویستی نییە، سەردەمی من سەردەمی لە گۆڕنانی خۆشەویستییە. من مەینەتیم، من ناتوانم هیچ باڵندەیەک بخەمە دڵمەوە تا بەئازادی بفڕێ."

"چونکە تۆش باڵ و کلکی باڵندەکان دەکەی."

"چونکە خۆم ئازاد نیم، تۆ دیوتە لە گۆڕستانێکدا منداڵێک لەدایک ببێ؟ وەڵامم مەدەوە."

***

نیان وەستا، ڕووناکی جێگای خۆی دابوو بە تاریکی، بریسکەیەک کە دەشێ لە گڵۆپی ماڵێکەوە، یان لە مانگێکی نادیارەوە بێ، دەهات و ڕێک لە چاوەکانی نیانی دەدا، سەردار بە هەموو هێزیەوە دەیویست سەیری نەکات، بەڵام کوا هێز، کوا چڵەگیایەک لە بەردەم لافاودا ڕادەوەستێ؟

نیان گوتی، "من هیچ ئازارێکم بۆ ئەو نەبووە، هەستم بە فڕین نەکرد لەناو دڵیدا، ئەوە تۆی لە هەستی فڕین دەزانی. من حەزم لە ئازارە سروشتییەکەی خۆشەویستییە، نە ئەشکەنجەی خیانەتکارانە. نامەوێ، نامەوێ ناویشیم بە دەمدا بێ."

ئیدی هێزی نەما، نیان دەلەرزی، دەلەرزی و قسەکانی تێکەڵ دەکرد، لە سەردار نزیک بۆوە، سەردار نزیکتر، چووە باوەشی، لەسەر سینگی لە پرمەی گریانی دا، وەک هەزاران

دڵۆپەفرمێسک لە چاوەڕوانیدا بن، بێپرس ڕژانە سەر کراسە شینەکاڵەکەی سەردار، سەردار هەستی بە گەرمیی فرمێسکەکانی کرد، لەسەر کراسەکەوە تکانە سەر سینگی، مووی سینگیشی تەڕ بوون، ئەوانیش لە خوایان دەویست بە هەناسە و فرمێسکی کچێک بەسەر یەکدا بتلێنەوە. بەکوڵتر، بەکوڵتر و کوڵتر، کەس ناتوانێ، هەتا جەللادەکانیش بەرگەی گریانی کچ بگرن، جا گریانی نیان، بە هەزار حاڵ چەند هەناسەیەکی قەرز کرد، پێش ئەوەی هەناسەبڕ بێ، ئا نیان چەند هەناسەیەکی لەو ئارامییە پڕدڵسۆزییەی سەردار قەرز کرد، وەختێک سەری هێشتا لەسەر سینگی بوو، بەچرپەوە وەک بە دڵی سەردار بڵێ، گوتی، "خۆشم دەوێی..."

سەردار هەناسەی لە سینگیدا ڕاگرت، نیان بەردەوام بوو، "خۆشم دەوێی..."

سەردار دڵی کەوتە ناو سەرگۆی مەمەکەکانی، کە کەوتبوونە سەر سینگی تەڕی...

"خۆشم دەوێی... وەک ئەو سەگەی پارچەیەک لە دڵمی ڕفاندبێ، بە قەپ و چڕنووک لە سینگمی دەر هێنابێ. ڕاستە سەردەمی خۆشەویستی نییە، سەردەمی ناشتنی خۆشەوستییە."

سەردار گوتی، "ئەوە تەنها بۆ من ڕاستە."

وەختێک نیان زیاتر چووە باوەشی و زیاتر گریا، سەردار هەستی بە گۆمەمکە ڕەقەکانی کرد لەسەر کراسە تلیساوەکەیەوە دەکەوتنە سەر سینگی، ویستی بە هەموو هێزی بیگوشێ و قەرەبووی دڵە لەتوپەتەکەی بۆ بکاتەوە، بەلام بە هێزێک کە لە ڕامستیسی دووەمی قەرز کردبوو،

سینگی خۆی تۆزێک دوور خستەوە و سەری بۆ دواوە سووڕاند، وەک ئەوەی بیەوێ بڵێ، "نەک کەسێک دیار بێ."

دارەکان وەک هێشووی باڵندەیان گرتبێ، ڕەش دەچوونەوە، ئەو دارە بەتەمەنانە، لقە بڵاو و پان و درێژەکانیان بە ئاسمانی بەغدادا بڵاو کردبۆوە، هەر لقێک جێگای دەیان باڵندە و سەدان هێلانەی تێدا دەبۆوە، هەر دارێک شارێک یان وڵاتێک بوو بە سنووری خۆیەوە.

تاکە خۆشنوودی و شانازییەک کە ڕوخساری خەڵکی ئەو گەڕەکەی جێ نەدەهێشت، ڕەنگ و دەنگ و جیقنەی ئەو باڵندانە بوو. شەوی باڵندەکان تەنها شەوێک نییە، ساڵێکی تەواو، سەردەمێکی تەواوە لە ئارامی و خەوی ژێر باڵی یەکتر. دەبێ باڵندە بووبی، دەبێ پەڕت دەر دابێ، تا هەست بەو لەزەت و خۆشییە بکەی وەختێک سەرت دەبەیە ژێر باڵی گەرم و پڕتووکی نەرمی هاوڕێکەت و گەرمی نێوان تووکە وردەکان هەڵدەمژی، تا تێدەگەی شەوێک بۆ پشووی باڵندەیەک چەند درێژ و پان و بێکۆتاییە. وەختێک سەردار هەستی بە هەناسە بێئومێد و ساردەکانی نیان کرد، کە پەڕی لووتی نیانی دەلەراندەوە و بەر پێستی تەنکی بنباڵی دەکەوتن، پێی گوت، "تۆ چاو بنووقێنە، قووڵ قووڵ بڕۆ، دەبینی ڕووناکایی چەند ئازاربەخشە، دەبینی ژیان لە تاریکیدا کە لە ناخی خۆتدایە چەند ئارامبەخشە. چاو بنووقێنە باڵندە زەردە تەریوەکەی سلێمانی.

نیان چاوی نووقاند، بۆ چرکەیەک ئەهریمەنێک بەگوێیدا چرپاند، بۆ چرکەیەک هەستی کرد کە یەکەمجار حەزی لەو سەردارە کردبا، بەو قسەشیرین و عاقڵە کراوەیەوە، بەو

میهرەبانییەیەوە، بەو هەناسە گەرم و خەمخۆریەیەوە، کە وردەوردە دەکەوتە سەر پشتەملی، لە دلی خۆیدا گوتی، "ئاخ سەردار پێستت ئەوەندە ئەستوور و ئێسکت ئەوەندە قورس نەبایە."

سەردار زۆر هەولی دا هەناسەی ئارام بێ، ئێستا هەستی بە تورتیی گۆی مەمکی نەدەکرد، هەر وەک پێغەمبەرێکی بێمەبەست سنگی بە سینگیەوە پان ببۆوە، زۆری هەوڵ دا، زۆر زۆریش بلێ، "من براتم، من وەک براتم و هەمیشە لە پشتت دەبم" نەیتوانی درۆیەک بکات، یەکەم کەس خۆی باوەری پێی نییە.

هەموو شتێک بریاری خۆشەویستیی دابوو، هەناسە و خەوی قوولی هەزاران بالندە، مانگی ئەودیو لق و گەلا چرەکان، بێدەنگی کۆلانەکان، هەموشتێک بریاری خۆشەویستی دابوو، پەردەی بێجولەی ژن و مێردی گەنج، هەناسەی ئارامی پیرە ئادەمییەکانی مالەکانی وەزیرییە، هەموو شتێک، گلۆپی کزی ژووری کور و کچی گەنج، دەنگی نەرم و دوور دووری ئوم کلسوم، تەنها دلی ئەو دوو کوردە کێوییە نەبێ، کە بە هیچ ئەفسوونێک ناکەونە سەر یەک. سەردار لەوپەری تەنهاییدا، تەنهاییی کوردێک لەو هەموو شادمانییەدا چەند سەختە، غرورێک دلی گرتووە و ناکرێ لە هیچ عەشقێکدا بیتوێنێتەوە.

نیان ئاسکێکی راکردووی بن کەلبەی گورگ، زۆر لەو ئاسکە بریندارتر بوو پلینگ چەپۆکی لێ دابێ.

سەردار دەیزانی، ئاخر ئەو غەیبزانیش بوو، دەیزانی هیچ ئاسکێک رزگار نابێ گەر بکەوێتە بەر چەپۆکی پلینگ، نا هیچ ئاسکێک ناتوانێ رزگاری بێ، گەر بەر چەپۆکی پلینگ

کەوتبێ، مەگەر لە نەدیوێک بە برینەکانی خۆیەوە مردبێ.
ئەو شەوە نا، یان ئێوارەکەی کە دەکرێ ناوی بنێین ئێوارەی باڵندە، ئێوارەی بەختەوەریی درەخت، ئەو ڕۆژەی هەموویان، قوتابییانی هاوپۆل و هاوڕێی نیان نانیان دەخوارد، ڕۆژەکەی نیان و سەروەر و سەردار پێکەوە وێنەکەیان گرتبوو، نیان بە سەرداری گوت، "ئێستا زانیت کە ئاسکەکە بەر چەپۆکی پڵینگیش کەوتبوو، ڕزگاریش بوو."
سەردار پرسیی، "مەبەستت ئاسکە بریندارەکەیە؟"
نیان کە هێشتا ئەو سەردارە لووتگەورە و پێستئەستوور و پڕغرورەشی خۆش دەویست، گوتی، "ئا، ئاسکە بریندارەکە ڕزگار دەبێت و دەشێ جارێکی دیکە ئاویش بخواتەوە."
سەردار گوتی، "ئەگەر ئاویش بخواتەوە، بەترسەوەیە، ئەوەش لەبەر خاتری تۆ."
"پێشتریش ئاسک هەر بەترسەوە ئاوی خواردۆتەوە."
"ئەی خوێن، ئەی خوێن و برینەکە؟"

نیان بە چاوە سەوزە گەورەکانی، کە هەمیشە سەردار خۆی لەناویا دەدیت، تاکە شتی نیان بوو سەردار لەگەڵ خۆی بردبووی، زەردەیەکی خۆرئاواش. مەبەستی لەو پرسیار و گومانانە چییە، لەگەڵ ئەوەشدا گوتی، "ئاسکەکە نا، بەڵام من برینەکانی لەگەڵ خۆم دەبەم و دەیانشارمەوە."
سەردار بەوپەڕی پەرۆشی و دڵسۆزییەوە گوتی، "ئا، ئاسکی بریندار، بێگومان بۆنی خوێنەکەی گورگ و کەمتیار و چەقەڵ و ڕێوییش بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ. ئەوانیش بۆنی خوێنی تازەهەڵقولاو و گۆشت دەکەن، ئەگەر نەشیدۆزنەوە

برینەکان بۆگەن دەکەن.

نیان بەسەرکەوتنەوە گوتی، "ئەویش زمانی هەیە، زمان، دەتوانێ برینی خۆی بلیسێتەوە."

لەگەڵ ئەو وەڵامە سەردار دڵخۆش بوو، خەریک بوو توند لە باوەشی بکات، بەڵام بەوپەڕی نائومێدییەوە گوێی لێ بوو نیان گوتی، "بەداخەوە، من زمانم ناگاتەوە برینەکانی خۆم، شاردوومنەوە دەترسم بۆگەن بکەن."

برینی کچ، کە لە دەستدرێژییەوە دروست ببێ، بەدوای سەگێکی بەوەفادا دەگەڕێ بۆی بلیسێتەوە، کە سەردار هەرگیز نەیتوانی ببێتە ئەو سەگە یان ئەوە بە نیان بڵێ.

نەک نیان هیچ کچێک زمانی ناگاتەوە برینەکانی خۆی، هیچ کچێک ناتوانێ برینەکانی خۆی بلیسێتەوە، هەر بۆیە کچی بریندار، هەر بۆیە بۆنی خوێنی کچی بریندار لەناو کۆڵان و باخچەی کۆلێژ و ناو پۆلەکانیش دێت، هەر ئەو بۆنەش هەموو گیاندارە سەیر و گۆشتخۆرەکان بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ بە کوڕانیشەوە.

سەردار نەیزانی چۆن وەڵامی نیان بداتەوە، مەبەستی لەوە چییە زمانی ناگاتەوە برینەکانی، گومانەکەش ئەوەیە، سەرداریش لووتیکی گەورەی هەیە بۆ بۆنکردن، ئەگەر نیانیش وای نەگوتبا، ئەو دەیزانی نەزیفی عەشقی نیان وشک نەبووە.

کە چوونە دەرێ ، هەر بەرامبەر چێشتخانەی قوتابییان، لە بەردەم مۆزەخانەی سروشتی، لە بەردەم دایناسۆرە زەبەلاحەکە دانیشتن، دارە چڕەکان بەشێکی کورسیەکەی ئەوان و نیوەی پەیکەرە چیمەنتۆکەی دایناسۆرەکەشی

شـاردبۆوە. نیان پرسیی، "تۆ بۆ هیچ کەست خۆش ناوێ؟"

"من؟ چۆن دەکرێ کەسێک هیچ کەسی خۆش نەوێ؟"

نیان چاوە سەوزەکانی ئەوەندەی دەکرێ کردنەوە و سەیری ڕوخساری سەرداری کرد، سەردار بۆ ئەوەی سەرنجی لەسەر پرسیارەکە لا بدات ئاوەڕی بۆ لای دایناسۆرە چیمەنتۆکە دایەوە، نیان گوتی، "سەیری تۆ دەکەم، خۆت کردووە بە فریشتەی فریادڕەس، نێوانی هەمووان ڕێک دەخەیەوە، بەدەنگ هەموانەوە دەچی، کێشەی هەمووان بە هیی خۆت دەزانی، ڕاستگۆیت و جێی متمانەی، تەنها درۆ لەگەڵ خۆت دەکەی."

سەردار دیسانەوە پرسییەوە، "من؟""خۆت کردووە بە مەسیح، بە میدیاوە هەموو بەشی فەرەنسیت شێت کردووە، ڕەمزییە هار بووە، هەر باسی تۆ دەکات، پێت گوتووە، 'باسی کەرکوک بکەن تۆم بیر دەکەوێتەوە،' نەجاح ئەو کچە بەستەزمانە بەغداییە لەبیری چووبۆوە کوردە، برینیت کولاندەوە، مانی گرتووە لەگەڵ باوکی هەتا ناچێ بۆ فەرەنساش، گوایە باوکی هاتوتە لات تا لەگەڵیان بچی، گوایا بە کەسوکارت نەگوتووە. دەتەوێ ڕۆڵی کێ ببینی؟ گیڤارا؟"

سەردار خێرا فریای خۆی کەوت، "هیچیان ڕاست نیین، ئەوانە قسەوقسەلۆکن، من هێندە پیاو نیم کەسم خۆش بوێ. سەرەڕای ئەوەش ئەوەی چیرۆکێکی ڕاستەقینەی نەبێ، سەد چیرۆکی بۆ دروست دەکەن."

نیان گوتی، "منیش یارمەتیی تۆم ناوێ، با نەبمە چیرۆکێک، با برینەکانم ئەوەندەی دیکە بۆگەن بکەن."

سەردار ویستی باوەشی بۆ بکاتەوە، توند بەخۆیەوە

بگوشێ، برینەکانی بلێسێتەوە، تیماری دەردی بکات، دەکرێ لەباوەشی بکات، دەبێ لێوە گۆشتنەکانی ماچ بکات، مەمکە خڕ و بەردییەکانی، سەیری دەستی خۆی کرد، دەستی وەک هەنارێکی تێدا بێ، ڕوانییە دوگمە نیوەکراوەکەی نیان، چاوی شۆر کرد و سەری داخست. دەستی نیانی گرت، هەڵی ستاند و چوونە ئەودیوی قامیشەڵانە چڕەکە و پشت دارەکان، کە لەوە دەچوو هەر ئێستا و بۆ ئەوان لەوێ ڕوانرابن، بۆ ئەوان گەڵاکانیان ئەوەندە پان کردبێ، سەیری چەند پەپولەیەکیان کرد کە دوای یەکتر کەوتبوون. هەندێ هەنگی قورس بە هەڵاڵە، سێ-چوار بۆقی ورد، سەوز و خەت خەت، دەنگی زیکزیکەش دێت، باڵندەیەکی بچووک هێندەی خەونی منداڵێک، هەڵفڕی، یەکی دیکەش. هەستی هەردووکیان هاتبووە سەر کوڵین، لەناو خوێنیاندا شتێک جۆشی دەدا، جۆشدانەکە بەر دیواری دڵیان دەکەوت، لە قەفەزەی سینگیاندا دەنگی دەدایەوە، لێویان وەک بەرووی سەر ئاگر خەریک بوو هەڵتۆقێ، یەک ترپەی ماوە، یەک ترپە و بەس، وەک بەنداوێک دڵۆپێکی بوێ تا لەسەریەوە بڕژێ، وەک ئەو کەسانەی فەرمانی ئازادکردنیان دێ، ئەو کەسانەی لەبەر سێرەی گوللە ڕاگیراون، یەک هەناسە و پلپێدانانێک، دڵێک دەتەقێت و خوێن ئازاد دەبێت و لەوپەڕی هێزی خۆیدا دەکەوێتە ناو هەوا، تەرمێک بۆ بیرچوونەوە لەوێ دەکەوێ. نێوانی خۆشەویستی و سێکسیش هەر وایە، خۆشەویستی زیندانییەکەیە کە فەرمانی گوللەبارانکردنی هەیە، جووتبوونیش گوللەکەیە کە تەقی، کەسێک، تەرمێک دەخاتە ناو ژیانەوە. ئەوانیش ئاوا لەو چرکەیەدا کە لێویان

خەریک بوو بتەقێ، یەک قسەیان پێ نەمابوو، گەیشتبووە ئەو شوێنەی ئیدی لیک دەبوو لاپەڕەکەی خۆی بنووسێتەوە، کراسەکانیان خەریک بوو ئاگر بگرێ، دڵ یەک ترپەی مابوو بۆ سەعاتی سفر و گوللەی ماچ بتەقێنێ، لیک و تفی خەستیان لەناو دەمی یەکتردا بتەقێتەوە، تەرمی خۆشەویستییەک بکەوێتەوە سەر پێ. لەجیاتیی ترپەیەکی دیکە، دەنگێک لەناو دڵی سەردار دەڵێ، "یەکەم ماچ و یەکەم بەڵێن، تەنها مەرگ لێکیان جیا دەکاتەوە،" بابی چ حیکمەتێکی فێری سەردار کردبوو، سەردار دەتوانێ ماچەکە بکات، دەتوانێ ماچی دیکەش بکات، بەڵام ئەو بەڵێنی پێ ناچێتە سەر، ئەو تەرمی ئەو خۆشەویستییەی پێ زیندوو ناکرێتەوە، ئەو ناتوانێ جارێکی دیکە کۆستی نیان بخات و برینێکی دیکە بخاتە دڵیەوە، سارد بۆوە، سارد سارد، نیان دەستی چەپی کردە کۆڵەمست، ویستی توند بە سینگی سەداریدا بکێشێ، بەڵام زۆر هێواش خستیە سەر دڵی و گوتی، "برینەکانم خەریکن سارێژ ببن، ئەو عەشقەم بۆ ئەبەد ناشت، فەرهاد بەنەفرەت بێ، تۆش..."

هێشتا سەردار گوێی ڕاگرتبوو بزانێ ئەویش چی، بەڵام نیان ڕۆیشت، ڕۆیشت و دوور کەوتەوە، سێبەرێکی نەدی بەدیار نیانەوە، ئەو زووتر بیستبووی، ئەوانەی لە عەشقدا دەکەون دەستێک نابینن هەڵیان گرێتەوە، مەگەر دەستی خیانەت، سەردار نەیویست ئەو دەستە خیانەتکارە بێ. دەشیزانی ئەو عاشقە دۆڕاوانە دەکەونە تاریکییەوە و کەس لەگەڵیان ناڕوات، کەس دوایان ناکەوێت هەتا سێبەرەکانیشیان.

ڕاستە تا ئێستا سەردار کەسی نەدیوە لە تاریکیدا سێبەری هەبێ، جا ئەو کەسەی دەچێتە تاریکییەوە سێبەری بۆ چییە؟ ڕاستە نیان کەوتبووە تاریکییەوە، کەسوکارەکەی، دۆست و دەستەخوشکەکانی، هەتا سێبەرەکەشی جێیان هێشتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نیان شتێکی لێ دەڕژا، ئەوەش لەبەرچاوی سەردار، کە هێشتا لەسەر کورسییەکەی بەردەمی دایناسۆرەکە دانیشتبوو، شتێکی لێ دەکەوت، کتێبەکانی دەستی، پێڵاوە شینەکانی، گۆرەوییە سپییەکەی، تەنوورە ڕەساسییەکەی، چاکەتە شینەکەی، کراسە سپییەکەی، ژێرکراسە دیسان سپیەکەی، ستیانەبێجبیەکەی، دەرپێ دیسان بێجبیەکەی، نیان ڕووت ڕووت وەک ئەو کاتەی لە سکی بەڵقیس بەر بۆوە، سوور سوور و خوێناوی، گنجی نێوان سمت و ڕانی لەکاتی ڕۆیشتندا، کەمەری باریکی و پشتی سپی، کە قژە کارییەکەی نەرمتر لە با بەر شانە پڕەکەی دەکەوت، ختووکە کەوتە ناو دڵی سەردارەوە.

نیان بەبێ ئەوەی ئاپۆڕەی ئەو کچانە ببینێ لە بەردەم دەرگای بەشە ناوخۆییەکەیان لە هاتوچۆدا بوون. چووە ژوورێ، کەسێک بەردەستێک، تەشتێکی پڕخوێناوی بەردەم دەرگاکەی هەڵگرت، کە دەشێ هەر مامانەکەی کاتی خۆی بووبێ، یان ژنەکەی مامە دەروێش غەفوور، کە سەردار نەیدەناسی، تەشتە پڕخوێناوەکە هەڵدەگرێت و توند بەرەو سەروچاوی سەرداری هەڵدەدات، هەر چەند سەردار دوور بوو، دەترسێ ئەو تەشتە خوێناوە بەسەر ئەودا بڕژێت. لەو کاتەدا دەنگێک وریای کردەوە، "سەردار" سەردار ڕاچڵەکی

وەک ئەوەی لە ڕژانی خەوێناوەکە ئاگاداری بکەنەوە، ترساو و پەشۆکاو ئاوڕی دایەوە، میدیا بوو، "بۆ وا تێک چووی خۆ گورگت نەدیوە."

سەردار پرسیی، "نیانت دی؟"

"ئا تازە هاتەوە، خۆی دەشوا، وتی هەرچی چڵکی عەشق هەیە بە خۆمیەوە ناهێڵم، وتی ئیتر ناتوانم ژەهری کەسێک هەڵگرم."

سەردار هەستا میدیای بێوەلام جێ هێشت، کە گەیشتەوە، یەکسەر جلەکانی داکەند، چووە گەرماوەکە، ئەو لە بەشەناوخۆییەکانی قەنات بوو، سێزدە ئاپارتمانی گەورە بە ڕیزی یەکەوە، هەر یەکە و سێ نهۆم و هەر نهۆمەی دوازدە ژوور، هەر ژوورە و پڕ لە قوتابیی سەرگەرم و دڵبەتاڵ. کوڕی زاخۆ و هەولێر و بەسرە و ئەبوالخەسیب و تەلکۆچەک و سلێمانی و کوڕی هەموو دنیا، یابانی و میسری و ڤێتنامی، ئەو ژوورانەیان پڕ پڕ کردبوو لە بۆنی نێر، بۆنی هەوەس و دەستبازی و بۆن تەگە، پڕیان کردبوون لە بۆنی شەهوەت و مووی ئەستووری بەریان، هەناسە و هانکەهانکی شەیتانیبوونیان. لەسەر ئەو دۆشەکە ئیسفنجانەیان ئەوەندە شەیتانی ببوون، نەک ژن، پیاو نەیدەوێرا لەسەریان دانیشێ، نەوەک سکی پڕ بێ. گەورەترین خەمی ئەو وڵاتە ئەوەیە کوڕەکان، پیاوەکان، هەرزەکار و باڵقەکان، هەموو نێرینەکان لە بازاڕ و لە یاریگا و لە مەلەوانگە و لە مزگەوت و لە بەشەناوخۆییەکانیش پێکەوەن و هەمیشە خەیاڵیان لای ئەوەیە دیوارەکان، قەرەوێڵە و دۆشەکەکانیان درزێکی تێ ببێت و خۆیانی پێ ڕەحەت بکەن.

سەردار هەر کە گەیشتەوە، یەکسەر چووە گەرماوەکە، بۆ ئەوەی لە بۆنی نێر و شەهوەتی کوڕەکانی پێش خۆی، گەرماوەکە پاک بکاتەوە، جوان هەمووی شووشت. هەر کە یەکەم گوژمە ئاوی گەرم بەر پێستی کەوت، هەموو ماسوولکەکانی گرژ بوون، دووکەڵ لە هەموو پێستی بەرز دەبۆوە، نیان بەو شێوەیەی جلەکانی فڕێ دابوون، پێڵاوە شینەکانی و دەرپێ بێجییەکەی فڕێ دابوو، هاتە ناو گەرماوەکە، هەناسە و هانکەهانکی سەردار خەریک بوو دیوار و سەقفی ژوورەکە بەسەر یەکدا بتەپێنێ. وای دەزانی تەواوی ئاوی دیجلە لەو دوشە ژەنگاوییەوە بەسەر ئەودا دەڕژێ. نەیتوانی چاوی بکاتەوە و سەیری چاوە سەوزەکانی نیان بکات، لە خەیاڵی خۆیدا وەک ئەو ڕۆژەی لە وەزیرییە لە بەر هەتاو ڕای گرت و سەیری قوڵاییی چاوەکانی کرد، وردەوردە چاوی نیان ئاوی تێزا، هەر ئاوا توند شانی گرت و سابوونی لە مەمکە بەردەکانی دا، سابوونەکەی لێ بەر بۆوە، بە هەردوو دەست گرتی و هێند بەتوندی بە خۆیەوە گوشی، هاوارێکی توندی لێ هەستا و هەستی کرد نیان لە سینگیدا ون بوو، دەنگێک لەودیو گەرماوەکەوە، گوتی، "هێواش، هێواش دار و دیوارت کون کرد، هەی جەللاد."

سەردار کە بەهۆش خۆی هاتەوە ئارەقە لە ئاو زیاتر لە سینگی دەچۆڕا، دڵخۆش بوو کە بەڕاستی نیانی لە باوەش نەبووە، دەنا بە دووتەکان و بەو گوشینە توندە ئێستا مردبوو. شەرمەزاری ئەو خەیاڵانەی خۆی بوو، شەرمەزاری ئاو و سابوون، دوشی گەرما و و دەنگەکەی دەرێ بوو.

لە ئاوێنە بچووکەکەوە سەیری خۆی کرد، وەک سەیری درندە و پیاوکوژ بکات، تفێکی خەستی لە خۆی کرد و گوتی، "کورە ئاڵتوونییەکەی بەشی ئینگلیزی چەند درۆزن و سەخیف و قەحبەی."

# ٤

بەڵقیس هێشتا سەیری وێنەکەی دەکرد، نیان جلی زانکۆی لە بەردا بوو. کوڕە ڕەش و پیسەکەی تەنیشتی، سەیری کوڕەکەی دیکەی دەکرد، ئەویش چاوگەورە و قژبژ و لووتبەرانی، ڕیشێکی زەرد و سمێڵێک، تەواو کەمالی مێردی بیر دەخستەوە، زۆر حەزی لەو سمێڵانەیە، ئەستوور نا، بەڵام درێژ بە جۆرێک لە لێوی خواریێ بخشێن. نیان لە وێنەکەدا توند لیڤێکسەکەی لەباوەش گرتبوو، پەنجە درێژ و تەنکەکانی کە هێندە نەبوو ئێسکەکانی دیار بن، لەسەری گریێ دابوون. بەڵقیس لە دڵەوە گوتی، "قوربانی ئەو پەنجانەت بم، چۆن دایکت شەرمەزاری پیاوەکان کرد؟"

بە هێواشی بۆ دەمی برد و ماچی کرد، گریا، "من نیم، دوای تۆ من هەر نیم."

هەر لەسەر کاغەزەکەوە دەستی بە قژە زەردەکەیدا هێنا، "زۆرم چاوەڕێ کرد تا لەدایک بووی، پێنج برا یەکبەدوای یەکدا هاتن، لە یەکەم منداڵەوە من باوەشم بۆ تۆ کردبۆوە،

دووەمیشیان هەر کوڕ بوو، سێیەم و چوارەمیش، پێنجەمیش، لەگەڵ پێنجەم کوڕم لەدایک بووی، دوای ئەویش، بە هاتنی تۆ ماڵەکەم ڕووناک بۆوە، ناوم نای نیان، گوتم لێرەوە ژیانی نیانیی من دەست پێ دەکات، گەنج گەنج بوومەوە، وەک تۆ نیان بوومەوە. ئاخر دایکێک کە پێنج کوڕی بەسەر یەکدا نەبووبێ، پێنج کوڕ بە ئاشوب و شەڕ و دڵەڕاوکێوە، پێشتریش لەگەڵ یازدە نێرینە لە ماڵێکدا نەژیا بێ، نازانێ لەدایکبوونی کچێکی زەرد دوای ئەو هەموو هاتوهاوار و ئاشووبە چ شیرینە. خەپە بووی، ئەو دەمیش گەندەمووی سەرت زەردزەرد بوون، ڕێک دە ساڵ چاوەڕێم کردی، یەک لەسەر یەک منداڵم بوو، هەر بە نیازی تۆ فاڵی سکم دەگرتەوە، بەختی ژن لەسەر فاڵی سکی وەستاوە. دەترسم، زۆر دەترسم، ونبوونی ئەو جارەشت زۆر لە چاوەڕوانیدا بمهێڵێتەوە."

مەحموودی کوڕی بەڵقیس هێشتا بەسەر ژن و کچ و کوڕە باریکەکەدا هاواری دەکرد، "پێم بڵێن کوڕە نەفرەتییەکەتان لەکوێیە؟"

سالار پرسییەوە، "براکەم؟"

چاوێکی لە دایکە ڕەش و سیس و بێگیانەکەی کرد، پەنجەی بۆ سەربان ڕاداشت. مەحموود خێرا چووە سەربان، بەڵقیس خێراتر بەدوایدا، سالاریش بەدوایاندا، لە سەربانەکە ژوورێکی نارێک و خوار و بەگڵدروستکراو پێشوازیی کردن. هێشتا سالار پەنجەی بۆ دەرگا ئاسنەکەی ژوورەکە ڕادەکێشا، مەحموود سەیری بەڵقیسی کرد و سەیری دەرگاکەی کردەوە، وەک بڵێ، "ئاوا ئەیاندۆزمەوە،" وەک بڵێ "بەدزی منەوە دێی،" وەک بڵێ، "ئێستا کۆتاییان پێ دێنم."

بە دەستێک دەمانچەکەی گرتبوو، بە دەستەکەی دیکە دەرگا ئاسنەکەی پاڵ پێوە نا، دەرگاکە کەوتە سەر پشت، بەڵقیس دڵنیا بوو ئێستا نیان لەو ژوورە دەدۆزێتەوە، زراوی لە تەقە و گوللە چووبوو، ویستی بڵێ، "مەحموود گیان بە نیگایەکی تۆ نیان ئەمرێ چ پێویستت بە دەمانچەیە؟" بەڵام بواری ئەو قسەیە نەمابوو. توند دەستی مەحموودی گرت و دەرگاکەی پێوە دایەوە، وەک دێڵە گورگێکی بریندار لە بەردەم دەرگاکە وەستا، "تۆ نایەیە ژووری، من ئەزانم چی ئەکەم، بۆ خۆم ئەچم ئەیانهێنمە دەرێ، بڕۆ خوارێ."

ئەوەی لە یەکەم ڕۆژەوە سینگیی گرتبوو، ئەو قسەیەی کە قورگی مەحموودی داخستبوو، لە سلێمانییەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی، دەشێ زۆر زووتریش ویستبێتی ئەوەی پێ بڵێ، "تۆ، ناز و مەکری تۆ ئەو کچەی لەخشتە برد، هەرگیز لەبەر تۆ نەمانتوانی قسەیەکی پێ بڵێین، دیسان ڕێم لێ مەگرە، با زیاتر حەیامان نەچێت و لێرەوە کۆتاییی پێ بێنم."

بەڵقیس، هەزار قسە هاتنە سەر لێوی بەڵقیس، "تۆ ئەی برای گەورە، تۆ ئەی پادشای ماڵ بۆچی ڕۆژێک خوشکەکەت نەلاواندەوە، بۆچی ڕۆژێک بۆ خۆت نەتبردەوە بەغدا، بۆ ڕۆژێک لە پێویستییەکانیت نەپرسی؟ مەحموودی نامۆبارەک تۆ نەبووی نامەی دڵداریت پێ دەنووسی بۆ ئەم کچ و ئەو کچ، تۆ نەبووی دیاریت بۆ کچانی هاوسێ پێدا دەنارد، ژنە گەنجەکەی قەسابەکەی هاوسێمانت نەهێنابووە ژوورەکەی ئەو و ئەویشت ناچار کردبوو لەودیو دەرگاوە چاوەڕێت بکا؟" هەزاران قسە قورگی بەڵقیسیان گرتبوو، هەزاران قسە لە وەختی خۆی نەکرابوون، کوا ژنی کورد

ئازایەتیی ئەوەی هەیە لە وەختی خۆی قسەکانی بکات؟ بە پێچەوانەوە لە وەختی خۆی پەردەپۆش کرابوون، ئەو دەم ئەوە سەرکەوتن و شانازی بوو، هەموو ئەو قسانە بەسەر یەکدا بوورابوونەوە، تەنها بوێری و بێشەرمییەکی دەویست لە هەولێر و لەو سەربانەی سەیداوا بەئاگایان بێنێ.

بۆ ئەوەی سەگێک بە خەبەر نەهێنی دەبێ بەرگەی ئازاری بزماری ژێر پێ بگری، با ژەنگاوییش بێ، با لە پشتەپێشتەوە هاتبێتەوە دەرێ.

مەحموود ئاگر لە چاوی دەباری، پووشی ئەو قسانە بەتەواوی دەیانسووتاند، ئەوە چەندە بەدیار قسەوقسەلۆکی پشت خوشکەکەیەوە دەسووتێت و حەسرەت هەڵدەکێشێ، لەو ڕۆژەوەی چۆتە ئەو بەغدا فاحیشەیە، هەر ڕۆژە کەسێکی دۆزیوەتەوە. لەو ڕۆژەوەش مەحموود خۆی لە خەڵکی سەربلند و سەربەرزی شارەکەی دەشارێتەوە، ناتوانێ سەردانی ماڵی خزم و دراوسێ بکات، ئەوە چەند مانگە بە هۆی ئەو حەیاچوونەوە ناتوانێ بچێتە لای ژنەکەی، ناتوانێ شەو لایەوە بنوێت و ڕووی تێ بکات، لە تاریکییشدا شەرم لە جەستەی ژن دەکات و خوشکەکەی بەڕووتی دێتە بەرچاو، ئاخر چۆن ماڵە بەناوبانگەکەی سلێمانی، کوڕە نەبەردەکانی مەڵکەندی، بازرگانەکانی قوماش و ئاوریشم، قاچاخچییەکانی کوتاڵی گرانبەها، بە هۆی تاقە کچەکەیانەوە سەرشۆڕ بن؟ ئەو هەر یەکەم جار لەگەڵ ئەوە نەبوو، ئەو خوشکە چاو پڕەونەق و سیحرەی بچێتە بەغدا. ئەو کاتە بە باوکی گوت، "نابێ، نابێ بچێت، کچ چیی لە شەهادە دەست کەوتووە جگە لە بەڕەڵلایی و حەیاچوون؟"

ڕاستیشی کرد، ئەوەتا حەیای بردن و هەر ڕۆژەو هەتیوێک دەدۆزیتەوە. ئاخر ئەو هەتیوە خوێڕیانەش کە بە عاشقبوونی کچێک شاگەشکە دەبن و دەدەنە شەقەی باڵ، ئەوە بۆچی کە خوشکەکانیان عاشق دەبن وەک کەر لە قوڕدا دەچەقن. ڕۆژێک هەتیوێکی گەمژە و زمان تەپ و دەنگ، زۆربلێیی فێر کردبوو تەلەفۆن بکات و بڵێ، "بەساقەتان بم، کیژەکەتانم بدەنێ،" هەی نەفرەتیی زمانسەگ، تۆ بەچ چاووڕوویەکەوە، هەر بە تەلەفۆن داوای کچی ئەشرافی بەزازەکانی شار دەکەی. هەی هیچوپووچ، بێ دەماغی کێوی. ڕۆژێکی کە لەگەڵ کرمێکی ڕەشی دڵپیسدا... مەحموود نەیتوانی چی دیکە ئارام بگرێ، دەستی دایکی بەتوندی گرت و گوتی،

لە بەر ئەم دەرگایە لاچۆ هیچیان لێ ناکەم."

بەڵقیس وەک گوێی لە دەنگی نیان بێ، هاوار وناڵەی دەهات، دەنگەکە ترس و پاڕانەوە بوو، وەک داوا لە دایکی بکات، هەم بیلاوێنێتەوە و بێتە باوەشی، هەم نەهێڵێ ئەو برا دڵڕەق و تۆڵەستێن و دڕندەیەی بێتە ژوورێ. ئاخر دایکێک لەنێوان دوو منداڵی خەتاکاردا، کە هیچیان گوێیان بۆ نەگرتووە، چۆن نابێتە سەد لەت؟ دوو منداڵ ئارەزووی هەریەکەیان بە لەناوبردنی ئەوی دیکەیان تەواو دەبێ، نیان بە دوو دەستی بێهێز وەک سینگی کۆتر لەودیوەوە خۆی بە دەرگاکەدا دەکێشێ، هەناسە و گمەی دەگاتە گوێی، دایکیش دڵی دەکەوێتە ناو هەر شتێکەوە، کە لە منداڵەکەیەوە نزیک بێ.

مەحموود تەنها بە بیستنی هەواڵی عەشقبازیی نیان سەری بە دیواردا کێشا، خوێن فیچقەی کرد و لەهۆش خۆی چوو، ئەی ئەگەر ئێستا بەیەکەوە بیانگرێ، بەڵقیس دڵنیا بوو ئێستا

بیاندۆزێتەوە هەردووکیان پارچەپارچە دەکات، هەردووکیان دەکوژێت و هەر لە سەربانەوە فڕێیان دەداتە خوارێ، ئەو تانکیی سەیداوایەش دەبێ تا سەد ساڵی دیکە ئاو هەڵڕێژێ، تا تەرمەکانیان و ئەو گوناهە بشواتەوە. جگە لەوەش دەبێتە نامۆترین چیرۆک لە هەموو ژیانی خۆیدا شووشتبێتیەوە.

جگە لە کچەکەی، خەریکە کوڕەکەشی لەدەست دەچێ، ئەویش دەبێتە پیاوکوژ و خوێنڕێژ، دەبێتە تاوانبار و داواکراو، بەندێکی دڵی بە هێجگاری دەچێتە زیندانەوە و ڕەنگی دڵیش بۆ ئەبەد دەچێتەوە، پۆلیس دەیگرێت و دەشێ یەکسەر لەسێدارەی بدەن، دەکەونە سەر زمانی خەڵک و سەیرترین چیرۆکی عەشق و مردن بە هۆی خوێنی منداڵەکانی ئەوەوە دەنووسرێتەوە. چیرۆکی کچێک کە هەڕەشە و تۆڵەساندنەوەی پێنج برا و باوکێکی ئەشراف و خانەوادەیەکی حەفتاوسێ کەسی نایترسێنێ و دەست لە خۆشەویستیی ناشیرینترین کوڕی دنیا هەڵناگرێ. کوڕێک بۆ چرکەیەک بیر لە ژیانی خۆی ناکاتەوە و نامووسی خۆی بە خوێن دەکڕێتەوە. بەڵقیس خەریکە لە ژنبوونی خۆی و لە کچخستنەوە پەشیمان بێتەوە. ئاخر ئەو گریابوو، شەوانە وەک مانگای سەربڕاو لرفە و ناڵەی هاتبوو، بۆ نیان لرفەی هاتبوو، هەنسک و ناڵەی هاتبوو، بەڵام نەیگوتبوو، کچ نەگبەتی و شوورەییە، نا، نەیتوانیبوو وا بڵێ.

ئێستا لە بەردەم دەرگاکە وەستاوە، توند دەسکەکەی گرتووە، مەحموود لە بەردەمی سوور بۆتەوە، خەریکە خوێن لە چاویەوە فرتە بکاتە دەرێ.

مەحموود دەمانچەکە دەخاتە سەر سەری خۆی، ڕێک

دەیخاتە تەنیشت گوێی، ئەو دەستی دایکی توند گرت، بەڵام ئەو ناتوانێ پاڵ بە دایکیەوە بنێ و فڕێی بداتە سەر عەرزەکە، ناتوانێ ڕای کێشێتە لاوە، ناتوانێ پێ لە ڕانیشی بنێت. دەزانێ دایکی نەخۆشی غودەی هەیە و دەشێ بە قورسیی پەپوولەیەک هەرچی ئێسقانی جەستەی هەیە بشکێ. ناتوانێ دەستی ڕاکێشێ نەک مەچەکی بەدەستیەوە بێ.

بۆیە مەحموود دڵی دایکی کردە نیشانە، دەیزانی دڵی دایکی ئێستا لەکوێیە، ڕێک لە سەری ئەو دایە، بۆیە لوولەی دەمانچەکەی کردە سەری خۆی. بەڵقیس ئەوەش دەزانێ مەحموود ڕەحم بە خۆی ناکات، هاکا تەقاندی، هاکا دەستی جووڵاند، هاکا خوێن پڕژا و ئاسمانی داپۆشی، لاشەی کوڕەکەی کەوتە سەری. بەڵقیس توند پشتێنی مەحموودی گرت، "نەکەی، نەکەی، بە دڵی منیەوە بنێ، سەرەتا بە دڵی منیەوە بنێ، با من ڕزگارم بێ."

قیژە و هاوار و فڕکانفڕکان لە ژوورەکە دەهات، بەڵقیس زیاتر ترسا، گوتی، "سوێندم بۆ بخۆ تەقەیان لێ ناکەی."

مەحموود هێواشتر دەستی لە کەمەری خۆی کردەوە و وەک گریان، گوتی، "بە سەری تۆ، بەس بابزانم..."

بەڵام کوا سەری دایک ئەوەندەی حەیاچوون بەنرخە. لەگەڵ ئەوەشدا دەرگاکەی شل کرد، مەحموود پاڵێکی توندی بە دەرگاکەوە نا، دەرگاکە کەوتە سەرپشت، پێش ئەوەی هەنگاو بۆ ناوێ بنێ، پێش ئەوەی بچێتە ژوورێ، سەدان کۆتر، سەدان کۆتری سەد ڕەنگ، کە بەشی هەرە زۆریان سپی بوون یان پەڵەیەکی سپیان تێدا بوو، وەک گێژەڵووکە لە دەرگاکەوە هوروژمیان کرد و ئاسمانی سەیداوایان کردە

هـەزار ڕەنـگ. ئاسـمانی سـەیداوا بـووە ئاسـمانی فڕیـن و ئاسـمانی ئـازادی و گمـەی بێبڕانـەوە، ئاسـمانی شـین ڕەنگکـرا بـە سـپی و زەرد و قاوەیـی و سـەوزی فڵچـەی سـینگ و باڵـی کۆتـرەکان.

تـا چـاو بڕ بکات بـەرز بوونـەوە، بـەرز بەرز، جـووت جووت لـە ئاسـمان سـەمایان دەکرد، سـالار تەقڵەکانی دەژمـاردن، یەک، دوو، سـێ... حـەوت، بەڵقیـس لـە ترسـی لێشـاوی کۆتـرەکان لـەوێ کەوتبـوو، بـە ڕاکشـانەوە سـەیری هەڵفڕینـی کۆترەکانـی دەکـرد، هەرگیـز ئاسـمانێکی ئەوەنـدە جوانـی وەک سـەیداوا نەخشـاوبەکۆتری نەدیوە، بەڵام بۆ ژنێک کە کچەکەی خیانەتی لێ کردبێ و لەسـەر لێواری مەرگیش بێ، جوانی چ دەردێکـە! مەحمـوود چـووە ژوورەکـە و بـە هەمـان خێرایـی گەڕایـەوە، دیسـان سـینگی سـالاری گـرت و لێـی پرسـی، "کـوا، کـوا بـرا نەفرەتییەکـەت؟"

ئەویش زۆر سـادە دیسـانەوە دەسـتی بۆ کۆترەکان ڕاکێشـا. مەحمـوود شـیڕاندی بەسـەریدا، "تـۆ دەبـێ بـرای مەیمـوون و سـەگ بـی، نـەک کۆتـر. بـە هەمـان تووڕەیـی بـە پلیکانەکانـدا هاتـە خـوارێ."

***

خەڵکـی سـەیداواش ئـەو هەمـوو کۆترەیـان بـە جارێـک لـە ئاسـمان نەدیبوو، ئێسـتاش خەڵکـی ئـەو گەڕەکە ئـەو ڕۆژەیـان لەبیـرە، ئـەو ڕۆژەی ئاسـمان باڵـی گرتبوو، دەیانزانـی کوڕەکانی مەحمـوود بەڵـەک لـە ڕۆژی ونبوونـی بابیانـەوە، خوویان داوەتە

کۆتر و بۆ سۆراغی بابیانی دەنێرن، دەشیانزانی ئێستا ماڵی مریەمەڕەش نییە و ماڵی کۆترە. بۆ خۆیشیان بۆنی کۆتریان لێ دێت و دەشێ کشەیان لێ بکەی بدەنە شەقەی باڵ. خەڵکەکە هەموویان بە جارێک سەریان بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە.

بۆ گەلێک ئازادی بە خەونیش نەدیبێ، زیندان لە بەردەمی ماڵەکەیەوە تا ئەوسەری دنیا درێژ بووبێتەوە، تەماشاکردنی ئەو هەموو کۆترە بە جارێک کە لە ژوورسەریەوە بداتە شەقەی باڵ، تۆزێک لە ئازادییش زیاترە. سەدان کۆتر ببوونە نەخشی ئاسمانێکی شین شین، هەموویان، خەڵکی سەیداوا هەموویان پیاوێکیان دیت، وەک لە دەمی ئەژدیها دەر پەڕێ لە ماڵی مریەمەڕەش هاتە دەرێ. پییان سەیر بوو ئەو پیاوە سلێمانییە، وەک خۆیان دەیان گوت، "بە جلک و جەمەدانەکەیڕا دیارە خەڵکی ئەوێیە" لە ماڵی مریەمەڕەش بێتە دەرێ، کە باوەڕیان نەدەکرد ئەوانە هەر ناوی سلێمانییشیان بیستبێ، نەک هەر ئەوە ئەو ماڵە لەگەڵ سێبەری خۆیشیان نابنە دۆست، جا چ جای لەگەڵ خەڵکی شارێکی ئەوپەڕی دنیا. یەکەم جار کۆترێکی وەک چۆڕەی شیری، یەعقووبی، کەللەزلی پەڕلەپێ لەسەر لێواری تانکییەکە نیشتەوە، جا یەک-یەک و دوو-دوو چوونە تەنیشتی. سالار دەیزانی هەموویان تینوویانە و دەبوو زووتر مشوری ئاوی خواردبان. بەڵقیس کۆترێکی سپی، کە هاوشانی کۆترێکی ڕەشی باریک تا تۆقەڵەی ئاسمان چووبوو بە نیان دانا، گوتی، بێگومان لە دڵی خۆیدا، "بزانم دێتە لام، بزانم بۆ لای من دێتەوە."

کۆترەکە لەناو ئاسمانی شینی بێسنوور یەک لەسەر یەک تەقڵەی لێ دەدا، دواتر لەگەڵ کۆترە ڕەشەکە بەئاسۆیی بەرەو خۆرەکە فڕین، ئەوەندە دوور فڕین بە ئەندازەی دوو پەپوولە مانەوە، ترسا بکەونە ناو گڕی خۆرەکەوە، گەڕانەوە و چەند سووڕێکی دیکەیان لێدا و لەدوای هەموویان کۆترە سپییەکەی کە بە نیانی دانابوو، لەسەر تەلێکی ئەستووری ڕۆخی تانکییەکە نیشتەوە و دڵۆپە دڵۆپی لێواری تەنکییەکەی دەخواردەوە.

بەڵقیس دڵی بە ئاوخواردنەوەی کۆترەکە خۆش بوو، پێی وا بوو نیان دەگاتە خۆشی و بۆ خۆیشی چاوی پێ ڕوون دەبێتەوە و دەگاتەوە کچەکەی، ئەوەش فالێکە و دایکان دەتوانن بە تەرسی کەریش بیگرنەوە.

لەو کاتەدا هەستی کرد لەدواوە یەکێک بەنەرمی دەست بە پێیدا دێنێ، هێشتا بەڵقیس لەناو دەرگاکە کەوتبوو، هێواش ختوکەی دەدا، زانیی نیانە، خۆی لە شوێنێکی ژووری کۆترەکان شاردۆتەوە، کە زانیویەتی مەحموود ڕۆیشتووە، هاتۆتە لای دایکی، ویستی تۆزێک خۆی گران بکات، نەیتوانی، بەدڵخۆشییەوە ئاوڕی دایەوە، دیتی کەروێشکێک ملی خۆی لە پێی ئەو دەخشێنێ، کەروێشکیش لای ئەو سەرقافڵەی هەواڵی شوومە.

سالار لەگەڵ کۆترەکان دەدوا، بانگی دەکردن و فیتووی بۆ لێدەدان، ئەوانیش لەگەڵ دەنگ و دەست ڕاوەشاندنی ئەو پۆل پۆل وەک شەپۆل دەجوولان، ئاویان خواردبۆوە، کۆتری زیرەک چەند دڵۆپێک دەخواتەوە، ئەوانەی دەیانەوێ تا دوورترین شوێن، تا بەرزترین خاڵ، تا ناو چاوی خۆر بفڕن،

خۆیـان قـورس ناکـەن و هـەر هێنـدە ئـاو دەخۆنـەوە زمانیـان تـەڕ بێ، تەنها دوو دڵـۆپ بچێتـە چیکڵدانەیـان، تەمبەڵەکانیش، پانوپـۆڕ و پشتشینەکانیش ئەوەندەیان ئاو دەخواردەوە، هـەر ئـەوە بوو، یـەک-دوو جار بـەدەوری تانکییەکـەدا دەسـوڕانەوە و دەنیشـتنەوە، دەکەوتنـەوە ئـاو خواردنـەوە و گمەگـم و یەکترخوراندن و سـەر لـە بنباڵـی یەکنـان.

بەڵقیس هەسـتا چـووە نـاو ژووری کۆتـرەکان، چواردەوری دیـوارەکان و ناوەنـدی ژوورەکـەش بەڕیـز هەمـووی هێلانـە کۆتـر بـوو، جگـە لـەو قەفـەزە درێژانـەی پشـتیان پێکـەوە دابـوو. جیکەجیکی کۆتـرە کڕکەوتـوو و بێچووەکانیشـیان ژوورەکـەی پـڕ کردبـوو. چەند کەروێشـکێک بەو ناوەدا بڵاو ببونەوە. سـالار هاتـە ژووری و لـە سـووچی ئەوسـەری لای ڕاسـتی دیوارەکـە سـەیری هێلانەیەکـی کـرد، کۆترێکـی دیسـانەوە سـپی، بەسـەر هێلکەکانیـەوە ملـی لار ببـۆوە، نەیتوانیبـوو هێلکەکانـی جـێ بهێڵـێ، لـە تینـوان خنکابـوو، کـە سـالار دەسـتی دایـە ناڵەیەکـی مەرگهێنـی لێوە هـات. بەڵقیس دەزانـێ چارەنووسـی دایـک هـەر مردنـە بەسـەر هێلکەکانیـەوە. هیـی کۆتـر، کـە هەڵنەهاتـن دیـارە پیسـە، هیـی ژن وا نییـە، هێلکـەی ژن دەترووکـێ، دێتـە دەرێ و دەشـبێتە منـداڵ، دایـک دەبـێ عومرێـک چـاوەڕێ بـکات، تـا دەزانـێ ئـەوەی هەڵـی هێنـاوە پیسـە یـان نـا.

کۆتـرە داکانەکـە ملـی بەسـەر هێلکەکانـدا لار ببـۆوە، هێلکـەکان بەئاسـتەم تترووکابـوون و جیکەجیکـی بێچـووەکان ئارامیـی یەکجارییـان بـە دایکیـان دابـوو، هەموویـان دەندوکـە زەردەکانیـان هێنابـووە دەرێ. مردنـی ئـەو کۆتـرە داکانەیـە شـوومە، بـەلای کەمـەوە بـۆ بەڵقیس. ئـەو ڕۆژەی بەڵقیس دایکی

مرد، هەر دوانزدە ساڵان دەبوو، ئەو ڕۆژە هەموو کۆترەکان بە سەردا کەوتبوونە ناو کوپەکانی ماڵیان، ڕیزێک کوپە بۆ ئاو ساردکردن بەدرێژیی دیواری حەوشە دانرابوون. لەو ڕۆژەوە لە خێزانەکەیان کەس نەیوێراوە کۆتر ڕاگرێ. لە کاتی ئاساییدا بەڵقیس باوەڕی بەو قسە هیچانە نەبوو، کۆتری خۆش دەویست بەتایبەتی داکانەکانیان. بەڵام ئێستا نا، چونکە دایکێک کە منداڵەکەی لە مەترسیدایە، مردنی مێرووولەیەک، باڵشکانی پەپوولەیەک بە مردن و باڵشکانی منداڵەکەی خۆی دەزانێ.

دایکی سالار هاتبووە سەربان، جامە ئاوێکی بۆ بەڵقیس هێنابوو، بەڵقیس کە نایەوێ کەس بە زەلیلی و بێهێزی بیبینێ، هەستایە سەر پێ، ویستی ئاوەکەی لێ وەر نەگرێت، خەم و خەفەتی دنیا و هەزار دڵۆپە فرمێسکی چاوەڕێی لە چاوەکانی ژنەدا دیت. ئەو ژنەش لە دایکایەتی دەگەیشت، ژنێک لە دنیادا نییە بۆ دایکێکی جگەرکونکون و سەرگەردان دڵی داغ نەبێ. با ئەو ژنە هەرگیز لەزەتی منداڵبوونیشی نەکردبێ. بەڵام ئەو بووبووی، بە دەردەوە بووبووی.

مریەمەڕەشی غازی کوورەچی سێ منداڵی ببوون، سەروەر و سالار و گوڵنار، ئەو گوڵنارەش، مێردەکەی، مەحموود بەڵەک ناوی نابوو، لە زیندان لە هاوڕێیەکی بیستبوو، هاوڕێیەکەی هەڵواسرابوو، بەڵام پێشتر گوتبووی، "ژنەکەم دووگیانە کچی ببێ، حەز دەکەم ناوی بنێم گوڵنار،" کە مەحموود ئازاد کرابوو، چووبووە ماڵی ئەو هاوڕێیەی ژنەکەی منداڵەکەی ببوو، کچیش بوو، بەڵام بەمردوویی لەدایک ببوو، دواتر کە بۆ خۆیان لەدوای هەردووک کوڕەکە

سەروەر و سالار کچێکیان بوو، ناوەکەی حازر بوو، گوڵنار، مەحموود بەڵەک زووزووش دەیگوت، "ئەو کچەم هێندەی هاوڕێکەم خۆش دەوێ."

وا نەبوو، ئەو دەم مریەم وا نەبوو، ئەو ڕەش و پیس و چەرمن نەبوو، ئەو کچێکی گەنمڕەنگی خوێنشیرین بوو، قژی ئەستوور و درێژ بوو، زووتر زۆر زووتر دایکی بۆی دەکردە پەلک. ریزێک پەلکی باریک، ئەولا و لایەکەی دوو-دوو پەلک و پشتەوەکەشی شەش پەلک، ئەگەر قژە ڕەش و قورسەکەشی نە هۆنیبایەوە، بەری دەدایەوە و تەواوی پشتی دادەپۆشی.

مەحموود ئەوەی بەسەر هێنا، مەحموود وا ڕەش و پیس و چەرمنی کرد، مەحموود لەو گوندەی ئەوەی بن هەولێرێ، لەسەر بێگاری لە ئاغای یاخی دەبێ، بە ڕووی ئاغایدا هەڵدەشاخێ، گوایە چەوساوەتەوە و بەزۆر و بەبێ کرێ هەمیشە کاری پێ دەکەن، جا ئەو دەمی کێ نەدەچەوسایەوە و کێ یاخی نەدەبوو؟ ئەوەش هەمووی بە فیتی شیوعیان، ئەو دەمی ئەو مەحموودە هەوایەکی وای چووبووە سینگی، پێی وا بوو ئیستیعمار لێی دەترسێ. ئا ئەو دەمی لە گوندی هەڵاتبوو، هات هات، هاتە هەولێرێ، لێرەش بە غازیی کوورەچییەوە نووسا، بووە شاگردی، زۆر مایەوە، هیچ شاگردێک هێندەی مەحموودی لەکن غازیی کوورەچی گیر نەببوو، دڵی مریەمیش لە مێشە هەرە بچووکە سەوزەکان بوو، عەجوول و بە گیزەگیز، وڕکگر و بێئامان. جا ئەو مێشە سەوزە جوان و شیرینانە زۆر کەم بەسەر گوڵ و شیرینی دەنیشنەوە، بەسەر مەحموودەوە نیشتەوە، ئەویش ئەوەندە

گیرا و بەردرا، ئەوەندە دوور خرایەوە و خۆی شاردەوە، ئەوەندە لێدانی خوارد و بەبێهۆشی هێنایانەوە، نەک هەناو، نەک دڵ، پێستی خێزانەکەی لە گەنمییەوە کردە ڕەش.

ئێستاش لەدوای ئەو هەموو ساڵە کە بەڕاستی مریەم قژی درێژ و پەلک و گەنمڕەنگی و نازی بابی غازیی کوورەچی بەتەواوی لەبیر چۆتەوە، بکوژی مێشی سەوزی بیر نایەتەوە، ئێستاش کە مریەم بە ڕووی بەڵقیسدا پێکەنی شیرین بوو، شیرینی لە دەموچاوی ژندا تاکە شتە کە تەمەن ناتوانێ لێی بستێنێ. پێکەنینەکەی جوان و شیرین بوو. ئەو سلێمانییانە هەر وان ژنێک تۆزێک ئەسمەر بێ، بەڕەشی دەبینن وەک ئەوەی بۆ خۆیان لە پەڕی کاغەز دروست کرابن، مریەم نازانێ سلێمانی وێران بێ بەسەر ژنی ڕەش و دەنگ پیاوانەدا وێران دەبێ. ئەوان نازانن هەر سروشتیان وایە، نازانن ژنی ئەسمەر، ژنی ڕەش دڵێکی چەند سپی و ڕۆحێکی چەند خوێنین و هەستێکی چەند گەرم و جووتەمەمکێکی چەند ئاگرینیان هەیە. ئەوان نازانن کە لەزەت، لەزەتی ڕاستەقینە، ئەو لەزەتەی پێی دەخاتە قووڵاییتەوە لای ئەو ژنانەیە کە پێستیان وەک شەوەزەنگە. بەڵقیسیش جوانی مریەمی دیت، ئا، ئەو پیاو نییە جوانی ژن نابینێ لە پێستدا نەبێ. بەڵقیس جوانیی مریەمی دیت و بۆ خەمی چاوەکانیشی سووتا، جامە ئاوەکەی لێ وەر گرت، دەبوو وەری گرێ، زمانی وشک بووبوو، قومێکی خواردەوە قومێکی دیکەش. گوڵنار ئەو کچەی بابی ئەوەندەی هاوڕێ لەسێدارەدراوەکەی خۆش دەویست، ئەو کچە ڕەنگ زەردە ماتەی تاوێک پێشتر نەمابوو، مەیتێک بوو بۆ خۆی، ناحەقیشی نەبوو، کچێک بەو منداڵییەی گوێی

لەو شەلاقانە بووبێ، کە لە بابی دەدران، حەتمەن نەک زەرد، بەڵکو دەبێتە زەعفەرانیش. ژنان بوغزێکیان بەرامبەر یەکتر هەیە ئەگەر یەکتر بناسن، دەنا دۆست و ئازیزی یەکترن. سێ مێینەی سەربانەکە، ئەوان یەکتریان نەدەناسی، ئەوەش درۆ، یەکتریان دەناسی و چاکیش. مریەم دەیزانی سەردەمی پاشایەتی بووایە بەڵقیس شاژنی سەبەئ بوو، ئەو دەیزانی سەردەمێک شاژنی سلێمانی بووە، سەروەر باسی کردبوو، هەموو شتێکی بە تامی خەسووەوە بۆ دایکی باس کردبوو، گوتبووی کە دایکی نیان شووی کردووە، نیوەی سلێمانی داوەتی شاییەکەی بوون، مەڵکەندی تا ئەمڕۆش پلاوێکی وەک ئەوەی ڕۆژی بووکێنییەکەی ئەوی بە خۆیەوە نەدیوە. حافز و هەزارەکانی مزگەوتی گەورە بۆ سێ ڕۆژ برسیەتییان لەبیر چۆتەوە، ژنە چێشتلێنەرەکانی سلێمانی تا ئێستاش بە پلاوی دانسقە و تایبەت دەڵێن پلاوی بەڵقیس. مریەم دەیزانی ئەو ژنە شەپرزەیە دایکی پێنج کوڕ و تاقە کچێکی وەک گوڵە، مریەم نەیدەگوت تاقە کچێکی وەک گوڵ لە دڵی خۆیشیدا، خۆی بە خەسووی دەزانی، ئاخر ژنی کورد کە بووک دێتە ماڵەکەی بزمارێک، ئەوەندەی بزماری کەوش، لە بنی پێی دەدرێ، هەر کاتێک هەڵدەستێتە پێ، بەر ئێسقانی دەکەوێت و هەست بە ئازار دەکات. با خۆشیشی بوێ، ئەو بزمارە یادگارە بۆ کاتی پێویست هەر دەمێنێتەوە.

مریەم نەیدەوێرا بیر لە کەمال و کوڕەکانی بکاتەوە، ئەوەتا ئاگرێکیان تۆزێک پێشتر خەریک بوو نیوەی هەولێر بسووتێنێ.

بەڵقیسیش ئەوانی دەناسی، پرسیاری دنیای کردبوو،

ئەو ڕۆژەی نیان تەلەفۆنی بۆ کرد، ئەو ڕۆژە نیان پێی لە جەرگی خۆی نا، لە بەغدا چووبووە بەریدی ناوەندی شار، ویستبووی بەئارامی باسی دڵی بۆ دایکی بکات، پشتوپەنایەک بۆ دڵە وێرانەکەی پەیدا بکات، قسەشی لەگەڵ کرد، بەڵقیس پرسی بووی، "ئەوە دوو مانگە نەهاتوویەوە، برادەرەکانت سێ جار هاتنەوە، قوربانی ئەو دەنگە سەوزەت بم.

نیان بە دڵە شەق شەقەکەیەوە، وەڵامی دابۆوە، "دایکە گیان، بەساقەی دڵە جوانەکەو بم، بەساقەی شوێن پێڵاوەکانو بم، باوکم، کاکە مەحمووم، کاکەمستەفام، ئازادی جەرگ و دڵم... دایە سەد جار هەموویانم بۆ ماچ بکە..."

بەڵقیس گوتی، "شیرین گوڵەکەم، بۆ خۆت وەرەوە، هەموویان سوێیان بۆت بۆتەوە..."

"خەریکە تەواو دەبین، زۆرمان نەماوە، پێش تاقیکردنەوەکان مۆڵەتمان ئەیەن، ئا چەند ڕۆژێک مۆڵەتمان ئەیەن. یەمەوە، دایکە نوقڵەکەم، یەمەوە، ئای چەند بیرتان ئەکەم."

دەنگێک لە تەنیشتیەوە چرپەی دەهات، دەیگوت، "پێی بڵێ، پێی بڵێ... با هەموو شتێک بزانێ"

پێی گوت، دەنگی نزم و تەنک کردەوە، وەک ئەوەی ئەو دنیایە ژاوەژاو بکات و نەهێڵن دایکی تێی بگات، وەک ئەوەی دایکی بەرێتە پەنایەکەوە، وەک ئەوەی لە قەرەباڵغی هەموو دنیا جیای بکاتەوە، گوتی، "دایکە بەساقەو بم، دایکە گیان، دڵەکەم بەس تۆم هەیە بەس، گوێم لێ بگرە، ئەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، شتێکی زۆر گرینگ، بۆ من زۆر گرینگ..."

"دایکە بەساقەو بێ چاوشووشە، هیچم پێ مەڵێ، تۆ

بەس منت نییە کچەکەم، نیوەی ئەو شارە خزم و کەسی تۆیە، تۆ وەرەوە، وەرەوە و ئەوسا هەموو شتێکم پێ بڵێ."

بەڵقیس بەرگەی ئەو شتەی نەگرت، کە نیان خەریک بوو پێی بڵێ، ئاخر بەڵێنیان وا نەبوو بڕیاری ژیانی لە تەلەفۆنێکی نایلۆنەوە بدرێ، بڕیارێک لە بەغداوە بدرێ و بە چۆڵی قوڵفەدا بێ، جگە لە سووتانی دڵی دایکی هیچی دیکەی پێ ناکرێ، کردیشی، سووتاندیشی، گڕێکی چل قات لە هیی دۆزەخی گەرمتر لە دڵی بەڵقیس بەردا، بەڵقیس زۆری گوت نەیلێ، بەڵام ئەو هەر گوتی، کسپە لە دڵیەوە هات، "نازانم ئەو کچە ماخۆلانێیکەوتووە، گوتی،

'ناوی سەروەرە،ماڵیان لە هەولێرە، لای تانکی ئاوەکەی سەیداوا، کۆڵانی بەرامبەر، لای ڕاست، چوارەم دەرگا... تۆ هیچ مەکە، ئەوان دێن بۆلات، هیچ نەبووە، هەر ویستم بزانی...' زۆری دیکەشی گوت."

ئەو نەیویست، هەر نەشیویست هیچ ببیستێ، کچێکی ناردۆتە بەغدا وەک کاکڵی گوێز، وەک لۆکەی ناو قۆزاخە، وەک هەنگی بەئاگانەهاتووی ناو شانەی هەنگوین. بەڵقیس دواتر زۆر گلەیی لە خۆی کرد، لە عاقڵە پڕ دەردەسەریەکەی خۆی، لە عاقڵە ڕەش و تاریکەکەی خۆی، هەمیشە خراپ دەبینێ، ئەو هەمیشە وا بیر دەکاتەوە کەسێکی کوژراوە، کەسێکی لە مەترسیدایە، کەمال یەک خولەک دوا کەوێ وا دەزانێ ئەمن گرتوویەتی، وا دەزانێ کارەساتێک ڕووی داوە، کوڕێکی درەنگ بێتەوە گرتن و زیندان و هەڵواسین و مردن دێتە بەرچاوی. لۆمەی خۆی کرد، وا نەبووە ئەو کچە گوتی هیچ نەبووە، ئەو جارەش هەر وا، کەسێک، برادەرێک،

بە دۆستایەتی لەگەڵی هاتووە بۆ ئەوەی تەلەفۆن بکات، یارمەتیی داوە، کچێک چۆن بتوانێ لەو بەغدا جەنجاڵە بەتەنها بە شەقامی ڕەشیددا سەر بکەوێ، دەبێ هاوڕێیەکی لەگەڵ بێ، بەڵقیس بۆ دڵخۆشی خۆی گوتی، هەڵبەت برادەرێکی کچیشیان لەگەڵ بووە، بەلام هەر بۆ سوپاسگوزاری ناوی ئەو کوڕەی هێنا.

بەڵقیس سەردەمێکە دڵی لە دەستیایەتی، ئێستا بەرامبەر مریەم وەستاوە، مریەم بە بێدەنگییەکی ترسناکەوە، بە دەموچاوێکی بێئامازەی وشکەوە دەڕوانێ، ئاخر ئەو ژنە جگە لە وشەی تۆقێنەر هیچی دیکەی نەکراوەتە هەناوەوە. بەڵقیس قومێکی دیکەشی لە ئاوەکە خواردەوە، زمانی وشک ببوو، لە کۆتری سەر هێلکەکان وشکتر، ئەو نەیدەزانی نەخۆشیی شەکرەکەشی کاری ئەو ترس و تۆقینەیە بەرۆکی گرتووە، ئەو لەکوێ بزانێ جەستە هەر چی بخوات و بخواتەوە نەخۆشی ناکات، وەک بەشێک لە سروشت تێکەڵی دەبێ، ئەوە ترسە، ئەوە زراوچوونە هاوسەنگی جەستە تێک دەدات و ئەندامەکانی لەکار دەخات، پەنکریاسیش ئەندامە خۆبەخشەکەی جەستە، لە ترسدا ڕادەچڵەکێت و جا دەبورێتەوە، لەو کاتەدا خوێنی بەڵقیس پڕپڕ دەبێ لە کاربۆهیدرات و شەکر. ئەو کاتە زمانی وشک و ئاگراوی دەبێت و چاوی تەڵخ دادێ و زۆر جاریش تەواو تاریک دەبێ، ئاگای لە خۆی نامێنێ.

ئێستاش بەرامبەر مریەم زمانی وشک بووە، بەلام چاوی تاریک دانەهات، بۆ چرکەیەک چاوی نووقاند و هەستی کۆ کردەوە و گوتی، "ژنە ڕەشە، درۆ ناکەم هەرگیز ئێوەم

خۆش ناوێ، ناوتان و ماڵتان و خوێن و ئاوتانم خۆش ناوێ، هەر هیچ، بەڵام وەک دایکێک ڕاستگۆ بە، وەک دایکێک دڵت بە دایکێکی ئەتککراو و بریندار بسووتێ، من دوای کچەکەم کەوتووم کوا کچەکەم لەکوێیە؟"

مریەم تەنها بەو پرسیارە وشک دەبوو، زمانی لەگۆ دەکەوت و هیچی بیر نەدەما، دیسانەوە بەڵقیس پرسیی، "خوشکەکەم، وەک دوژمن سەیرم مەکە، لەکوێتان شاردۆتەوە، بۆنی ئەکەم، لەوەتەی هاتوومە هەولێر بۆنی کچەکەم ئەکەم. بۆنی گوڵە زەردەکەی ئەکەم."

مریەم دەیویست هەرگیز ئەو هێلکانەی هەڵنەهێنابا، ماڵیان هەر لەسەر ئەو قەڵاتە بایە کە دێو نەیدەتوانی پێیدا سەر کەوێ، کە جندۆکە ماڵەکەی ئەوانی پێ نەدەدیترایەوە، ماڵیان لە گەڕەکی سەرای بوو، ئاغالار کوچەسی، کۆڵانە داخراوەکە، ئێواران شنەبایەک بۆنی گوڵە کێوییە زەردەکانی بە کونوقوژبنی ماڵەکەیاندا بڵاو دەکردەوە، خۆر بەڕەنگێکی سوور یاخود پرتەقاڵییەکی تۆخەوە، هێواش هێواش هەر لەبەر خاتری ئەو، هێواش هێواش ئاوابوونی خۆی دوا دەخست.

دوو شت لە ماڵەکەی سەر قەڵاتیان لە ناخ و دەماخیدا هەڵکەندراون وێنەی ئەو خۆرە سوورە تۆخە بە ئاسمانێکی سپیی ئێوارانەوە، لەگەڵ بۆنی ئەو گوڵە زەردانەیبابە خۆیان و تۆزێکی وردی هەڵاڵەوە دەیهێنان. یەکەم وێنەی لەدەست چوو کاتێک ژنێکی عەرەبی ڕەشپۆش کە بۆ سۆراغی کوڕەکەی هاتبوو، لەو چیاوچۆڵانە دیار نەمابوو، ئەو ئێوارەیەی خۆری بەو ڕەنگ و سامەوە دیت، گوتی،

"خۆرەکەی ئێوە خوێنی لێ دەڕژێ، دەڵێی سەری حوسێنی شەهیدە لەسەر سینیی ئاسمان بۆ قاپیی خودای دەبەن."
لەو ڕۆژەوە مریەم ئەو وێنەیەی لە بەرچاو شێوا و حەزی نەدەکرد بەرامبەری بووەستێ، تەنها بۆنی هەلالەی گوڵە زەردەکانی لە مێشکدا مابوو، ئەمڕۆش کە ئەو ژنە سلێمانییە گوتی، "من بۆنی کچەکەم، بۆنی گوڵە زەردەکەی دەکەم." دووبارە دوای ئەو ماوە دوورودرێژە بۆنی گوڵە زەردەکانی دامێنی قەلاتێی هاتەوە بەر زەین، کە هیچ حەوسەڵەی ئەوەی نەبوو بیر لە یادەوەری شیرین بکاتەوە لە ڕۆژێکی وا تاڵدا.

ڕوانییە بەڵقیس، زمانی وشک و سپیی ئەو ژنە ڕێبوارە ترساندی، گوتی، "نامەوێ دڵت بشکێنم، دەمەوێ ئەوەی دەیزانم هەموویت پێ بڵێم."

بەڵقیس دڵی شکابوو، وەک ئەو شووشە فانۆسەی لە کارتۆنەکەیدا شکابێ پێش ئەوەی دەر بهێندرێ و ڕووناکی لێی دابێ.

جارێک ئەو قسەیەی بە کەمال گوتبوو، پێی گوتبوو، نەتانهێشت دڵم بە کەس بکرێتەوە، نەتانهێشت، ڕووناکی ببینێ، بە مۆری خۆیەوە سەد لەتتان کرد. ئەو کاتیش قسەکانیان لەسەر نیان بوو. کەمال گوتبووی، "هەر چۆنێ بێ، شووشەفانۆس دەبێ بە ڕووناکی بشکێ، ڕووناکییەک کە ئەو شووشە تەنکەی دڵی تۆ بەرگەی ناگرێ. تۆش دڵێکی سەیرت هەیە."

بەڵقیس ویستبووی بۆی ڕاست بکاتەوە، بۆی ڕاست بکاتەوە و بڵێ، شووشەی تەنک بە ڕووناکی ناشکێ، کاری شووشەی تەنک پاراستنی ڕووناکییەکەیە، شووشەی ئەستوور

وەک پێستی پیاو ئەستوور، بە ڕووناکی شەق دەبا. فانۆس سەروکاری لەگەڵ شووشەی تەنک هەیە، دڵی ژن لەگەڵ کچ. بەلام قسەکردن لەگەڵ پیاو شەقهەڵدانە لە زیخ.

بەوی نەگوت، بە مریەمی نەگوت بیشکێنە، تا دەتوانی وردی بکە، بەرگەگرتنی دڵێکی شکاو لە سینگدا وەک بەرگەگرتنی ڕومانەیەک وایە لە مستدا. نا بە مریەمی نەگوت، وردکردن لەسەر تۆ، ئازارکێشانیش لەسەر من، نا، تەنها گوتی، "تۆ باسی دڵ مەکە، ئێوە نازانن دڵ چییە، پێم بڵێ، کچەکەمتان چی لێ کردووە، کچەکەم لەکوێیە؟"

مریەم وەک مەیموونێک، بەزیقەیەک گوتی، "شەڕ لە من لا بدە."

ویستی بڵێ، هەواڵی کچە بەڕەڵلاکەی خۆت بۆ لە من دەپرسی نەیگوت ئاخر قوولاییی برینی ئەو ورچە هاربووەی دیبوو. بەهێمنی گوتی، "خوشکەکەم، تۆ بۆ ماڵێکی هەڵە هاتووی، نازانم باسی چی دەکەی، من ئەو تاقە کوڕەم هەیە، سالار، ئەویش کۆترەکان بە برا و کەروێشکەکان بە ئامۆزای خۆی دەزانی."

بەڵقیس گوتی، "نامەوێ بەدرۆت بخەمەوە، نامەوێ بڵێم درۆ دەکەی، نا نامەوێ سووکت بکەم، خۆت قسە بکە، لەکوێت شاردوونەوە؟"

مریەم ساردتر، گوتی، "هەر ئەوەی کە گوتم، بڕۆ شەڕمان لێ لا بدە، لە شوێنێکی دیکە بۆ کچەکەت بگەڕێ."

بەڵقیس هەردوو شانی مریەمی گرت و گوتی، "سەیری چاوم بکە، ڕاست سەیری چاوم بکە تا نەتوانی درۆ بکەی."

لەگەڵ ئەو قسەیە وێنەکەی لە ژوورەکەدا دیبوویەوە

لـە بـەر بەرۆکـی دەر هێنـا، گوتـی، "ئـەی ئـەو وێنەیـە، ئـەو وێنەیەی نیانـی کچم چـی دەکات لـە ماڵەکەی تـۆدا، ئەوە کورە نەفرەتییەکەتـە، باشـترە بـە مـن بڵێـی، کوڕەکـەت لەکوێیـە.؟"

# ٥

ئەو ڕۆژەی سەروەر وێنەکەی لەگەڵ نیان گرت، نارەحەت و غەمگین بوو، بۆچی ئەو وێنەیەی گرت، ئەو هەرگیز حەزی نەدەکرد وێنە بگرێت. دەموچاوی قوپاو و کونج کونج و ڕەشی زیندانێک بوو هەمیشە لەگەڵیدا. زیندانێک کلیل و دەرگاوانی خۆی بوو، ئەو دەردی خۆی بە ڕووەوە بوو. کەسێک هەست بە ناشیرینیی ڕوخساری خۆی بکات، هەرگیز دڵخۆش نابێ، کە بشزانێ دەوروبەرەکەی تەنها ئەوەیان بەلاوە گرینگە، نەک حەز ناکات وێنە بگرێ، حەزیش ناکات دەر کەوێ. ئەوە قسەی دڵی بوو، ناشیرینی هەمیشە وەک سێبەری ئیزرائیل بەدوایەوە بووە، تەنها کە بیانزانیبا گوێی لێیە دەیانگوت، "جوانی بۆ پیاو نەهاتووە، بۆ پیاو جوانیی ڕەوشت و کەسایەتییەکەیەتی." بەڵام درۆ لە کاتەکانی دیکەدا هەمیشە ستایشی ئەو پیاوانەیان دەکرد، کە جوانن و ئاخ و ئۆفیان بۆ هەڵدەکێشان. ڕاستیش دەکەن کە سەیری نەینۆک دەکەی ئەو کتێب و زانیارییانە نایەنە پێش

چاوت کە خوێندوتنەوە، نا لووتێکی خوار و دەموچاوێکی کونکون بە ژەهری نەخۆشی و سوورێژە. سەرەوەر تا ئێستا کە تەمەنی بیستوسێ ساڵە، لە دڵەوە سەیری نەینۆکی نەکردووە، هەر کە سەیری بکات ڕاست چاوی دەچێتە سەر چاڵەکەی لای چەپی ڕوومەتی، پێنج چاڵی ئاوا وەک پیرێژنی ڕەشپۆش پێکەوە سەریان بەیەکەوە ناوە و هەرگیز نیازی ڕۆیشتنیان نییە. خووی دابووە کتێب، کتێب تاکە ئاوێنە بوو کە ڕوخساری نیشان نەدەدا، ئەو نووسەرە ڕوسەی ژیانی خۆی بە قومار دۆڕاند، لە خوێن زیاتر ئاوی دەمارەکانی دڵی سەروەری دەدا. هەستی دەکرد بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی ئەو و چەند نووسەرێکی دیکە لەسەر دنیا ماوە. ڕستەیەکی ئەلبێرت کامۆش سەنتەری بیرکرنەوەی بوو "خۆکوشتن برەودانە بە بێهودەیی." خۆکوشتن تاکە بابەتی دڵی بوو، ئەو لەوانە نەبوو ژیان و مردن وەک یەک ببینێ، نا، ئەو هیچ پێناسێکی بۆ ژیان نەبوو، بەڵام دەیزانی مردن ئارامییەکی لەبننەهاتووە. مردن تاکە (بوونە) کە ژاوە ژاوی دنیا ناتوانێ بیجووڵێنێ. بێئومێدی بۆ ئەو شتێک نەبوو لە دەرەوە یان لە خوێندنەوەوە هاتبێتە ناوی، نا بێئومێدی لە ناخیەوە هاتبووە دەرێ، کە دەشی دی ئەو کوڕە ناسک و لووسکانەش باسی مردن و نائومێدی دەکەن کە لە کتێبەوە فێری ببوون، شەرمی دەکرد، بۆ کوڕە قۆز و جوانەکانیش، ئەوانەی بێ کێشە ڕیشیان دەتاشن، بێشەرم دەست بە ڕوومەتیاندا دێنن، مووس بەبێ گرێ ڕوومەتیان ساف دەکات، دەبێ نائومێدی لە چ خاڵێکی بۆگەنی دڵیانەوە دزەی کردبێ. سەروەر هەر کاتێک هەر کاتێک ڕیشە نارێک و پنچک پنچکەکەی ئەتاشێ،

تەشتێکی خوێن لە بەر دەڕوا، تا ئێستا بەئاسوودەیی ڕیشی نەتاشیوە، وەک دز ڕیشی تاشیوە، حەز ناکات کەسی بەسەردا بێت و سەرسام بێ لەو هەموو خوێنەی لە بەری دەڕوا.

ئەو جارەش، کە نیوەشەو، ویستی لە نائاگاییی قوتابییەکانی دیکەدا ڕیشی بتاشێ. حەیدەر، کوڕە نەجەفییەکە بەسەردا هات و ئەو هەموو خوێنەی دیت، خێرا هاواری لە برادەرەکانی کرد، "گوموا کاکە ینتحر." زۆر باشە، خۆکوشتن زۆر باشە، بەڵام کوا ئەو ئازایەتییەی هەیە. هەشیەتی، شتێک وەک بەڵێن، شتێکی نادیار لەناو ژیانەوە بانگی دەکرد، نادیار و لێڵ بوو، دەشێ مریەمەڕەشیش بووبێ، بەڵام ئەوەی لە مردنەوە بانگی دەکرد سەنگینتر و ئارامتر بوو، گەرچی ترسناکیش بوو. ئەویش زۆر پەلەی نەبوو، جارێ هەر وا بێمەبەست چاوەڕێ بوو، هەفتە هەبوو دوو سەموونی دەخوارد، لەژێر بەتانییەکەی هەستی بە مردن دەکرد کە لە پەنایەتی، نەیتوانیوە سڵاوی لێ بکات، دەستی بۆ نەجووڵاوە، خۆ مردنیش ناخۆشی کردووە، مەراسیمی هاتنی لە هاتنی ژیان سەخت و ئاڵۆزترە. خۆ سەرووەریش لە ئاڵۆزی ژیان ڕادەکات.

ئەو ڕۆژەش نەیزانی سەردار چۆن ڕای کێشایە لای خۆیەوە، ئەو کچە شووشەیەش بە قسەی سەردار هات، یەکسەر هاتە نێوانیان، دەیویست خۆی گێل بکات وێنەکەش وەر نەگرێتەوە، نا حەزی نەکرد سەیری خۆی بکاتەوە. کە ئەبو سەباح وێنەگرە بێدەنگ و ئامێریەکەی ئاداب بانگی کرد، وەستا، بەس ئاوڕی نەدایەوە، نەیزانی ئەو پیاوە بێدەنگە لەگەڵ کامێراکەی لە دڵیشەوە وێنەی مشتەریەکانی دەگرێ

و دواتـر دەیانناسـیتەوە، گوتیـان، "لەگـەڵ تۆیەتـی." وێنەکـەی وەر گرتـەوە و خسـتیە گیرفانـی. گیرفانـی چەپـی خەریـک بـوو گـڕ بگـرێ، دەیـدی چاکەتەکـەی خەریکـە بفـڕێ. دوور کەوتـەوە، دوور دوور، لـە پەنایـەک کورسـییەکی دیت، ویسـتی خـۆی بشـاریتەوە دانیشـت، بەئاسـتەم وێنەکـەی هێنایـە دەرێ، ترسـا کەسـێک پەیـدا بـێ و بڵـێ، "کـوا بزانـم جوانە؟"ڕێـک لـە دەموچـاوە چرچ و قوپاوەکـەی، لـە چاڵـە ڕەشـەکەی لای چەپـی بڕوانـێ. چـاوە سـەوز و شووشـەییەکانی نیـان سـەرنجیان ڕاکێشـا، یەکـەم جـارە چـاوی ناکەوێتـە سـەر خـۆی، سـەر ڕوخسـاری پڕمەینەتـی، جـا بەچـی؟ دەترسـا ئـەو کچـە کـە وەک ئـاو هەسـتاوەتە سـەر پـێ، وێنەکـەی خـۆی وەر دەگرێتـەوە ئـەو ببینـێ، تەماشـای زامەکانـی ئـەو بـکات، ڕێـک ئـەو هەمـوو برینـە.

واش نەبـوو، کـە نیـان وێنەکـەی وەر گرتـەوە، سـەیری سـەروەری نەکـرد، چـاوی بەلایـدا نەچـوو، تەماشـایەکی سـەرداری کـرد، سـەرنجی دایـە بێباکـی و ئاڵۆزیەکەشـی. نازانـێ، نازانـێ ئـەو کوڕە چیـی دەوێت. ئـەو سـالارەش سـەیرە، ڕۆژێـک عاشـقت دەبـێ، هـەر لـە بەیانییـەوە بـە تـووەی دەگـرێ، "بـۆ زوو نەهاتـی، دەمێکـە چاوەڕێتـم." تـۆش قسـە ناکـەی، "ئـەوە یەخـەی کراسـەکەت بـۆ چڵکنـە، تـو خـوا بمدەیـە بـا ئەوشـەو بۆتـی بشـۆم،" هـەر بۆخۆیشـی، "ماسـی چوزانـێ لـە سـکیدا مـرواری هەیـە، بۆنـی چڵکـی کـچ لـە بۆنـی مسـک خۆشـترە." نیـان بـەزەردە و تەوسـێکەوە تەماشـای دەکات، ئـەو دەڵـێ، "دەی بـا بڕۆیـن، بـۆ شـوێنێکی دیکـە، تۆزێـک ئـارام، ئێـرە زۆر قەرەباڵغـە."

جـارێ دوو وانەیـان مابـوو، گوێـی نادەنـێ، لـە کۆلێژەکەیـان

دێنە دەرێ، بەلای چەپدا، بۆ ژێر پردەکەی بابولموعەزەم، تۆزێک پێشتر، "جگەرفرۆشێک پێ دەزانم." دەچن، بەپێکەنینەوە، لەوێ جگەر دەخۆن، زۆر جاری دیکەش لەوێ جگەر دەخۆن، ڕۆژ هەبوو پشکە جگەری بە دەمی نیانەوە دەکرد، نیان ددانەکانی سپی، تۆزێک پان، ناو دەمێکی ئاڵ ئاڵ، هەر ئەوە نەبوو لە بەردەم ئەو دوکانە ماچی نەکات. پیرەپیاو و پیرێژنی ڕێک پۆشی بەغدا لە دوکانەکانی لای ڕاست و چەپیان لیمۆ، پرتەقاڵ، خەیار و پیاز و تەماتە و سێو و ئەسفەرلووشیان دەکڕی، جارجار بۆ ئەوانیشیان دەڕوانی لە وەختێکدا ژنە هەرمێیەکی بە دەستەوەیە، سەیری پیرەپیاوە خەسیوەکەی مێردی دەکرد و پێشدەکەنی، پیاوەکەش پێدەکەنی و دەیگوت ئای زەمان.

نیان چەندین جار حەزی کردووە ئەو هەتیوە حیزە ماچی بکات، حەزی کردووە ئەو سەرسەرییە لەوبەر دوکانە لەپڕتاو ماچی بکات و هەندێ گەندە تف لەسەر لێویشی جێ بهێلێ، نا، وانا، حەزی کردووە ئەو هەتیوچە لادێییە ماچی بکات و دەمی پڕ بکات لە لیک و ژنە پان و کورت و سەرزل و ڕەشپۆشەکان کە لەوەتەی هەن ماچی لێوی مێردەکانیشیان نەکردووە، با ئەوەندەی دەکرێ بەخیلیان پێ بەرن و تفیشیان لێ بکەن. بەڵام کوا، ئەو سەرسەرییە کوا جورئەتی ئەوەی هەیە؟ نیان هەرگیز لەبیری ناچێتەوە، چەند جارێکی دیکە چوون و دانیشتوون، ئەو هەتیوە زۆڵە دەستی بەئاستەم هێنا، گوایە یەخەی کراسەکەی بۆ ڕێک دەکاتەوە، گوایە تۆزی سەر چاکەتەکەی دەتەکێنێ، جارێکیان سەری ئەوەندە نزیک کردەوە، جارێک و جارێکی دیکەش هەستی

بە هەناسەی کردووە، کە بەر سمێڵە زەردە هەنگوینی و سەگییەکەی دەکەوت، مووە باریکەکانی تۆزێک دەلەرینەوە، ئەویش، نیانیش تۆزێک سەری بردبووە پێشێ، گوایە سەیری یەخەی خۆی دەکات، ئەویش هەر بەدیڵەسەگی، ئەو هەناسە گەرمانەی، کە گەرمیی جگەرە برژاوەکەشیان کەوتبووە سەر بەر لێوی سەرەوەی نیان کەوتبوو، هەناسەیەک وەک دووکەڵی خڕی تریاک بەر لێوە ناسک و پەمەییەکانی نیان کەوتبوو، وەک ماین، وەک ماینی بەحری بە فاڵی خستبوو، بەلام کوا کچەکوردێکی ترساو جورئەتی ماینی بەحری هەیە، شەپۆل ببڕێ، ئەو هەموو خوێنە بێهودە ڕژابووە لێوەکانیەوە، ئومێدی ئەو هەموو لافاوە خوێنەی سەر لێوەکانی نیانی تەنها و تەنها و تەنها جێ هێشتبوو. بەلام نا، ئەو هەتیوە زۆڵە خۆی تێک نەدابوو، گوایە ڕێکەوتە، گوایە بەڕێکەوت ئەوەندە لێک نزیک بوونەوە، ئاگای لە خوێن و هەناسە نییە، سەری بردبووە دواوە، سەری سووڕاندبوو، گوتبووی،

"گەرم، گەرم، چایەکی گەرم و تۆخ و شیرینی بەغدابیانەش بانگ دەکەم."

ئەو هەتیوە حیزە، ئەو سەرداره سەر سووکە، ئەو لادێییە پووچە، لەگەڵ چایە بەغدابییە شیرین و تۆخەکە جگەرەیەکیش دەکێشێ، وەرە کچ، هەر لەوێ لە بەر دوکانەکە، لەسەر تەپلەکێکی لەق. وەرە نیان دڵی بەورت نەبێت و بەرگەی ئەو لێو و دووکەڵە بگری. نیانی عەیار و سیحربازیش لەو سەگتر، دەیگوت، "من حەزناکەم، لێرە لە بەرچاوی ئەو خەڵکە جگەرە بکێشم، جارجار دووکەڵەکەت لەلای من بکە، سەبوریم بە بۆنی نیکۆتین دێ." ئەویش خۆ

بەشـەر نەبوو، یەکـەم جـار نـا، دووەم جاریش، سـێیەم جـار گوپـی پـڕ دەکـرد لـە دووکـەڵ، بـە بازنـەی بچـووک بچـووک، ڕووەو نیانـی دەنـارد، ئـەو دووکەڵـە سـپییە شـەهوەتبازەش، لـە سـەردار پیاوتـر، گەرمتر، بەوەفاتر، دڵاوێنتر، وەک دۆست و ئاشـنا، دەچـووە کونـە لووتـە بچـووک و تەنکەکانـی نیانـەوە، نیـان دەکۆخـی، پێشـدەکەنی، لـەو بەینـەدا، هـەر وا بەڕێکـەوت و بەهەڵـە، دەسـتی دەخسـتە سـەر ئەژنـۆی سـەردار و ئەویـش وەک ئـەوەی دەسـتی نەنکـی بێـت، تەزوویەکیشـی پێـدا نەدەهـات، دەشـی هاتبێتیـش. ئـەو ڕۆژانـەی ئاسـوودە بووایـە پێی دەگوت، "نیان ئەمڕۆ بەختیارم، بەختیـار و ئاسـوودەم کە لەگـەڵ تـۆم، لەگـەڵ تـۆ بوونیـش کـەم نییـە، مێرگـی بەهەشـت، ئەوانـی دیکـە کێشـەیان زۆرە، مانـدووم دەکـەن." ئـەو قسـانە کەنگـێ بـوون، ئـەو کاتـەی هەتیوەکـەی دەزگیرانـی نیـان ویسـتبووی دەسـتدرێژی بکاتـە سـەر و بەینیـان تێـک چووبـوو، دەسـتدرێژیش نـا، شـتێک وەک ژنومێردایەتـی، نیانیـش تـووڕە ببـوو، زۆر تـووڕە ببـوو، دواتـر ئەوەنـدەی زسـتانێک گریابـوو، ئـەو هەتیـوە بەرگـەی ئـەو لافـاوەی نەگرتبـوو، دەسـتیان لێـک بـەر دابـوو، نیـان بـە سـەرداری گوتبـوو، دەڵـێ، "باشـەوانە خۆمـان بدزینـەوە. بچینـە شـوێنێ." وەک نیان دەیگوت شـوێنی مەترسـیدار. ئەوەشـی گوتبـوو، پێشـتر گوتبـووی، "مـن خۆشـم دەوێ، زۆرم خـۆش دەوێ. بـەڵام هـەر یەکـەم هەفتـە باسـی خۆشەویسـتی و عەشـق و فڕیـن بـە باڵـی هـەور و ڕۆیشـتن بەسـەر تەنافـدا بەپێخاوسـی بـۆ کـردم، ئاخـر مـن شـێتی هـەور و تەنافبـازی و خەیاڵـی عاشـقانەم. تەنهـا هەفتەیـەک عەشـقمان کـرد و بڕایـەوە، ئیدی تەنافی بۆ هەڵخستم، دەیویسـت خۆمـی

بۆ ڕووت کەمەوە، هەمیشە مۆن، بوو ئەو مۆنییەی منی کوشت." سەردار ئەوانەی دەزانی، بۆیە گوتی، "باسی مەکە کوڕی پادشاش مەمنونتە."

هەر ئەو ڕۆژە پڕبەختەوەرییە، ڕۆژی جگەر و بازنە دووکەڵە زۆڵەکان، وەک تازە ڕۆحی فریشتەیەکی چووبێتە دڵەوە، هەر ئەو ڕۆژە سەردار گوتی، "بچینە کەناردیجلە."

چووشن، جاری دیکەش چووبوون، سەیری ماسیگرەکانیان دەکرد، بەلەمی پیس و پۆخڵی گەشتیاری، ماڵە قوڕینەکانی کەنارئاوەکە و ناو قامیشەکان، کوڕ و کچانی عاشقی قاچاغ. ماچکردنی قەدەغە و مەمکگوشینێکی بەپەلە، بێگومان هیی خەڵک. ئەو سەردارە زۆڵ و هیچوپووچە وەک بەرد بێت و وەک فریشتەی سپی و بێگەردی خودا بێت، بە درێژاییی ئەو کەنارە، بڵێی دەستێک بخاتە کەمەری، دەستێکی بگرێ، دەستێکی دۆستایەتییش بێت، هەر بەڕێکەوت جارێک پێک ناکەون. بەڵام هەتاوێک لە سمێڵی دەدات، لە کوڵمە سورەکانی، شاژنی شانەهەنگێک دێتە ناو قسەکانیەوە، قسە ئاڵتوونی و بە ئاو و تاوەکانی، کەچی ئەو شاژنە هەنگەی ناو قسەکانی سەردار جگە لە پێوەدان و چزوو هیچی دیکەی بۆ نیان پێ نییە. لە دڵی خۆیدا دەڵێت، "ئەو هەتیوەش زیرەکە، تاقیم دەکاتەوە، ئەو جارە نا جارێکی دیکە." دڵیشی بەوە خۆش بوو سەردار ڕۆژێک گوتبووی، "لە بەرچاوی کوڕ، کچیش پڕنهێنی و بەهەیبەتیشە، زۆر لە کوڕەکان دەترسێن خۆشەویستیان بۆ کچە دۆستەکانیان دەر ببڕن، نەک ڕازی نەبن و هەناسە و سەبووری برادەرایەتییشیان لەدەست بچێ."

ڕۆژی واش هەیە، نیان شەو خەوی دیوە، لە خەوەکەیدا

قسەیەکی سەرداری پێ گوتووە، قەسەیەکی وەک وەحی پێ گوتووە، "من یوسفم، بەڵام یازدە ئەستێرە نا، مانگێکی شەق شەقیش نا، مانگێکی وەک دەمەداس لەژوور سەرم هەڵاتبوو،" بەیانییەکەی نیان زوو لە خەو هەستابوو، میکیاجێکی تەنک و سادەی کردبوو، چاوەڕێی کاتژمێر هەشتی کردبوو، ئاخر مانگی دەمەداس چاوەڕێی پڕبوونە، ئەوەش تەواوکردنی خۆشەویستییە. یەکسەر هاتبووە کۆلێژ، بەشی زمانی ئینگلیزی، نزیک ئەو پۆلەی سەردار وانەی لێ هەبوو، سەردار وەک ئەوەی عەزابی بدات، درەنگ هات، بەڵام ئەو ساتبەسات ئارامتر بوو. کە هات نیان ئەوەندەی دەموچاوی بەرگە بگرێ زەردەخەنەی بۆ کردبوو، کەچی ئەو هەتیوە زۆڵ و نەفرەتییە لەگەڵ ئەوەش کە دیبووی، هەر لە دوورەوە دیبووی، ڕووی خۆی وەر گێڕابوو، خۆی سەرقاڵی کەسێکی دیکە کردبوو، کە لە قەرەباڵغییەکەی بەیانیدا لەنزیکیەوە دەڕۆیشت، کە نیان پێی وا بوو هەر ناشیناسێ. بە ڕووی نیاندا هەر وا، سادەوساکار پێکەنینێکی نایلۆنی یەک چرکەییی بۆ کردبوو، نە هەڵوێستەی کرد و نەوەستا، ڕاست چووبووە پۆلەکەی خۆی، زەنگی پشووی وانەی یەکەم، دووەم، سێیەمیش نەیدیتەوە، نیان بچۆ یانەی قوتابییان، گۆڕەپانی یاری، باخچەکەی بەشی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، بەشی فەلسەفە و کۆمەڵناسی، چاپچییەکەی ئەودیو، لای فسکەفسکی برادەرە شیوعییەکانی، وەختێک دەزانێ چۆتە سەری ئەو سەری هۆڵی کتێبخانە باریکەکە، لەدەستی ڕاستی دکتۆرە حەیات شەڕارە دانیشتووە، کە هەر بە ناو و نووسینەکانی دەیانناسی، وەک ئامۆزای هاملێت بێ، سەری خستۆتە سەر

کتێبەکـەی، نیـان لـە دووکەڵـی جگـەرەی ئحمێـک دەکات، ئـەو سـەر بـەزر دەکاتـەوە، ئـەو، کـێ؟ کاک ناسـەردار، بەئاسـتەم دەسـتێکی بـۆ دەجووڵێنـێ، دیسـانەوە سـەر شـۆڕ دەکاتـەوە، وەک نەیناسـێ و بەڕێکـەوت چـاوی پێکەوتبـێ، نیـان خەریکـە مێزەکـەی بەسـەردا قڵپ کاتـەوە، نایکات ئاخر ترمۆزە قـاوە و کوپەکـەی دکتـۆرەش بـەر دەبێتـەوە، دەچێتـە دەرێ، ئـەو ڕۆژە هیـچ، نیان سـندانێک لەسـەر سـینگی دەباتـەوە، ژوورە پڕ کـچ و پـڕ بۆنـی عـادەی کچەکانـی هاوڕێـی و ژێـر بەتانییەکـەی، لەژێـر بەتانییەکـەوە دەڵـێ، "هـەر ڕۆژە و دووانیـان عادەیانـە، دێڵەسـەگ هێنـدەی ئێـوە ناترەکـێ،" نیانیـش هـەر هیـچ، لـە بەشیناوخۆییەکەی کچـان بێزار دەبێ، هـەر لـە دوورەوە بۆنـی خوێـن و عادەبوونیـان نیـان بـەر شـەق دەدات، دەیـەوێ دوور بکەوێتـەوە، دووریـش دەکەوێتـەوە، بێـزارە و جەسـتەی گـەرم دادێ، هەسـت بـە گەرمیـی خوێـن دەکات، دڵۆپێـک یـان دووان چۆڕایـەوە سـەر ڕانـی، نـا، بۆنەکـە بەدواوەیەتـی، گەڕایـەوە ژوورەکـەی، میدیـا پێـی گـوت، "سـەردار لێـی دەپرسـی."

بەتووڕەییـەوە سـەیرێکی میدیـای کـرد و گوتـی، "گـوو بـە شـەرەفی هەرچـی سـەردار نـاو هەیـە، مـن ئـەو خوێڕییـە هـەر ناناسـم."

هەفتـەی دواتـر، زیاتـر لـە دە ڕۆژ لـەو کاتـەوەی لە کتێبخانـە دیتبـووی، بینیـی کاک ناسـەردار لەگـەڵ چەنـد کـوڕ و کچێـک لـە چێشـخانەی قوتابییـان نـان دەخـوات و قسـەی گـەورە دەکات و بـە دەمـە بۆگـەن و ددانـە زەردەکانـی پێدەکەنـێ. نیان خـۆی مـۆن دەکات، ئـەو نایبینـێ، نیـان هـەر بـۆ خۆیشـی دەڵـێ جـا بـۆ بمبینـێ، لووتزلـی پێستئەسـتوور. دوای چەنـد ڕۆژی دیکـە

وەختێک بەغەمباری دەچێتە باخچەکەی بەردەم پلیکانەکان، سەردار لەگەڵ کۆمەڵە قوتابییەک وەستاوە، ئەوە یەکێکە لەو ڕۆژانەی بەختەوەری دەچێتە قوونیەوە، خێرا بانگی دەکات و دەڵێ، "ئەوە تۆ لەکوێی شەونمی دڵ، زۆرم بیر دەکردی."

نیان وا خۆی نیشان دەدات کە نەیبیستووە، دەچێتە لایان و سەردار لای خۆی جێگای بۆ دەکاتەوە، قسەی خۆش دەکەن و سەردار دەڵێ، "من کچ بام، هەر بە یەک چاوداگرتن پەنجا کورِم دەکردە کەلاک."

هەمووان پێدەکەنن و کچە کەرکوکییەکەی بەشی فارسی دەڵێ، "قەسابخانەیە."

نیان پێناکەنێ و هێشتا مۆنە. لە وەختێکدا سەردار سەیری نیانی دەکرد دیسان گوتی، "هەیانە بەبێ پێکەنینیش دەمانکاتە کەلاک."

ددانە پانەکانی نیان نەختێک دەر دەکەون.

ئەو ڕۆژەی سەروەر وێنەکەی وەر گرتبۆوە، ئەو ڕۆژە سەردار وا نەبوو، ئەو ڕۆژە بانگی نیانی کرد، "وەرە وێنەکەی دوێنێم بۆ وەر گرتوویەوە."

نیان وێنەکەی لێ وەر گرتوو لایەوە دانیشت، سەیری وێنەکە ناکات، هەر لە داخان بەئاشکرا سەیری وێنەکە ناکات، سەردار پانتۆڵێکی دە لینگ پەنجا سانتیمەتر پانی لەپێیە، باریک و ڕێکە، قژە بژەکەی شتێکە وەک کەپر، سەرنجی ناچێتە سەر سەروەر، هیچ شتێک نییە بەلای ئەودا ڕای کێشێ، تا ئەو کاتەی سەروەر لە دوورەوە دەر دەکەوێ. سەروەر لەو پەنایە دێتەوە کە بەدزییەوە، بەلام بەئارامی سەیری وێنەکەی کردبوو. نیان کە چاوی دەچێتە سەر سەروەر،

جا وێنەکە بەدەستەوە دەگرێت و تەماشای دەکات، خەریکە زراوی لە دەموچاوە کونج کونجەکەی بچێ، سەروەر نەک بۆ خۆی، هەتا وێنەکەی سەر پارچەکاغەزەکەش خەریکە لە شەرمان لە شوێنی خۆی بتوێتەوە. سەردار دەزانێ سەیری سەروەر دەکات، دەڵێ، "ئەو کوڕەش یەکپارچە کابووس و تاریکییە."

ئەو قسەیە سەرنجی نیان ڕادەکێشێ، دەڵێ، "تاریکیی ئینسان مەترسیدارە، ئەوە بۆ خۆیشی هات."

سەروەر دێت و لایان دەوەستێ، ڕووی لەوان نییە، قسەش دەکات، مینگەمینگە و هیچی دیکە، وەک ئەوەی بیەوێ سەرنجیان لەسەر وێنەکەی بەردەستیان لا بەرێ. وێنەکەی ناو گیرفانی چاکەتەکەی خۆیشی قورسە، بەو لایەدا خواری کردووە، سەروەر وا دەزانێ هەر سەر بۆ لایان بسووڕێنێ ئەو کچەی لەوێ دانیشتووە و ناوی نیانە سەیری دەموچاوە کونکونەکەی ئەو دەکات. سەردار پرسیی، "وێنەکەی دوێنێت وەر گرتەوە؟"

ئاخر ئەبوو سەباح هەمیشە هێندەی ژمارەی کەسەکان وێنە دەشواتەوە، هەر کەسە و وێنەیەکی دەداتەوە و پارەی خۆشی لێ وەر دەگرێ. سەروەر پرسیارەکە بەسەر خۆی ناهێنێ و دەڵێ، "من دەڕۆم."

سەردار بەردەوام دەبێت و دەڵێ، "زۆر جوان دەر چووە."

نیان لە کاتێکدا سەیری وێنەکە دەکات دەڵێ، "تۆزێک تاریکە."

سەروەر دەڕوات، سەردار دەڵێ، "شەرمنە، تەریکە، پاریش لەسەر ئەو شەرمە وازی هێنا، ئەوە چەند ساڵی

ڕۆی، برادەرەکانی زانکۆشیان تەواو کردووە."
نیان دەڵێ، "کوڕ و شەرم!"
سەردار دەڵێ، "شەرم سەرمایەی کوڕ بوو، کچ لێی ڕفاند، لەوە گەڕێ، ئەو کوڕە زۆر سەیرە، دەڵێ، 'ئێمە ئاسمان هەڵدەکۆڵین و بە زەویدا دەفڕین،" دەشڵێ، "بەتەمەنێکی پڕەوە دێینەوە سەر دنیا تا تەواوی کەین."
نیان دەپرسێ، "بۆ شێتە؟"
سەردار لەوپەڕی سەرسامیدا گوتی، "شێت! ئەوەندەی تەواوی ئەو قوتابیانەی ئێرە کتێب دەخوێنێتەوە. ئەو پێی وایە، تەواوی تەمەنی خۆی پێیە، منداڵ تەمەنی پڕی پێی دەڵێ، هاتووە لەسەر ئەو چاڵی زەوییە تەواوی کات. هەمیشە دەپرسێ چ سوودێک لەوەدایە تەمەنی پڕی خۆت لێرە تەواو بکەی، منداڵ ئەو تەمەنە پڕەی خۆی لێرە لەسەر ئەو زەوییە تەواو دەکات، وەک مانگی پڕ وایە منداڵ، وردەوردە کەم دەکات تا دەبێتە دەمە داس. وەک چۆن کەسێک بە کیسەباخەڵی پڕەوە دەچێتە قومارخانە، دەشێ شتێک بباتەوە، ، بەڵام سەر زەوی براوەی تێدا نییە، هەر دۆڕانە سەرزەوی."
"تۆش لەو بڕوایەدای؟" نیان پرسیی.
سەردار سەددڵ بوو، شۆڕشگێر بێ و هەمەنگوای بخوێنیەوە، سەددڵیش دەبێ، گوتی، "نا، تەمەن وا ناپێورێ، منداڵ جەستەیەکی پێیە شل و خاو، دنیا ئومێد و زەوی و وزە و عەقڵ و کەسوکار و خۆشەویستیی دەداتێ، ڕۆژ بە ڕۆژ گەشە دەکات، ئەو جەستەیە دەبێ بژی، ڕابکات و پێبکەنێ، خۆشیان بوێت و خۆشی بوێن، پێبگات. ئەوەی ئەو ناوی ناوە دۆڕان ئەوە پێگەیشتنە."

لە هەموو ئەو قسانەیدا، نیان تەنها بەوە سەرسام بوو، کە پێگەیشتن و دۆڕان چەند لێک نزیکن.

زۆر دواتر، ئەو سپێدەیەی پێکەوە لە ئوتێلەکە هاتنە دەر، سەروەر گوتبووی، "دنیا وەک جەلـلاد وایە، جامە ئاوێکت دەداتێ تا ڕۆحت لێ بستێنێ."

بەلاّم ئەو ڕۆژەی لە باخچەکەی ئاداب بوون، نیان لە سەرداری پرسیبوو، "کەواتە تۆ بۆ خۆشبەخت نیت کە دنیا ئەو هەموو شتانەی داویتێ؟"

سەردار خۆی لە وەلاّمدانەوە دزیبۆوە، ئەوەندەی دەکرێ چاوەکانی بچووک کردبۆوە، بۆ پەڵەهەورێکی بچووکی ڕوانیبوو، دیسان نیان پرسیبوویەوە، "تۆ بەختەوەری؟"

سەردار زۆر بەهێمنی گوتی، "نا، نیم."

نیان پرسیبوویەوە، "ئەوە مانای چییە؟ بۆ دنیا ئەوانەی نەداوە بە تۆ؟"

سەردار دیسانەوە سیمائاڵۆزەکەی خۆی دۆزیبۆوە، گوتبووی، "نا، مادام تۆ هەی منیش هەم."

نیان خەریک بوو دیسانەوە دڵخۆش بێ، دیسانەوە ئومێدێک چەکەرە بکا، فریا کەوت و گوتی، "نا ئەوەیان ڕاستترە، من نیم، کەواتە تۆش باوەڕت بە بوونی من نییە."

ئەو نەبوونەی سەردار کاریگەریی گەورەی هەبوو، بەڵێ، "من نیم" لەسەر بیرکردنەوە و باوەڕی سەردار نا، بڵێی سەردار بگۆڕێت و هەست بە وجودی خۆی بکات، نا، شوێنی هەست بە وجودی خۆکردنی سەردار دڵی کچان نییە. بەلاّم ئەو بیرکردنەوەیە کاریگەریی هەبوو، سەردار بەڕاستی ون بێ، قوتابییەکان لە یەکتریان دەپرسی "دیار

نەمـاوە، لەکوێیە؟"هەمـوو شـوێنێکی بـەدوادا گـەڕان، پەنایـان بـۆ برادەرەکانـی ژوورەکـەی بـرد، گوتیـان، "دوێنـێ شـەو نەهاتۆتـەوە."

کەس نایـەوێ ئـەو هەواڵـە بزانێ، "دوێنێ شـەو نەهاتۆتەوە،" تـا لـە بەغـدا نەبیـت و کـورد نەبیـت و سـەردەمی بەعـس نەبـێ و شـەڕی ئێـران و عێـراق نەبـێ، هەسـت بـە قورسـیی ئـەو زەبـرە ناکـەی، "دوێنـێ شـەو نەهاتۆتـەوە،" مانـای چییـە. لەپڕ کۆلێژی ئاداب گۆڕا و تەمێکـی تـرس و خەمبـاری چـووە سـەر ڕوخسـاری قوتابییـە کـوردەکان. چرپەچـرپ و فسکەفسـکە، نیـان میدیـای دیتـەوە، "دەڵێـن سـەردار دیـار نەمـاوە، ڕاسـتە؟"

میدیا گریـا، نیان بـۆ ئـەوەی شـتێکی بـۆ دەر بکـەوێ، گوتـی، "گریانـی بـۆ چییـە؟"

میدیا لەژێـر لێـوەوە گوتـی، "پێـش سـەردار، مەعـن هـاوڕێ بەسـرِاوییەکەی سـەردار، ئـەوەی بەشـی فەلسـەفە، ئەویـش ماوەیـەک پێشـتر ئاوا دیـار نەمـا، ئێسـتا دەڵێن لەسـێدارە دراوە."

بـەو هەواڵـە هەمـوو خوێنـی نیـان ڕژایـە نـاو پێڵاوەکانـی، زەرد زەرد بـوو، وەک بیابـان و زەعفـەران زەرد بـوو، هەسـتی کـرد دەرپێکـەی لـێ دەکـەوێ، "بـۆ چیـی کـردووە؟"

سـەردار جارێـک پێـی گوتبـوو، "مـن لـە مـردن ناترسـێم،" نیـان سەرسـام ببـوو، سـەردار گوتبـووی، "لـە خەیاڵمـدا بـە کارەبـا مردبـووم، نەسـووتابووم، جەسـتەم زەرد زەرد وەک کاسـتەری لـێ هاتبـوو، چـاوم لـە پەنجـە سـەریەککەوتووەکانی پێـی خـۆم بـوو، هیـچ نارەحـەت نەبـووم، کـە مردووشـۆرەکە تەماشـای کـردن و زەردەشـی پێیـان هـات، بـەڵام کـە پەنجـەی خسـتە نێوانیـان تـا خاوێنیـان بکاتـەوە، خەریـک بـوو بدەمە قاقای

پێکەنین، نەمکرد گوتم با مردووشۆرەکە زراوی نەچێ."

نیانیش پێی گوتبوو، "جارێ زراوی من مەبە، لێم بوو بە ڕاست."

دواوێنەی سەردار ئەوە بوو کە لەگەڵ نیان و سەروەر گرتبووی، هەر یەکەو وێنەی خۆی وەر گرتبۆوە، سەردار هەڵی گرتبوو، سەروەر خسبوویە گیرفانی چاکەتە شینەکەی، نیان لە گیرفانی ناوەوەی جانتا سپییەکەی دەستیدا دای نابوو، زووزوو سەیری دەکرد. قەت سەرداری وا بەناسکی نەدیوە. ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر سەرنجی لێوە گۆشتن و دڵیەکەی خوارێی دەدات، بۆ تا ئێستا ئاوا سەیری نەکردووە؟ نازانێ بۆچی پێش ڕۆیشتنەکەی بە ڕێگای هاوڕێ بەسڕاوییەکەیدا، نازانێ بۆچی پێش ڕۆیشتنەکەی ئاوا ورد سەیری ڕوخساری نیگەران و پڕبەرائەت و لەزەتی سەرداری هاوڕێی نەکردووە. نیان باوەڕی وا بوو کە یەکێک دەمرێت یان دەکوژرێت وێنەکانیشی یەکسەر هەست بەوە دەکەن و سیما و ڕەنگیان دەگۆڕیت، با زۆر پێشتریش گیرابن.

هەمووان غەمبار بوون، نیان غەمبارتر. سەروەریش، بەڵام ژیانی ئەو ئەوەندە تاریک بوو، ئیدی جێگایەک نەمابۆوە تاریکییەکی دیکەی بکەوێتە سەر.

چاوەکانی نیانیش کەڵکەڵەی خۆکوشتنی لەسەردا سەوزتر کردبوو، ئەو پێی وا بوو، "ناکرێ بەو سیمایەوە، بەو دڵە تاریکەوە لە دنیایەکی وا سەوزدا بژی." کەچی ونبوونی سەردار، دۆستە ئازیزەکەی، ئومێدێکی وای دابوویە، ئومێدی ناچاری و هەندێ جار خیانەتکارانە، سەروەر شتێکی دیکەی هەبوو کە لە هیچ کەسێکدا نەبوو، ئەوەیش ئەوە بوو کە

دەچووە ناو هەر تونێلێکەوە، بێگومان تونێلی ژیان، ئەوسەری لێ دیار بوو، بەڵام ئەوەی لەوسەر ڕووی دەدا، نەک بۆ هاوڕێکانی، بۆ خۆیشی باس نەدەکرد.

ڕۆژانە، بەیانییان، هەواڵی تازەیان لە یەکتر دەپرسی، سەروەر زۆرتر دەیگوت، "نا هیچ هەواڵێک نییە، شوێنەکەی چۆڵە و کەسیش لێی نەپرسیوە."

ڕۆژێک هەموویان هەواڵێکیان بیست، "چاودێریی برادەرەکانی دەکەن،" کێ ئەوەی گوت، دیار نییە، تۆ بڵێ با، هەر بەخێرایی باش بڵاو بۆوە، "بەرپرس بووە، بەرپرسی قوتابییە یاخییەکان،" مارکسییەکان بەوپەڕی هاشوهوشەوە، "شیوعی بووە،" هەموو گوتیان نا، کوا ڕۆژێک بەیانێکی حیزبی بڵاو نەکردۆتەوە، نهێنییەکی نەبووە. سەروەر بێ ئەوەی سەیری نیان کات. گوتی، "بۆنا، کێ دەزانێ؟ دۆست و برادەری زۆر هەبوو، دەڵێن کە هاتووەتە کۆلێژ لە شوێنەکەی خۆیەوە فایلێکی ئەستووری بەدوادا هاتووە، گوایە هەموویان سوورن. لەگەڵ ئەوەشدا هەر کەسە و سندوقێکی ڕەشی لە سینەدایە."

لە وشەی ڕەش پەشیمان بۆوە، تازە گوتبووی، نیان ترسا، نا، نیگەران بوو، سەروەر گوتی، "تۆ هیچ مەترسە."

نیان شڵەژا. بەسەرسامییەوە، "من!"

سەروەر گوتی، "ئەو بۆ خۆی نا، بابی، براکانی، خوشکەکانی، دایکیشی هەموویان تێوە گلاون، هەموویان سیاسی یاساغن، تۆ چی! تۆ بۆ خوێندن هاتووی."

نیان زیاتر ترسا و زیاتر پەشۆکا، "من، نا، ئەو، بۆچی کەسوکاریشی گیراون؟"

سەروەر گوتی، "باوەڕ ناکەم، بەڵام بابی سەرکردە بووە، مەترسیدارن، ئێستا نا، کاتی خۆی."

نیان چیدیکە بەرگەی نەگرت، هەستا، ڕووی لە سەروەر کرد و گوتی، "ئەبێ بڕۆم من وانەم هەیە."

سەروەر سەر کەوتبوو، بەئازادی لەگەڵ فریشتەیەک دوابوو کە هەر ئێستا لە ئاسمانەوە دابەزیبوو، فریشتەیەک تازە لەدەستی جەللادەکەی ڕزگاری ببوو، لەوەش گرینگتر یەکەم جار بوو بەرامبەر کچێک قسەبکات و خەیاڵی لای ئەوە نەبێ چاڵ و کونجەکانی ڕوومەتی بژمێرێ.

درۆ، نیانیش درۆی کرد، نە وانەی هەبوو، نە هیچ، نەچووە لای پۆلەکانی بەشی ئینگلیزی، ڕێک بەناو باخچەکەدا پەڕییەوە، بە ڕاڕوەکەدا دوور کەوتەوە، چووە لای بەشی مێژوو، سووڕایەوە، بۆ بەردەرگای دەرەوە، بۆ بەشی ناوخۆیی کچان، بۆ ژوورەکەی خۆی، هەر بە جلەوە چووە ژێر جێگایەکەی، دەنگی دڵی خۆی دەبیست، تەپ تەپ بەر قەفەزەی سینگی دەکەوت، چاوی نوقاند و لێوەکانی تەڕ کردن، هەر لەژێر جێگایەکەیەوە دەستی برد و لە پەرداخەکەی، لە دوێنێ شەوەوە لەسەر مێزەکە جێ مابوو، قوومە ئاوێکی خواردەوە، تۆزێک ئارام بۆوە، لە دڵەوە گوتی، "من بۆ؟ من بۆچی بترسم؟ هەمووی چەند جارێک پیاسەمان کردووە، نا، کوڕێکی باش بوو. بەڵێنێکمان لەنێوان بایە، وەک خۆشەویست بۆی غەمباربام، نا ئێستاش شوێنێکی لە دڵمدا هەیە."

هەموو قسەکانی بیری خۆی خستەوە، پێکەنینەکانی، نیگای پڕفێڵ و پڕمەغزاکانی، خۆ ئەو هەر پێدەکەنی، ئەوەشی

بیر کەوتەوە، کە دەیگوت، "من هەموو کچانی ئەو دنیایەم خۆش دەوێن بەوانەی ناو ئەفلام کارتۆنیش." ئەو ڕۆژە میدیا بەسەرسووڕمان و بەبچووکسەیرکردنەوە پرسیبووی، "تۆ؟ تۆ هەموو کچانی دنیات خۆش ئەوێ، هەی نەگبەت؟"

"ئا من، هەموویانم خۆش دەوێن، بەلام کەسیان لە کەسیان زیاتر نا."

پەریخان گوتی، "ئەوەش درۆ و جادو، کچینە باوەڕی پێ مەکەن."

نیان ئەو ڕۆژە پێی گوت، "واز لە هەموو کچانی دنیا بێنە، یەکێکیانت خۆش بوێ."

هەمووان تەماشای نیانیان کرد و بەتەوەسەوە گوتیان، "یەکێکیانی خۆش بوێ، خۆ کەرنی؟

سەردار بێ ئەوەی یەک تۆز گوێ بداتێ یان توورە بێ، گوتی، "ڕاست دەکەن، ئێوە ڕاست دەکەن، باوەڕم پێ مەکەن، بۆ قوربانیدان، بۆ مردن ئا، باوەڕم پێ بکەن، بەلام بۆ عەشق و ئەڤین و ئەو شتە قورسانە نابم، بەکەڵک نایەم."

ئەو ڕۆژەی نیان ترسا و هاتەوە، میدیاش زوو کۆلێژی جێ هێشتبوو، نیان چاوی نووقاند و خۆی لە خەو کرد، "ئەوە چییە؟ دیسان چوویتەوە بن جێ؟ هەستە عەیار دەزانم نەخەوتووی."

نیان هەر بە چاوی نووقاوەوە گوتی، "نا بیر لەو سەردارە دەکەمەوە، کوا باسی سیاسەتی دەکرد؟"

میدیا گوتی، "نا سیاسی بوو."

نیان یەکسەر لە نوێنەکانی هاتە دەرێ و پرسیی، "چۆن؟ چۆن دەزانی؟"

میدیا بەتەوسەوە گوتی، "بۆ تۆ نازانی؟ خۆت گێل مەکە."

نیان تاسا، خەریکە چاوە شووشەیییەکانی بکەونە بەر پێی، میدیا دیسانەوە گوتی، "سیاسی بوو، لە هەموو کوڕەکان سیاسیتر، لەو سەدامەش غەدارتر."

نیان کە دەستی بە خۆگۆڕین کردبوو، وازی لە داکەندنی گۆرەوییەکانی هێنا و گوتی، "تۆ شێتم دەکەی؟ سیاسی و غەداری چی!"

میدیا لەسەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشتبوو، قژە زەردە خاوەکەی شۆڕ ببوەوە سەر کۆشی، سەری بەرز کردەوە و گوتی، "وەرە، وەرە بەردەمم."

نیان چووە بەردەمی، میدیا دەستی برد، لەسەر یەخەی چاکەتەکەی موویەکی زەردی کاڵی کورتی ڕاکێشا...

"غەداری یانی چی؟ هەی ئەهریمەن، سیاسی یانی چی، ئەوەتا مووی ئەو سەردارەیە بە یەخەتەوە، ئەگەر مووی سمێڵیشیت قووت نەدابێ، سەیری لێویشت بکە، ئەوەندەی مژیوە تا ئێستا هەر تەزیون، سپی سپی بوون.

پەریخان هاتبووە ژوورێ، گوێی لە قسەکانیان بوو، میدیا گوتی، "خۆ حاڵی ئەو پەریخانە سمتئەستوورەش لە تۆ چاکتر نەبوو."

پەریخان گوتی، "منی تێکەڵ مەکەن، بۆ خۆتان حەیاتان لێ هەڵگیراوە، بابی من مەلایە، نیوەی ئەو هەولێرە سوێند بە سەری ئەو دەخۆن."

میدیا گوتی، "بە پێچکە ئەستوورەکانت هەموویت دانایەوە، تۆش باش بە با هاتووی."

جا میدیا ڕاستی دەکرد، لووسی و بریقەی پێچکی

پەریخان نەک ئاداب لە هەموو زانکۆی بەغدا دەنگی دابۆوە، دوو ئەوەندەی دڵە لەتەکەی سەربازی ون تەماشاکەری هەبوو. هەمووان دەزانن کورە لادێییەکەی بەشی کۆمەڵناسی هەر ڕۆژێک چاوی بە پەریخان بکەوێ خۆی پیس دەکات.

پەریخان گوتی، "من وام، من دەمەوێ بەو پێچکانەم دڵی هەموویان داغ بکەم، هەر چی کورە بیخەمە ژێر پێم، بە تایبەتی ئەو سەردارە حیز و غەدارە."

نیان دیسانەوە پرسیی، "چۆن سیاسی بوو، واز لە پۆزی ئەو پەپوولە بێنە، ئەوەم پێ بڵێ چۆن سیاسی بوو؟"

میدیا گوتی، "هەموو شتێ باس بکەم، حەیای خۆیشم و ئەویش بەرم؟"

نیان قسەی نەکرد، "چی؟ حەیای خۆیشی بەرێ بۆ ئەو چیی لەگەڵ کردووە." ئەوەی لە دڵی خۆیدا گوت. میدیا بەردەوام بوو، "پێم بڵێ سیاسەت مانای چییە؟ بە دوو قسەی خۆش منی لە کۆلێژ بردە دەرێ، بە بیانووی جگەرخواردن و قسەی خۆش، جا ڕاستی دەکرد، سێ شیش جگەری خۆشی بۆ کڕیم، لەبەر سیحر و فێڵی ئەو نەبێ، من هیی سێ شیشم، چای شیرین و ڕەش وەک چاوی ئەو پەریخانە.

نیان تاسا، ترسا ژیانی ئەو بگێڕێتەوە، پەریخان گوتی، "حەزم لەوەیە. دوایی چوونە کوێ؟""چووینە سەر دیجلە، گوایە حەزی لە سروشت و ماڵە هەژار و ماسیگر و ئەوشتانەیە. منیش حەزم لێ بوو، شوێنێکم پلی دەهاویشت (پێکەنین)، لەگەڵی چووم، ئێوەش بان دەچوون. خەریک بوو تەنوورەکەم لێ بەر بێتەوە، ئەو ماسیگرە پیرە و ئەو ژنە

دەموچاو کوتراوە و ئەو منداڵە ڕەشە قوونڕووتە و ئەو کچە حەکەدارانە، ئاوا بردمی، ئەوەندەم زانی خۆم لەناو قامیشەڵانی پشت زانکۆ ڕووخاوە کۆنەکەی موستەنسرییە دیتەوە، لەوێ لەناو ئەو قامیش و بۆقە لینجانە لەوەختێکدا خەریکە تەنوورەکەم لێ بەر بێتەوە، لێی پرسیم، 'لەبیرتە پێم وتی فەرەنسی؟'

ئاخر لەو ڕۆژەوە، ئەو هەر بەو قسەیە منی بە زنجیر و تەناف بەستەوە. هەر خۆی گوتی، لەپشت قامیشەکان گوتی، 'درۆ، فەرەنسیی چی؟ هەرچی کچی سپی و کرمە باریکەکانی فەرەنسا هەیە بە قوربانی یەک تاڵ مووی -کەمەری خۆم توند گوشیبوو ئاخر ئەو شەلاتییە دەشێ ناوی هەر شوێنێ بێنێ- یەک تاڵ مووی ق...ز... نا، بنباڵت بن.'

خەریک بوو میز بە خۆمدا بکەم، چەند دڵۆپێکیش کەوتە سەر دەرپێ سپییەکەی ئەو ڕۆژەم.

پەریخان بە هەناسەیەکی توندەوە گوتی، "دەک داوەشێی، حەیابەر."

نیان سەرسام و حەیران، میدیا گوتی، "تۆ بای بە پێچکە ئەستوورەکانتدا دەهاتە خوارێ. قوربانی یەک تاڵە مووی بنباڵت بن، جا ئەو کوڕە کەرانە نازانن لەگەڵ ئەو قسانە کچی بەستەزمان میز بە خۆیدا دەکات، بە هەزار حاڵ ڕام گرت، خۆم گوشی و بە هەزار حاڵ ڕام گرت. ئەویش هەی بە قوربانی ئەو سمێڵە زەرد و قژە باریکەی بم، کە هێشتا تاڵێکی بەسەر شانی نیانەوەیە، خۆزگە میزم لەو دەمە گەرمەی کردبا، من تەواو خۆم بە ویقار نیشان داوە، بەڵام خوێڕی هیچوپوچە زانیی، نازانم چۆن زانیی دەموچاوم

درۆ دەکات و من لە دڵەوە تەسلیم بووم. زانیی خەریکە جلەکانی بەرم دەبنە هەڵم، ئێسقانم باریک باریک ببوونەوە، ئەویش دەلەرزی، لە کەمەرەوە دەلەرزی، هەستم کرد خەریکە پانتۆڵە ڕەساسییە تەسکەکەی بتەقێ، خۆم دەناسم بۆیە ناوێرم سەیری کەمەریشی بکەم، ئاخر ئەوەندە شل نەبام، کەمەرم، دڵم، پێستم ئەوەندە شل نەبا، تفێکی خەستم بەو ڕوخسارە پڕدرۆ و هەڵخەڵەتێنەیدا کردبا. دەستی بە ئاستەم، کە هێشتا بۆنی جگەری لێ دەهات، ئەوەندە برسی ببوومەوە دەتگوت یەک ساڵە نانم نەخواردووە، خەریک بوو گاز لە پەنجە جگەرییەکانی بگرم. بەئاستەم هەر ئەوەندەی هەناسەم بەر پەنجە سەگییەکانی بکەون، بەئاستەم پەنجەی خستە سەر لێوم و گوتی، 'هەموو کچان و ژنانی سپی و کرمیی ئەو فەرەنسایە، هیی ئەو سوید و ئەڵمانیا و نەرویجە، کە ئەوەندە ساردن دایکی خۆیان جورئەت ناکات لە تەنیشتیانەوە بخەوێ، بە قوربانی ئەو گەندەمووەی سەر لێوت بن.'

جا گوتی، 'کچێ ئەوە چییە هەست بە لافاوی خوێنی ژێر پێستی لێوت دەکەم، هەی کەفی دەریا.'

منیش هەر بەنیاز و هەستی برسیایەتی و بۆنی جگەر بەئاستەم پەنجەکانیم ماچ کردن، کەچی ئەو هەتیوە خوێڕییە کە دەیزانی تواومەوە و حیز بووم، ئەو ماچکردنەی منی نەدیت.

پشتی بە دارێکەوە دام و گوتی، 'سەیری خۆر بکە.'

خۆر ئەو کاتە وەک هەستی من شەهید ببوو، سوور سوور ببوو، سەیرم کرد و ئاو زایە ناو چاوانم و بە

کوڵممدا شۆڕ بۆوە بۆ سەر لێوم. من هیچ ئاگام لێ نەبوو، خۆیشم بۆ حازر نەکردبوو، ئەو جادووبازە، ئەو سیحرباز و حەرامزدە گەوادە لێوە ئەستوورەکەی ژێرەوەی ڕاست خستبووە ناو دەمم -پەریخان تەنها دەستی نا، بۆ خۆی ڕاست چووبووە ناو دەرپێکەی خۆیەوە، بە هەناسە و هەوەس ئەوەندە پڕ ببوو خەریک بوو بەرز بێتەوە و بە بن میچەکەوە بنووسێ-من هەر نەمزانی سمێڵە زەردە درێژەکانی ڕاست چووبووە ناو دەمم، من خوا دەزانێ بە تامی ماچ نا، بە تامی برسیایەتی و جگەرەوە، ئاخر یەک پارچەخوێن و خوڕ و جگەر بوو. مژیم، مژیم و توند مژیم، توند توند، توندتر مژیم، کچینە نازانم کوڕ کە ئەوەندە پیس و نەگریس و بۆنتەگەیە بە تایبەتی ئەو سەرداره قۆڵبڕە بۆچی لێویان ئەوەندە هەنگوینییە، خوا تۆویان ببڕێتەوە. ئەو سەری بردبووە ناو قژم، دەستی خستبووە پشت سەرم بۆ ئەوەی سەرم بەر دارە زبرەکە نەکەوێ. چاوم نووقاندبوو لێویم دەمژی، ئێوەش دەزانن ئەو زۆڵە تەنها لێوی جوانە و بە چاوی نووقاوەوە دەکرێ بیمژی. خۆتان من دەناسن دۆستپەروەرم، قسەم نەکرد و گوتم دەکرێ دۆستایەتی تا ئەو پلەش بڕوا، بەتایبەتی بۆ ئێمە کە غەریبین و دەستێک نییە لە باوەشمان بکات.

ئەو، ئەو ناکەسبەچەیە، دەستی بۆ سمتم هێنا، بەسەر سمتمدا شۆڕی کردەوە، لەگەڵ خزینی دەستی هەموو پێستم وەک لافاو خزی، تووڕت تووڕت بوومەوە، دڵم ڕاست هاتە ژێر پەنجەکانی، ویستم توند بەسەریدا هاوار بکەم، زلەیەکی توندی لێ بدەم و بۆ ئەو نیانە چاوحیزە و هەمووانی تەمبێ

بکەم، نەگبەتی ڕاست لەو کاتەی بۆ هاوارکردن بەسەریدا دەمم کردەوە، ڕێک لەو کاتەدا جارێکی دیکە لێوی گۆڕی و سمێڵی بەو هەموو هەناسە و لیکەوە کەوتەوە ناو دەمم، لێوی خوارەوەشم کەوتبووە ناو دەمی ئەو سەگسارە پێستمارە، دەشێ ئێوەش بزانن، لەو کاتانەدا خۆت نا، جلەکانی ناو کانتۆر و پێڵاوەکانی بەردەست پینەچییش مووچووڕکی پێدا دێت، با سێ ڕۆژیش بێ، لات جێ هێشتبێ. لێوم سڕسڕ ببوو، وەک لێوی نیان، ئەو باش دەزانێ لێوسڕبوون چۆنە، ئەویش بەو لیکە گەرمە گەرمی دەکردەوە، وەک ئاسنی سوورەوەکراو بخەیتە ناو ئاوەوە با ئاوەکەش گەرم بێ، دنیا دەکاتە هەور، هەڵم دەوری سەرمانی تەنیبوو. من نابێ هیچتان لێ بشارمەوە، گیرانەکەی پەیوەندیی بە منەوە نییە، تەنها پێتان دەڵێم ئەو سیاسەت باز و غەداریش بوو، لەو سەدامە زیاتر دیکتاتۆر بوو.

من ئاگام لە خۆم نەمابوو، جا بۆ ئاگام لە خۆم بمێنێ، ئاخر خۆ ناکرێ لەو بەغدایە خۆت تەسلیمی کوڕی کورد بکەی و ئاگاشت لە خۆت بمێنێ، وەختێکم زانی دوو دوگمەی کراسەکەمی کردبۆوە، ئەو دوگمانە دایکم بۆ خۆی بۆی لێنابوومەوە، وەختێکم زانی ئەو مەمکە عەجولانەم کەوتبوونە ناو دەستی، هەستم دەکرد لەو کاتەدا بە قەد دیجلە ئاوم لە بەر ڕۆیشتووە. دەشێ ئەویش بەو نیازە ئەوەی نەکردبێ، مەمکەکانم تۆزێک گەورە ببوون و فڕیبوونە ناو دەستی، ترسام مەمکەکانم بتەقنەوە، بەڵام ئەو زۆڵی حەرامزادەیە بەوەش ڕانەوەستا و دیتم، درۆ، چاوم هیچی نەدەدی هەستم کرد، گۆی مەمکی چەپمی، کە خاڵێکی قاوەییی کاڵی پێوەیە،

خستۆتە ناو دەمیەوە، ئەگەر مووچڕکە و هەناسەکانی نەبووایە، ئەگەر بمزانیبا هەست و ئیداراکی ماوە، نەک هاوارم دەکرد، نەک تفبارانم دەکرد، سەریم دەشکاند و تەمبێم دەکرد، بەلاّم تاڵی سمێڵی بەر ئەو خاڵ و پێستە تەنکەی سەر مەمکم کەوت و هەناسەم وەستا و قسەم بۆنەکرا. لاڵ بووم، لاڵ لاڵ. بەوەی چاک بوو شوێن دەمی گۆڕی گازێکی توندی لە مەمکی ڕاستم گرت، خەریک بوو گۆیەکەی لێ بکاتەوە و ڕۆحم دەر بچێ، زللەیەکی توندم لەناوی چاویدا، لای چەپیم سوور کردەوە، خوێنی لووتی بەر بوو، ئەها ئەوەتا خوێنەکەی کەوتۆتە سەر ژێرکراسەکەم، ئەوەش شوێنی گازە ژەهراوییەکەی ئەو هەتیوە تا ئێستا ماوە لەسەر مەمکی ڕاستم. خوایە ئەو شەو لە سێدارەی دەن و لە کۆڵمانی کەنەوە.“

پەریخان وەک ئەوەی تازە لەبن میچەکە دابەزیبێ، بە هەناسەیەکی نووساوەوە گوتی، ”گازی ئەو تا ئێستا نامێنێتەوە، ئەوە جێ گازی ئەو کچە بەسرپاوییەی برادەرتە، هەدیل، بۆ نازانم دوێنێ شەو بەیەکەوە لەسەر جێگاکەی ئەو خەوتبوون. دیارە زللەکەشت هەر لەو داوە ئەورۆ دەیگوت چاوم خوێنی تێزاوە.“

نیان سەرداری لێ بووە دەسرەیەکی بەکارهاتوو، ها لەوێ فڕێ بدرێ هەڵی ناگرێتەوە، سەیری میدیای کردەوە، بۆنی جگەر لە لێوەکانی دەهات، بۆنجگەرێک بە دەستی سەردارەوە، چای شیرین و ڕەش، دووکەڵی بازنەییی سپی. نیانیش لەگەڵی چووبووە پشت قامیشەلاّنە چڕەکەی ئەودیو زانکۆ ماندووە کۆنەکەی موستەنسرییە، ئەویش پیاوە پیرە

ماسیگرەکەی دیت، ئەوەی گوایە سیحربازە و ماسییەکان بەدەنگیەوە دێن، بەلەمە تەختە و درێژەکانی دیوە، ژنە دەموچاوکوتراوەکانیش، ئەوانەی دەیانگوت لە چۆلەکە زیاتر دەپەڕن. منداڵە قوونڕووت و بێخزمەت و پێستئەستوور و میزکەرەکانیش. پێشی جوان بوون، منداڵێکی سەرقژن و نیگروشی ماچ کرد، پێستی بۆنی قوڕی لێ دەهات. جگە لەوەی ڕەش ببوو، هەتاو نەک دەموچاوی تەواوی پێستی پشتی و سینگ و ورگە ئاوساوەکەشی سووتاندبوو. بولبول و کۆتر و ئەوشتانەشی دی. سەرداری زۆڵ گوتیشی ئەو تەیرانە زۆر لە من ئاقڵترن، ئەوەتا ئەوان لەوسەری دنیا دێنەوە و وەک گوللە دەچنە ناو دار و بێشەلان، بە هەمان خێرایی هێلانەی خۆیان دەدۆزنەوە، بەلام من، بەلام ئەو دڵەی من بۆ جارێکیش نەیتوانی هێلانەی خۆی بدۆزێتەوە. ئا هەموو ئەوانەیان کرد، بەلام ماچ و لێومژین و دوگمەکردنەوە و دەستی پشت سەر و ئەو شتانەیان نەکرد، میزیش نا، نیان حەزی لێ بوو جارێک لە ژیانیدا، لەسەر گردێکەوە بەپێوە میزێک هەڵدا، بەلام ئەو هەلەی هەرگیز بۆ هەڵنەکەوتبوو. بەلام چەند دڵۆپە میزێک ئا، شەرمی کرد، حیکایەتی کچی ئەو ولاتە چەند لێک دەچن، بۆ ئەوەی شەرمەکەی بشارێتەوە، بە میدیای گوت، "کە وایە، کە ئەوەندە خۆشت دەوێ، کە لە باوەشی ئەودا میزت بە خۆتدا کردووە، چۆنە ئاوا بێخەمی؟ کچ نابێ هەرگیز کوڕێک لەبیر بکات کە لە باوەشیدا خۆی تەڕ کردبێ."

میدیا گوتی، "تۆش دەزانی، باشیش دەزانی ئەو چەند بێوەفا و سپڵەیە."

نیان بەپێکەنینەوە گوتی، "من نازانم. من بەرگەی قسەکانی تۆش ناگرم هەی بێشەرم."

میدیا گوتی، "من بۆ خۆم دیتم، ئێوە جگەرتان دەخوارد، بۆ خۆم جگەرەکێشانەکەشتانم دیت، ئەوەش مووە باریکەکانی بەسەر شانتەوە."

پەریخان هەموو جلەکانی داکەندبوو تەنها پێڵاوەکانی مابوو، میدیا بە ئەویشی گوت، "چونکە کورتیلەی، هەر بەو پێڵاوە بەرزانەشەوە بخەوە. نەک ئەو کوڕوکاڵە بێنە خەونت."

پەریخان گوتی، "ڕاستتان دەوێ من هەر لە خەوندا کوڕوکاڵم خۆش دەوێن."

***

ڕۆژێکی بێزارکەر بوو، شەوەکەشی، بێزارکەر نا، ئاڵۆز و پڕچاوەڕوانی و ترسانیش، ئێوارەکەی پەتاتەیان سوور کردەوە، دوو تەماتەش. بەیانییەکەی بە هەمان وەڕسییەوە چوونە زانکۆ. نیان گوێی لە چپەچپێکە، "ئەم شەو بەدزی لۆکەرەکەی سەرداریان شکاندووە."

پێش ئەوەی نیان بپرسێ، "کێ شکاندوویەتی؟"

گوتیان، "هەر ئەو ئەمن و شەلاتییانە بوون."

مەهدی کوڕە باڵابەرز و کەپووبەرانییەکەی هەولێر ئەوەشی بۆ زیاد کرد، "دیارە قوتابییە ئەمنەکان بوون، دەیانەوێ بزانن داخۆ هیچ نهێنیی هەیە، بزانن هیچی قاچاغی لە لۆکەرەکەیەدا نەشاردۆتەوە؟ بەدوای ناوی برادەرەکانیدا

دەگەڕێن. ئەوانەی هاوکارییان کردووە."

دیسانەوە ترس، لە تای ترس ناخۆشتر نییە، ترس وردەدرکە و دەچێتە ژێر پێڵوی چاوەوە، کوڕێکی عەرەب گوتی، "دەشێ دانی بە هەموو شتێکدا نابێ، ئیعترافی کردبێ، چوون ناوی هاوکارەکانی بدۆزنەوە."

هەموو کوردەکان ئەوانەی برادەری سەردار بوون یان نا، ترسێک کەوتە دڵیانەوە، ترسێکی بێسنوور، گومانیان هەبوو ناویان هەبووبێ، ناویان کەوتبێتە لای سەردار، کتێبێکیان دابێتێ، ئەو بە بیانوویەکەوە ناویانی لە شوێنێک نووسیبێ، لەوە دەترسان کە وێنەشیان لەگەڵ گرتبێ.

تاکە یەک کەس نەدەترسا، گوێی نەدەدایە و قسەشی نەدەکرد، تەنها لە پەناوە گوێی ڕادەگرت، بەڵام هێمن، سەروەر بوو، لە پەناوە بە نیانی گوت، "دوای وانەکان، کە تەواو بووی، مەڕۆوە، بەتەنها کارێکی تایبەتم پێتە."

نیان بەلایەوە سەیر بوو، ئەو هەتیوە دەموچاو خوار و چاڵە چۆن وێرای ئاوا ئاسان پێی بڵێ، "دوای وانەکان کارێکی تایبەتم پێتە." بە جۆرێک لە بێزاری و گومانەوە سەیری کرد، سەروەر بۆ ئەوەی گومانەکەی برەوێنێتەوە گوتی، "شتێک پەیوەندیی بە سەردارەوە هەیە."

نیان زۆر بەتوندی، وەک ئاگر لە خۆی دوور خاتەوە گوتی، "من پەیوەندیم بە کەسەوە نییە."

سەروەر نەرمتر بەڵام بەسووربوونەوە گوتی، "پەیوەندی بە تۆوە هەیە، چاوەڕێتم."

بە ڕوخسار نا، بەڵکو لە دڵەوە بڕیاری دا نەچێ، "دەیەوێ تووشی چیم بکات ئەو هەتیوە گەڕە؟" وانەکانی

خوێندن، نیگەرانییەکانی هاملێت نیگەرانتری کرد، ئۆفیلیا قوربانیی شەڕی پیاوەکان بوو، لەو سەردەمەوە، خێزانەکان، دۆستەکان، خزم و خۆشەویستەکان هەموویان خەریکی فێڵ و تەون و داون لە یەکتری. تەنها هەبوونی تەڵە و داو بەسە بۆ ئەوەی گومانت لە دڕەندەییی ئینسان نەمێنێ، ئاسمان بۆیە وا چۆڵە ئەو دەعبایە باڵندەکانی قەلاچۆ کردوون، دارستانەکان، گیاندارەکان بۆ کوێ کۆچیان کرد؟ هەموویان وان لە گەدەی ئەو گیاندارە دوو پێیە. دەبێ ئەو کوڕە یەک پارچە قەتران و تاریکییە چیی لەبن سەر بێ؟ ئەو دەیەوێ کێ قەلاچۆ بکات؟

تێپەڕین، وانەکان یەکەیەکە تێپەڕین، مامۆستا عەبدولقادر بەیتار، مامۆستا بەهەیبەت و شارەزایەکەی ئۆکسفۆرد، مامۆستای گرامەر و ڕستەی پڕیاسا و ڕێسا و دایەگرام. نیان حەزی کرد ژیانیش وەک زمان بایە، مرۆڤەکانیش وەک وشە بان لە شوێنی خۆیاندا نەبێ جێگایان نەبێتەوە. ناوێک خۆی لێ نابێتە کردار، ئاوەڵناوێک خۆی لێ نابێتە ئامرازی پەیوەندی. تێپەڕین. وانەکان تێپەڕین، ئەو نایەوێ بیر لە سەروەر بکاتەوە. بە ڕاڕەوەکەدا تێپەڕی، ترسا، وەک هاملێت خێوێکی لێ پەیدا بێ، خێوەکەش لە ڕوخساری ئەو سەردارەدا بێ کە دوو ڕۆژ پیاسەی لەگەڵ کردووە و ئێستا لێی بۆتە مۆتەکە. ڕاست وا دەر چوو، لەگەڵ یەکەم پێچکردنەوە سەروەر وەک سێبەرێکی تاریک، بەلام ئارام و شەرمن و بەئەدەب، بە قژێکی چەور و قەترانی و درێژەوە، باریکیش دەر کەوت، زانایانە گوتی، "دەمزانی دەتەوێ بزانی چیی سەردارم بۆ هێناوی."

نیان ئاوڕی دایەوە بزانێ کەس ئاگای لێ نییە کە ناوی سەردار دێنێ، خۆ ئەو نەفرەتییە خەریکە تووشی بکات. بەبێدەنگی ڕۆیشت، لەگەڵی ڕۆیشت بۆ دەرەوەی کۆلێژ، پێش ئەوەی بگەنە گۆڕستانی پاشایان، نزیک پردی ئاسنین لەژێر دارێک دانیشتن، سەروەر بەوپەڕی هێمنی و دڵسۆزییەوە گوتی، "من لۆکەرەکەی سەردارم شکاند."

نیان تاسا، ئەو هاوڕێ مارە، ئینگلیزەکان بە هاوڕێی خیانەتکار دەڵێن، ماری ناو گیا، ئەوە ماری بەعسە لە دڵی سەرداردا، دیارە بۆ ئەوانی شکاندووە، دەیەوێ نهێنییەکانی سەردار بۆ ئەوان بەرێ؟ سەروەر بەردەوام بوو، "شکاندم، تا چیی هەیە، هەر کتێبێکی یاساغ و هەر شتێکی نهێنیی هەیە دەریان بێنم و بیانشارمەوە، بەتایبەتی نامەکەی..."

نیان نەیهێشت تەواوی بکات، پرسیی، "بۆچی تۆیان ڕاسپاردبوو؟ بۆچی دەتەوێ نهێنییەکانی بۆ ئەوان بەری، خۆ دۆستت بوو! هەی..."

تەواوی نەکرد، سەروەر گوتی، "بەرژەوەندی ڕای سپاردم، بەرژەوەندیی هاوڕێکانم، هەر بۆ خۆم شکاندم، ویستم هەر چیی نهێنییە بیشارمەوە، چونکە دەزانم ڕۆژێک هەر دەیانشکاند."

"هەر هاوڕێیەکت بەرژەوەندیی لە دزینی نهێنییەکانی سەرداردا بێ، خیانەتکارە؟"

"تۆ، لەبەر بەرژەوەندیی تۆ شکاندم."

"من؟ خیانەت لەبەر من؟ ئەوە پەیوەندیی بە منەوە چییە؟"

"نازانم خیانەت چییە؟ بەلام نەمتوانی ڕێگا بدەم ئەمنەکان

نهێنیی تۆ بزانن."

سەروەر پێکەنی، نیان باوەڕی نەدەکرد ئەو کوڕە پێکەنینێکی هێندە شیرینی هەبێ، "نهێنی؟"

"ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە تۆوە هەیە، بە خەڵکی دیکەشەوە، لەناو کتێبەکانی چەندان نامەی وەک بیرەوەری، نازانم وەک چی نووسیوە، یەکێکیان بەتایبەتی بۆ تۆ نووسراوە."

نیان تاسا، کەمتر دەترسا، دیار بوو ئەو کوڕە خۆشی ویستووە و نەیویستووە پێی بڵێ. دیارە نامەی بۆ نووسیووە و نەیتوانیوە بیداتێ. بیری لە میدیا کردەوە، درۆ، هەموو قسەکانی درۆ دەر چوون، گلەییی لە خۆی بوو کە خەریک بوو بە قسەی ئەو کچە گاڵتەجاڕە هەڵخەڵەتێ و سەد جنێو بە سەردار و بێوەفاییەکەی بدات. میدیا درۆی دەکرد، درۆی تەواویش نا، تا جگەرخواردنەکە، تا دووکەڵ و ماسی گرەکان ڕاست بوو، منداڵە قوونڕووتەکانیش، ژنە لووتکوتراوەکان، قامیشەڵان و زانکۆ کۆنەکەی موستەنسرییەش ڕاست بوون، ئەوانە هەموویان ڕاست بوون، بەڵام ماچ و ختوکەی سەر لێو و خۆتەڕکردن درۆ بوون درۆ. خەیاڵی خۆی بوو، خەیاڵ و بەس.

سەروەر گوتی، "کەستان وەک من سەردار ناناسن، پێشتر، زۆر پێش ئێوە دەمناسی، کۆنین پێکەوە."

نیان گوتی، "کوا جگە لەو دوو جارە تۆم لەگەڵ نەدیوە."

"من هەر لە بەشەکەی خۆمم، زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، زمان و ئەدەبی تورکی دەخوێنم، جگە لەوەش دوو ساڵ بوو وازم هێنابوو."

"وازت هێنابوو؟ بۆچی نەخۆش بووی؟"

سەروەر باسی نەخۆشییەکەی بۆ کەس نەدەکرد، حەب و دەرمانەکانیشی بەدزیەوە دەخوارد، ئەو کچانە، بەرد بۆن دەکەن، دەڵێی کرمن دەچنە ناو قوونی پیاوەوە.

سەروەر سەری نەوی کرد و سەیری پێڵاوە سپییەکانی نیانی کرد، گوتی، "نازانم، ئەوە خوێندنت تەواو کرد، دوای ئەو چی؟ ژیان بۆ خۆی مۆتەکەیەکە خوێندن ناتوانێ ماناکەی بگۆڕێ."

نیان خەڵکی جیهانی ئەو قسانە نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا گوتی، "قۆناغێکە دەبێ تەواوی کەین."

"ئەوە بۆ ئێوە ڕاستە، بۆ من نا، مرۆڤ ژیانی بەسەر ئەو قۆناغانەدا دابەش کردووە، تەنها بۆ ئەوەی بەرگەی بگرێ."

"جیاوازیی چییە؟"

"زۆر زۆرە، دەتوانم بڵێم هیچیش نییە، تەنها دەتوانم بڵێم لە ژیانی مندا قۆناغ نییە، هەموو تەمەن خەرجکردنە، تەمەن کۆڵێکە، قورسایی و بارێکە بە شانمانەوە، دەبێ بیبەینە ئەوسەر، ژوورە تاریکەکە."

"باری چی؟ قورسایی چی؟"

"ژیان. بۆ ئاسانکردنی ژیان ئەو قۆناغانەمان داناوە، ڕاکردنە لە مەترسی ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان وەک خۆی."

"مەترسی؟ ژیان مەترسییە؟"

"مەترسییەکی گەورەیە، ئەو بارە هەرچەند زووتر دای نێی باشترە، ئاسوودەتری، کەمتر لە ئینسانییەت دوور دەکەویەوە، کەمتر هەست بە ئیهانە دەکەی، کەمتر ڕەزیل دەبی، ژیان هەموومانی خستۆتە ناو بیابانی ترسەوە، هەموو

شتێکت دەداتێ تا بگەیتە نیشانەیەک، کە دەگەی هیچت لە شتە گرینگەکانی پێ نەماوە. ئیمەش بەدوای قۆناغەکاندا ڕادەکەین، ئازایەتی ئەوەیە لە نزیکترین شوێن ئەو بارە دانێی."

نیان لە بەر خۆیەوە گوتی، "بیابانی ترس!"

"تەنها لە مەرگدا ترس نییە، بەس ئەو وەک نیان بەئاسانی نایەت."

نیان هیچی نەگوت، ئەو پیاوە لەکوێ هاتۆتەوە، گەیشتبوونە گۆڕستانی شاهانە، بۆچی هاتوونە ئێرە، چ جێگایەکی پڕترسە بۆ بەڵێن و یەکتردیتن. ئەوەندە سادە و شارەزا باسی مەرگ و مەترسیی ژیان و تاریکی دەکات، وەک ئەوەی لەوێوە هاتبێتەوە.

سەروەر نامەکەی دەر هێنا و دایە دەست نیان، ئەو لەرزی، لە کاتی وەرگرتنی نامەکەدا دەستی لەرزی وەک ئەوەی تەرمی مێردەکەی وەر گرتبێتەوە، وەک ئەوەی دەزگیرانەکەی لە ژووری سێدارەوە نامەی بۆ ناردبێ. بەسەر خۆی نەهێنا و یەکسەر خستیە گیرفانی جانتاکەیەوە و گوتی، "دەمەوێ بەهێمنی بیخوێنمەوە."

دوای تاوێک بێدەنگی گوتی، "بۆچی نامەی بۆ من نووسیوە؟ بۆچی بۆ خۆی نەیداومێ؟"

سەروەر پێش ئەوەی بڕوات، گوتی، "پێ ناچێ تازە نووسیبێتی، دەشێ بۆ خۆی هەرگیز نەیدابایەی."

نیان چووە ناو گۆڕستانەکە، لەسەر ئەو بەردە دانیشت کە لە شێوەی کورسیدا لەپشت سەری مەلیک غازییەوە بوو، مەلیکەکان بێخەم لێی ڕاکشابوون، خەم و حەسرەتی

ژیانیان بیر چووبۆوە، نیوەی تەواویان دابووە ئەو کچە کوردە زەردەی کە ئێستا دەیەوێ لەپشت سەری ئەوانەوە ئایندەی خۆی لە نامەیەکدا بدۆزێتەوە. ئەگەر ئەو مەلیک غازییە لەبەر بابی نەبا کە لەوسەرەوە چاودێری دەکات، بە هەر نرخێک با لەو گۆڕە ژەنگ و ژارە دەهاتە دەرێ و نامەیەکی بەخوێننووسراوی دەدایە ئەو کچەی لەژوور سەری دانیشتووە، گوایە کاتی خۆی زۆر پەرۆشی ئەوە بووە ژنێکی کورد بێنێ، گوتووشیەتی ئامادەم وەک نەبوخەسنەسر باخچەیەکی هەڵواسراوی بۆ دروست بکەم.

بە ئاگاداریی مەلیکە کوژراو و مردووەکان نامەکەی کردەوە، لەسەرەوە نووسرابوو:

"بۆ نیان ئەو کچەی لە زستانیشدا سەوزە

نازانم دەوێرم ئەو نامەیەت بدەمێ یان نا، لە ڕاستیدا بە ناوی تۆ ئەم نامەیە بۆ خۆم دەنووسم، تۆ هەمیشە کچە تاقانە و نازادارەکەی دڵی من بووی، لەو ڕۆژەوەی بەرامبەر خۆم ڕام گرتی و سەیری ناو چاوە پڕئاوەکانی بەر تیشکی خۆرم کردی، وێنەی خۆمم تێیاندا سەرتاپا، ئاو دیت، تەسلیمیان بووم. دڵم وەک موگناتیس ڕای کێشێ بەرەو تۆ دەهات، هەرگیز یەکەم ڕۆژی جگەرخواردنمانم بیر ناچێتەوە، ئەو کاتەی ویستم یەخەی کراسەکەت ڕێک بکەمەوە، درۆ، ئەو ڕۆژە لە هەدوو ڕۆژێک شیکتر بووی، کە دەستیشم بۆ برد و سەرم بۆ لات دانەواند تەنها ویستم لە هەناسەت نزیک ببمەوە، تەنها ویستم لە نزیکەوە بۆنی پێستت بکەم، من بەخیلی بە دایکت دەبەم، بەڵقیس وەک خۆت ناوەکەت پێ گوتم، یەکەم لەبەر ئەوەی زۆرت خۆش دەوێت و دووەم

لەبەر ئەوەی ئەو ماوە دووروودرێژە لەباوەشی کردوی و بۆنی پێستی کردووی. لەو کورە گەوج و نەزانەش زۆر پەستم کە دڵی بردی و لەدوای ئەوەی وردی کرد بۆی فڕێ دایتەوە. لەو کاتەوە کە چاوە خەمبارەکانتم دی ویستم، هەر بە سیکۆتینی عەشق و هەناسە بۆت چاک بکەمەوە، لە دڵەوە دەمویست درز و شکاوییەکەی بکەمە نەخشی ژیانی داهاتووم. دڵێک کە چاکی دەکەیەوە، واتا خوایەتی بەسەرەوە دەکەی، واتا بۆ خۆتی دروست دەکەیەوە، لە هەموو سەیرکردنێک جێپەنجەی خۆتی بەسەرەوە دەبینی. من دەترسم، لە خۆم نەک لە تۆ، ئاخر من لە عەشقدا سووک، بێهێز و ڕیسوام کوا کوڕی وەفا و پەیمانم. تەنها من و کەسێکی دیکە نا، لەسەر ئەم گۆی زەوییە کە دەزانم دڵ تاکە ئەندامە بە شکان جوانتر دەبێ، بە پینەکردن دەڕازێتەوە، هەوڵم دا بۆت چاک بکەمەوە، بەڵام من سەرشێت و هیچم، نەمدەویست شوێن پەنجەم بەسەر دڵتەوە بمێنێ، کەدڵێکت دی پینە نەکرابێ، بزانە ئەو دڵە هەرگیز بەکار نەهاتووە. نا ئەو دڵە تەنگ و ناسکەی تۆ جێگای ئەو پەنجە درێژ و عەجولانەی منی تێدا نابێتەوە. دوای جگەرخوارنەکە، شەوەکەی نەخەوتم، لەژێر بەتانییە زبر و خەتخەتەکەم تا بەیانی بە یادی تۆوە جینگڵم دا، بیرم لەو بەتانییە دەکردەوە کە بێپرس و بێترس و ئەرک بەسەر تۆدا کشاوە، دنیا چەند زاڵم و نادادپەروەرە، چی دەبوو پێستی من بووایە. سەرینەکەت کە بیرم لە سەرینەکەت دەکردەوە کە دەشێ وێنەی دوو پەپوولە، یان بولبولێکی دەنووکدرێژی بە ئەتەمین لەسەری چنرابێ، تاڵە موەکانی قژتم دەدی کە بەسەریەوە جێ ماون، بزەیەکی

تاڵ بە تامی مردن دەهاتە سەر ڕوخسارم. دەگریام، لە ناخەوە بۆ بێدەسەلاتی خۆم دەگریام، ژێر بەتانییەکەم پڕ دەکرد لە حەسرەت و شەونخونی، کە خۆر هەڵهات هێشتا دەستم بە تۆ نەگەیشتبوو، درۆیە، هەرگیز لە ڕۆژی کوڕێکدا خۆر هەڵنایە کە خۆرەکەی دڵی ئاوا بووبێ. هێشتا دەستم بە تۆ نەگەیشتبوو، تۆ وەک مانگێک کەوتبوویە ناو دەریا، دەمزانی دەستت لێ بدەم و ئاوەکە بشڵەقێ، دەشکێی و بەناو ئاوەکەدا پەرشوبلاو دەبیتەوە و ئیدی ناتبینمەوە. تیشکی خۆری لاری بەیانی لەودیو دارخورماکانەوە وەک دەرزی دەهاتە ناو چاوە لمتێچووەکانمەوە، بێخەوی وەک لم و وردەشووشە، وەک لمی داغ و وردەشووشەی سەد چوکڵە چاومی کون کون دەکرد.

هەر ئەو بەیانییە کە هاتمە زانکۆ، تۆ بە ڕوویەکی وەک ئاو پاکەوە وەستابووی، چاوەڕێ بووی، کە چاوم کەوتە سەر ڕوخسارت ڕێک پێکەنینت بۆ کردم، ڕێک دڵم وەستا، دەموچاوم بووە نایلۆن، وجودم تاسا، نەمتوانی جارێکی دیکە سەیری ڕوخسارت بکەمەوە، ئەگەر تەنها بەرەو ڕووت هاتبام، یەکسەر بێشەرم و بێپرس لەباوەشم دەکردی، تەواوی ئەو کۆلێژە دەهاتنە سەیرمان، ئەو ڕۆژە باسی خۆشەوستی و ماچ و لەباوەشکردن و بێشەرمیی من سەرانسەری ئەو عێراقە لە خوێن شەلاڵەی دادەپۆشی، بۆ یەکەم جار هەواڵی حەیاچوونی ئێمە پێش هەواڵی شەڕ دەکەوت. دەشێ سەرکردە شەڕانی و هەزەلییەکەش خەلات یان سەری پەڕاندباین.

خۆم شاردەوە، خۆم لە پۆلەکەماندا بەند کرد، خۆم

پێ نەگیرا و لە نهۆمی سەرەوە سەیرم کردی، هێشتا لای پلیکانەکان وەستاوی، هێشتا چاوەڕێم دەکەی، کوا من شایانی ئەو هەموو وەفا و ئولفەت و چاوەڕوانییەی تۆم، ئاییندەی من ئاییندەیەکی تاریکە، هەرگیز ناتبەمە ناویەوە. بەدزیەوە، وەک چەتە و سیخوڕ چوومە کتێبخانەکەی کۆلێژ، پێش ئەوەی بێیتە ژووری من تەقەی پێڵاوەکانتم لە دڵمدا بیست، کە هاتیشی من هیچم نەدەخوێندەوە، دەمخوێندەوە و وشەکانم نەدەدی تەنها چاوەڕێی تۆ بووم، دەمویست نەیەی، تا قەڵای بەرگریم هەرەس نەهێنێ. من تەنها چاوەڕێی تۆ بووم ئاخر کارێک، کتێب و ڕستەیەک نییە لەو دنیایەدا لە چاوەڕوانیکردنی تۆ گرینگتر و بەخشندەتر بێ. دەرگات نەکردبۆوە هەستم کرد هاتی، من لەناو هەزاران قوتابی، کە بێن و بچن و ماخۆلانیان بێ، دەنگی پێڵاوەکانی تۆ جیا دەکەمەوە. من ڕیتمی لێدانی دڵم لەسەر دەنگی پێڵاوەکانی تۆ ڕێک دەخەم. ئیدی دڵێکم ناوێ کە ئەو ڕیتمە نەناسێتەوە، کە دیتمی تام هاتێ، حەزم دەکرد مێزەکەم بەسەردا قڵپ کەیتەوە. بۆیە سەرم داخست و چاوەڕێ بووم، بۆیە چاوم داخست و سەرم خستە سەر کتێبەکە، بەڵام دڵم بەژێر پێڵاوەکانتەوە بوو کە وردەوردە دوور دەکەوتیەوە. قاوە تاڵەکەی ژنە جەسورەکەی ئاداب نەبایە، ئەو دکتۆرەی لەتەنیشتم دانیشتبوو بۆ هەمیشە تامکردنیشم بیر دەچۆوە.

من دەمویست یەک ڕاستیت پێ بڵێم، بە بادا بۆتی بنێرم، لەگەڵ بۆنی نێرگز لە قژتی بدەم، ئەو ڕاستییە تاڵە، ئەو گوللە ڕەشە، بۆ بە تۆوە بنێم، هەر ئەو ڕۆژە کە ڕەنگی زەردی نا ئومێدیم لە ڕوخسارتدا دی، بڕیارم دا بۆ ئەبەد لێت بشارمەوە.

قسە بۆ قوتابییەکانی هاوڕێم دەکەم و دڵم لای تۆیە، قاقا پێدەکەنم و لە ناخەوە بۆ تۆ دەگریم، نوکتە و گاڵتەکانم تەنها و تەنها بۆ ئەوەیە تۆم لەبیر بچێتەوە. لەبیرچوونەوەی تۆ بۆ من وەک لەبیرچوونەوەی ئاو وایە بۆ ماسی، وەک لەبیرچوونەوەی فڕین وایە بۆ مەل، وەک لەبیرچوونەوەی گریان وایە بۆ منداڵ، سەمایە بۆ ژن.

بڕیارم دابوو بۆ هەمیشە پشتت تێ بکەم، لەگەڵ ئیستەبرەق، کچە باڵابەرزە نەجەفییەکە بوومە هاوڕێ تەنها لەبەر ئەوەی لە تۆ دوور بکەومەوە، تەنها بۆ ئەوەی تۆم لەبیر چێتەوە. ئەو پێی گوتم من دەزگیران و عەشق و وەفام ناوێ، لە چیرۆکی لەیلا و مەجنوونی دایکیشم بێزار بووم، ئەو حیکایەتانە بە هیی ڕۆمیۆ و جولێتیشەوە هەموویان درۆن. من کوردێکی کەرم دەوێت لە شاخ ڕەقتر بێ. تۆم لەبیر نەچۆوە، چونکە ئەوم لەبەر ئەوە هەڵبژاردبوو، چونکە چاوەکانی لە چاوی تۆ دەچوون، تەنیا جیاوازییەکەیان ئەوە بوو چاوەکانی تۆ پڕ بوون لە ڕۆمانسیەت و چاوەکانی ئەو پڕ بوون لە هەوەس و دەستبازی. مامۆستا گەنجەکەشم پێی گوتم ئەوەی لەگەڵ ژنی نەجەفی بنوێ هەرگیز لە نەفرەتی ژن ڕزگاریی نابێ. بە ئەویشم گوت، بە کچە نەجەفییەکە، من ناتوانم تاسەر نەک لەگەڵ تۆ، بەڵکو لەگەڵ هیچ کەسێک بم، تەنها لافاوێک خەریکە بمبا، لافاوێک خەریکە دەمخاتە ناو خیانەتەوە، دەمەوێ وەک دارێک وەک چڵەپووشێک خۆمت پێوە بگرم. ئاوام بەو گوت ڕاست و دروست، ئەو یەکسەر باوەشی پێدا کردم و سەرم لەناو سینگیدا نقووم بوو، گۆی مەمکی بەر نەرمایی گوێم کەوت، داغ داغی کردم. ئیدی

هەرگیز غیرەتی ئەوەم نەما لێی نزیک ببمەوە.

من ئەو نامەیە بۆ تۆ نانووسم، ئەو نامەیە بۆ خۆم، بۆ قسەکردن لە گەڵ ڕۆحی خۆم دەنووسم، بۆ دڵنەواییی ڕۆحی بریندار و سەرسەریی خۆم دەنووسم. تازە ناتوانم بۆ تۆی بهێنم، تۆ پێویستت بە قسەی هیچ و وڕێنەکانی من نییە. تۆش پێویستت بە تێگەیشتن لە هەستی کوڕێکی سپڵە نییە. بۆیە ئەو قسەیەی دەمەوێ بە تۆی بڵێم بەو کاغەزەی دەڵێم.

یەکەم هۆ کە نابێ لێت نزیک ببمەوە باوکمە، من دەستی تۆم گرت خیانەتم لەو کرد، ئەو گوتی دەستی کچێکت گرت نابێ هەرگیز جێی هێڵی. من باوکێکی هەوریم هەیە، وەک هەور تەڕ و بەبروسکە و گرمەگرم، بەڵام پێویست بۆ ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین. نەک من مردووی سەر قەبران چاوی ئەو ببینێ تەسلیمی دەبێت و هیوای بە ژیان بۆ دەگەڕێتەوە. جلێکی کوردی لە بەر دەکات و جەمەدانەیەک دەخاتە بنهەنگڵی، لە جوانی و ڕووناکیدا ناوی جەمالیان لێ ناوە، کەس نازانێ پێشتر ناوی چ بووە، دەڵێی لە شەو یان لە تاریکی هاتۆتە دەر، پشت ئەو پڕنهێنییە و کەس نایبینێ، ئەوەی لەگەڵ ئەو پیاوە بێ بە نووری خودا دەژی و نان و کاسبی ناوێ. من بە نووری خودا و نانی ئەو گەورە بووم و نابێ قسەی بشکێنم. ئەوەی بە نانی نوور گەورە بێ هەرگیز ناگیرێت و کاتێک تۆ دەتەوێ ئەو دیار نییە، کێ توانیویەتی نوور بگرێ. ئەو بابەی من کەسی نییە، هەرکەس، تەنها خاوەنی ئەو نوورەی خودا و دڵی خۆیەتی. ئێمەی لەو دڵەی خۆیدا وەک کلاوکوڕە دەر هێنا، لە ناو دڵی ئەودا ماسی

بووین، بێ پەڕ و باڵ و بێ قسە، تەنها بە فووکردنێکی ئەو پەرمان لێ ڕوا و دامانە شەقەی باڵ. ئەو بابە ڕووناکەم باڵی گرتم و گوتی، "کوڕەکەم سەردارەکەم، تۆ نابێ بفڕی، تۆ نابێ بدەیە شەقەی باڵ تا بەڵێنێکم نەدەیتێ، بەڵێنی ئەوەی نابێ عاشقی کچان بی، دڵی تۆ جێگای یەک عەشقی تێدا دەبێتەوە ئەویش عەشقی وڵاتەکەتە، عاشقی دادپەروەری بی. عەشق ڕەگەکانی دڵ دەسووتێنێ و هەموو پەیوەندییەک لەگەڵ عەقڵ دەبڕێ و کۆتاییی پێ دێنێ. کە عاشقیش بووی، کە کچێکت خۆش ویست، کە کردتە باوەشت نابێ هەرگیز پشتی تێکەی. چارەنووسی تۆ وایە دەبێ بڕۆی و عەشقەکەت جێ بهێڵی، کچ هەرگیز بەرگەی ڕۆیشتنی عەشقەکەی ناگرێ.

نیانی هەمیشە سەوز

من ئێستا پیاو نیم، کوڕێکی سەربەخۆ نیم، دیلی ڕووناکیی باوکم. ڕووناکییەک بۆ من جگە لە قەفەزی شەرم و وەفا هیچی دیکەی نەدامێ. لەناو ئەو قەفەزەوە ناتوانم کەسم خۆش بوێ، ناتوانم خۆم بم. من دەمەوێ دەستت بگرم و ئازاد بم، لەباوەشت بکەم و ئازاد بم. من دیلی ئەو نانە نوورەم کە لەگەڵ باوکم خواردوومە. هەر نان نەبوو ئەو لەگەڵ نانەکە بەڵێن و بەندایەتی داومێ. بابم منی ناسیوە، من ناتوانم تا سەر هیی کەس بم، تا سەر بەوەفا بم، ڕێگای من لە ئێوە جیا دەبێتەوە، دەشێ ئەمڕۆ بەیانی، دوای ساڵێکی کە نازانم، بۆیە مەمبینە، وەکو دۆست و خۆشەویست مەمبینە، مەمناسە. دەشێ بەرگە نەگرم و بۆ هەڵخەڵەتاندنت بکەومە سەر پێڵاوەکانت، تۆ بەشەقێک، بەشەقێک لە قەپۆزم دوور فڕێم بدە، من زیاتر حەز دەکەم

بکەومە سەر پێڵاوە شینەکانت، نا، با بکەومە سەر پێڵاوە سپییەکانت، تا کە خوێنی لووتم بە شەقێکی تۆ بەر دەبێت، بکەوێتە سەری، من حەزم لە ڕەنگی سوور و سپییە لە تابلۆدا، تا ئەو پێڵاوە بە خوێنی من سووربووانەت هەمیشە منت بیر بخاتەوە. زۆر حەزم لە پێڵاوە ڕەشەکانت نییە، نووکەکەیان زۆر تیژە و پارچەئاسنێکیشیان بەسەرەوەیە، من کە هەمیشە ددانەکانم ئازارم دەدەن، بەرگەی شکانیان ناگرم. بەڵام پێڵاوێکت هەبوو قاوەیی، قوماش بوو، نەرم و توکدار بوون، حەزم لەوانیشە، بەڵام تۆ مەهێڵە وا بکەم، تۆ مەهێڵە بەسەر پێڵاوەکانتدا بکەوم، باوەڕم پێ مەکە، تا بتوانم و خۆم بگرم وا ناکەم، بەدرۆ ویقاڕی خۆم دەپارێزم، تۆش مەهێڵە، نەک دڵم بڕووخێ، نەک عەقڵم هەرەس بێنێ، تۆ وریا بە، ئەوەم بۆ تەنها ڕۆژێکە، دەردەکەی دووروودرێژترە... ببورە بە عەشقەوە دەست لە دەستت بدەم، بە عەشقەوە لەباوەشت بکەم، دەبێ بۆ هەمیشە ببمە دیلت، دیلییەک سەد قات لە ئازادی خۆشترە، ئەوەش بۆ کەسێک نابێ ڕێگەی ونبوون یان مردنی هەڵبژاردبێ."

نیان هەستی بە درێژیی نامەکە و تێپەڕینی کات نەکرد، کە سەری بەرز کردەوە دنیا تاریک دەبوو، سەری سووڕ ما لەو تاریکییە چۆن وشەکانی دیوە، دیارە وشەکان بریسکاونەتەوە، لەوە سەیرتر چۆن بەو تاریکییە لەو گۆڕستان و قەبرە درێژانە نەتۆقیوە. جارێ سێ لاپەڕەی مابوو، پێڵاوەکانی لا خۆشەویستتر بوو بەتایبەتی سپی و شینەکانی، سەرداری ئەوەندەی دیکە لا ئاڵۆز بوو، بیری لە باوکی سەردار کردەوە، باوکێک ئاوا بە فانۆسی نوورەوە

هەمیشە لەگەڵ کوڕەکەی بێ، حەزی کرد بیبینێ، پیاوێک بەو هەموو ڕووناکییەوە کوڕێکی هێندە تاریکی بۆ زانکۆ ناردووە. فانۆسێکی بێ نوور. نامەکەی خستەوە ناو جانتاکەی نەک دڵی، نا، نەیخستە ناو دڵی وەک بۆ ئەویش نەهاتبێ خۆی پێوە نەبەستەوە. بۆچی بەدەست خۆیەتی، کەی کچ کاری دڵی بەدەست خۆی بووە! خۆشییەک، ڕەونەق و جوانییەک هاتەوە ناو جەستەی، ئاوێک بریسکەی بۆ چاوەکانی گێڕایەوە. هێشتا جێگای سەرنج و خۆشەویستی و فیداکاری و خۆبەسەرپێڵاودادانە، ئەو ڕووداوەی لە پەلوپۆی خستبوو، نەک لە بەرچاوی کوڕانی هاوڕێی لە بەرچاوی خۆیشی خستبوو، دۆڕانی یەکەم عەشقی زانکۆی خەریک بوو بە هێجگاری جێی دەهێشت و لێی ڕزگار دەبوو. ڕزگاریش ببوو، کە بەئاگا هاتەوە گەیشتبووە بەردەم بەشە ناوخۆییەکەیان، پاسەوانەکەیان کە چاوی گومانی دوو ئەوەندەی چاوی براکانی قووڵ بوو، لێی پرسی، "بۆ وا درەنگ هاتیتەوە خۆ لە عەشقبازی نەبووی؟"

"با."

پاسەوانە مۆنەکە بەسەرسوەڕمانەوە لێی پرسی، "لەکوێ؟ لەگەڵ کێ؟"

"لەو گۆڕستانە، لەگەڵ مەلیک غازی."

پاسەوانەکە قسەی نەکرد، چونکە یەکەم کچ نەبوو عەشق دەستی لێ بووەشێنێ.

نیان زانیی ئەو سەرداره دڵی نییە، هەموو ئەوەی نووسیوویەتی بیانووهێنانەوە و جادووبازییە، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی خۆی لەبەر هەست و سیحری وشەکانی بە تەواوی

ڕزگار بکات، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ڕقی لێی نەبۆوە، ئەوەتا ناتوانێ کەسی خۆش بوێ، ناتوانێ کەسێک بۆ تەنها جارێک بەخۆشەویستییەوە لەباوەش بکات، جارێک بەڵێنی پێ بدا، ئەوە بەڵێنی مردنە، ئەویش خۆی بۆ شتێکی دیکە دانابوو، لەقوولاییی دڵی کچدا هەمیشە شتێکی دیکە هەیە، کێ دەڵێ خۆی بۆ کەسێکی دیکە دانەناوە؟

کە گەیشتەوە ژوورەکەی خۆی پەریخان لای میدیا دانیشتبوو، بەوپەڕی خەمخۆری و دڵسۆزییەوە دڵی دەدایەوە، دەستی بە سەریدا دەهێنا، میدیاش دەگریا، ڕایەڵەی ڕەش لە چاویەوە بەسەر کوڵمیدا درێژ ببوونەوە سەر لێوی، پەریخان خێراخێرا فرمێسکی بۆ دەسڕین یان بەسەرسوورمانەوە پرسیی، "دەڵێی تەعزیەتانە، ئەو گریانە بۆ کێیە؟"

پەریخان گوتی، "بۆ سەردارە."

نیان ترسا، ئەژنۆی شل بوو، ترسا شتێک ڕووی دابێ، لەو وڵاتەدا هەواڵی مەرگ پێش هەموو هەواڵێک دەگات، هەست بە قورسیی لەدەستدانی سەردار دەکات، وێنەی گۆڕەکانی گۆڕستانی مەلیکەکانی هاتەوە بەرچاو، هاتە بەرچاوی سەردار لەسەر یەکێک لە گۆڕەکان فڕێ درابێ، غیرەتی بیستنی هەواڵێکی وا ناخۆشی نەبوو، ڕاڕا بوو، دیسان پرسیی،

"بۆ سەردار چیی بەسەر هاتووە؟"

پەریخان بەهێمنی وتی، "دیار نییە، کەس هەواڵی ڕاستی نازانێ، بەڵام ئەوەتا پێش ئەوەی بگیرێ و دیار نەمێنێ نامەی بۆ میدیا نووسیووە، چ نامەیەک دڵی بەرد دەکاتە ئاو."

نیان ئەو جارە بەڕاستی کەوت، کەوتە سەر چەرپاکە،

چاوی نووقاند و گوتی، "هەڵە، هەڵە، هەڵە ئەو دنیایە بەهەڵە دروست کراوە."

ویستی نامەکە دەر بێنێ و لە بەرچاوی ئەوان بیسووتێنێ، هەموو ئەو کچانەشی لەگەڵ بسووتێنێ کە لە ژوورە پڕخوێنەکانیدا خەوتوون، نەیکرد. بڕیاری دا ئەو سێ لاپەڕەیەی ماوە نەیخوێنێتەوە، وەک خۆی بیداتەوە بە سەروەر.

# ٦

سەروەر لە وێنەیەکەوە هاتە ناو ژیانی نیان، وێنەیەک هەموو شتێکی سەروەری هەڵگێڕایەوە، ئەو حەزی لە پاییز بوو، پاییزی عاشقانە و درۆیینە نا، پاییزی زەردی خەمۆکی، حەزی لە شەو و ڕەنگی ڕەش و مردن بوو. ئێستا نا، ئێستا حەزی لە سەوزە، حەزی لە چاوەکانی نیانە، حەزی لە بەهار و چیمەنی تا قیامەت درێژ و کەسکە. حەزی لە خۆرەتاو و بریسکەی چاوە. ویستی هەموو ئەو چیرۆکانەش بدڕێنێ کە لە ستاییشی مردندا نووسیبوونی، دڕانیشنی، پادشای ڕەش و خلودی مردنی هێشتنەوە، ئەوانیشی وەک بابەتێکی بەسەرچوو لە سووچێکی فەرامۆشکراوی دڵی فڕێ دا. دیار نییە شێوەی ڕوخساری ئاوا پەلکێشی ناو ڕەنگی ڕەش و شەو و تاریکی کردبوو، یان ژیانە سادە و بێڕەنگەکەی منداڵی، یان کتێب و کەئابە و بێهودەیی. تاکە چیرۆکێک لەوانەی دڕاندبوونی کە زۆری خۆش دەویست، چیرۆکی پیاوێک بوو بە ناوی سەرمەد، ئەو چیرۆکەی ئەو ساڵە نووسی کە بە هۆی

باری توندی دەروونی و شلەژانی عەقڵیەوە ناچار بوو واز لە خوێندن بێنێ. سەرمەد بەتوانا و چوارشانەیە، لە هەمان کاتدا عاقڵ و وردبینە، هەمیشە پلانی بۆ داهاتوو هەیە. لە چیرۆکەکەدا سەرمەد بەوپەڕی ئازادییەوە دانیشتووە، خەریکی دانانی بەرنامەیەکە بۆ ئازادکردن و گۆڕینی سیستمی دنیا و خۆشبەختیی مرۆڤ، سەرمەد پاڵەوانی چیرۆکەکەی، پلانەکە بەوپەڕی وردی و زیرەکییەوە دادەڕێژێ، کەنگێ دەست پێ دەکات، لەکوێوە دەست پێ دەکات، کێن ئەوانەی یارمەتی دەدەن. سەرمەد لە چیرۆکەکەدا هەموو شتێکی یاداشت کردبوو، بەرنامەی بۆ هەموو ئەگەرێک دانابوو، هیچ هێزێک نەبوو پلانەکەی بشێوێنێ، یەکەم جار گوندێک و جا شارێک و وڵاتێک و کیشوەرێک و تا دەگاتە تەواوی جیهان. لە کۆتاییی چیرۆکەکەدا سەرمەد وتارێکی کورتوپوختی بۆ دانیشتووانی هەموو سەرزەوییش نووسیبوو، وتارەکە ڕووی لە هەموو ئینسانییەت بوو، بەرنامەیەکی تۆکمەی بۆ سەد ساڵی ئایندە داڕشتبوو، پێکەوەژیان و خۆشەویستی و ئازادی. سەرمەد بیری لە ژیانی مەل و ماسی و دار و درەختیش کردبۆوە. مرۆڤی دنیا ئازادەکەی سەرمەد زۆر حەزیان لە مۆسیقا و مەلەکردن و کارکردنە، هەمووان ڕازی و بەختەوەرن. گرینگترین ڕستەی چیرۆکەکەی سەروەر کە پاڵەوانەکەی ناوی سەرمەد بوو، دواڕستەی بوو، لەدوای ئەوەی سەرمەد بەرنامەکەی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دادەنێ و دڵنیا دەبێ لە جێبەجێکردن و سەرکەوتنی، کە لە دانانی بەرنامەکە تەواو دەبێ، هەڵدەستێ بچێ پێڵاوەکانی لە پێ بکات و دەست بە جێبەجێکردنی بکات، دەبینێ هەرچوار

دیواری ژوورەکەی ئاسنە و تەنانەت تاکە دەرگایەک و تاکە پەنجەرەیەکیشی تێدا نییە. ئاسنێک بە بەرینی و ئەستووری دنیا، سەرمەد تا دواهەناسە هاوار دەکات، بەڵام کەس دەنگی نابیستێ.

سەروەر نەیدەتوانی بە ڕەشنووسی ئەو چیرۆکانەدا بچێتەوە، بڕیاری دا بە شێوەیەکی دیکە بیر لە گۆڕینی دنیا بکاتەوە. تەکنیکی چیرۆکەکانی بەدڵ بوو، بەس نەیدەتوانی دەست لە وشەکانیان بدا، لەسەر ئەو بڕوایەی کە تەنها دەستلێدان لە ڕەژوو بەسە بۆ ئەوەی دەستت ڕەش بکات. بێئاگا لەوەی ئەو کاری لە کاربۆندا کردووە، کاربۆنیش پێش ئەوەی دەستت ڕەش بکات دەچێتە ناو سییەکانتەوە.

سەرەوەر بۆ ئەوە لۆکەرەکەی سەرداری نەشکاند تا نامەکەی لێ دەر بێنێ. ئەو دەیگوت، "ویستم بزانم هیچی قەدەغەی لەناودا نییە." بەدوای کتێبی قاچاغ و نامەی حیزبایەتی و بەیاننامە و شتی وادا دەگەڕا، بەڵام کە نامەکانی دیت، وەسوەسەیەک دڵی داگرت، وەک منداڵێکی ساویلکە و عاشق حەزی کرد ئەو خزمەتە بە نیان بکات. دەشێ فێڵێکی نهێنییش لە کارەکەیدا هەبێ، نامەکەی بۆ برد، جگە لەوەش دەیزانی سەردار کەسی خۆش ناوێ، ئەوەشی دەزانی بەو نامەیە نیان نائومید دەبێ.

ڕۆژی دواتر نیان چاوی بۆ سەروەر دەگێڕا، پێویست نەبوو زۆر بگەڕێ ئەو لەژێر دارەکان لای پلیکانەکانی بەشی ئینگلیزی چاوەڕێی دەکرد، نیان بۆ یەکەم جار سەیری چاوەکانی کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی، "چاوی ڕەشیش سیحری خۆی هەیە." کوڕ شتێکی هەر هەیە دڵی کچانی پێ بگرێ.

تاکە شتێک لە سەروەردا وەکو خۆی مابۆوە، چاوە ڕەشە گەورەکانی و برژانگە ئەستورەکانی و برژۆڵە درێژەکانی بوون. پێویست بوو لە زانکۆ بچنە دەرێ، چووشن، خۆ لە کۆلێژ و لە بەرچاوی خەڵک ئەو هەموو هەست و سۆز و نهێنی و وشەیە بە گۆڕێ وەر ناکرێ. چووشن، چوونە دەرێ، لای کۆلێژی ئەندازیاری تێپەڕین، گەیشتنە جەنجاڵییەکەی بابولموعەزەم، خانەی قوتابییانیشیان تێپەڕاند، گەیشتنە لای جگەرچییەکە، پێویست نەبوو سەردار لەوێ بێ، دووکەڵ و بۆنەکەی ناوی ئەویان بەگەورەیی لە هەوادا دەنووسی، هەناوی نیان داوای جگەری دەکرد، نەیانخوارد، لە باخچە بچووکەکەی ئەوبەر دانیشتن.

"نامەکەم تەواو نەکرد، هیی ئەوە نییە تەواوی بکەی، ئەوە ئەو جۆرە نامانەی بۆ چەند کەس نووسیوە؟"

سەروەر ناوی میدیای نەهێنا، گوتی، "بۆ ئەمەلیش، کچە بچووکە چاویلکەلەچاوەکە."

سەروەر نەیدەزانی ئەوانە دۆستن و لە بەشی ناوخۆییی قوتابییان پێکەوەن و نهێنیی یەکتر باش دەزانن. نیان گوتی، خۆی بە چی دەزانێ؟ وای زانیوە هەموو کچانی ئەو بەغدایە عاشقی ئەو بوون."

سەروەر مات و بێدەنگ، لە ڕوخسارە پەمەییەکەی نیانی دەڕوانی، نیان دیسانەوە گوتی، "لووت بەرزی لەخۆڕازی..."

سەرەوەر گوتی، "خۆشم دەوێ، دۆستم بوو، دەبێ ئێستا لە چ حاڵێکدا بێ!"

نیان گوتی، "تۆ وەک من نایناسی هەر چەند من هەرگیز خۆشم نەویستووە."

سەروەر گوتی، "ئەو بەختەوەر بوو کچانی ئەو کۆلێژە هەر هەموویان هاوڕێی بوون، لە هەر شوێنێ با دەوریان دەدا و پێکەنینەکەی تەواوی ئادابی پڕ کردبوو، چاوەکانی و ڕەنگە بەبریقەکەی، من حەزم دەکرد دەستێک، چاوێک، لاقێکی ئەو بام، سەرنجی هەمووان لەسەر ئەو بوو، ئێستا هەمووان چاویان بۆی بەغەمە، هەرچەند کەس نازانێ ماوە یان نا، بەڵام ئەو سەرداری دڵی هەمووان بوو."

نیان نەیدەزانی بۆچی سەروەر ئاوا بیر دەکاتەوە، دەنگی ئەو کوڕە بۆ ئەوەندە هێمن و کاریگەرە، گوتی، "کەس سەرداری دڵی من نییە."

بۆ سەروەر کەم نییە، بەرامبەر نیان دانیشی و تەماشای لێوە ئاڵو پڕئاوەکانی بکەی، بۆ ئەو قسە بکات، هەناسەی بە سینەیدا بچێ، ئەوە هەمووی لە ناوچاوانی سەردارەوەیە. سەروەر دووبارە گوتی، "نا، هەموو ئەویان خۆش دەویست، کە ڕیشی دەهێشتەوە ئیدی هەموو کوڕەکان ڕیشیان بەر دەدایەوە، کچەکان شێتی ڕیش دەبوون و دەیانگوت ڕیشی ئەو لە هیی هەموو کوڕەکان جوانترە، کوڕەکانیش پێیان وا بوو، واش بوو ڕەنگی ئاڵتوونیی ڕیشی ئەو کەم بوو. کە ڕیشی دەتاشی ناچار نەبوو نیوەشەو بەدزی برادەرەکانیەوە بیتاشێ، دەستشۆرەکەی پڕ نەدەکرد لە خوێن، وەکو ئاهەنگ و مەراسیم ڕیشی دەتاشی، ئاوێنەیەکی دوو دیوی گەورەی لەسەر مێزی ناوەندی ژوورەکە دادەنا، بە برادەرێکی دەگوت، "زەحمەت نەبێ لەو کترییە هەندێ ئاوی گەرمم بۆ لە قاپی ڕیشتاشینەکە بکە." یەکێک دەیگوت ئەو لاجانگەت تۆزێک درێژترە، یەکێکی دیکە دەستی لە ڕوومەتی دەدا و

دەیگوت، "زبرایی نەماوە،" لە کۆتاییشدا بۆنی ریشۆرەکەی ئەو تەواوی پارەو و ژوورەکان دادەگریت.

نیان گوتی، "کوڕان هەموویان وان، تۆ تەنها سەرنجی ئەوت داوە."

"نا من وانیم، دوو ساڵ نەهاتمەوە کەس نەیزانی، سەرنجی کەس ناکەویتە سەرم، نە ڕیشێکی جوانم هەیە بیهێڵمەوە، هەر تاڵە لە کەلێنیک سەری دەر هێناوە، نە دەشتوانم بەئاسانی بیتاشم، وەکو پیاوم کوشتبێ، دەستشۆرەکە پڕ دەکەم لە خوێن، وەکو پیاوم کوشتبێ هەفتەیەک خوێن بەرم نادات. ببورە نازانم بۆ ئەو قسانە بۆ تۆ دەکەم."

نیان بۆ دڵدانەوەی ئەو، قسەیەکی دایکی بیر کەوتەوە، گوتی، "جوانیی پیاو لە دەموچاویدا نییە، جوانی پیاو لە دڵیدایە، لە دەست و کاریدایە."

بەڵقیس ئەو قسەیەی بە برا گەنجەکەی گوتبوو ئەویش کاتێک لە شەڕدا نیوەی دەموچاوی سووتابوو، بەو هۆیەشەوە چاوێکی لەدەست دابوو، بەڵقیس ئەو قسەیەی بەو گوتبوو، لە وەختێکدا دەگریا و فرمێسک تەواوی سەر سینگی تەڕ کردبوو.

سەروەر گوتی، "ژنانێک هەن ئەو قسانە دەکەن، بەڵام نازانم چەند بەڕاستیانە. تۆ باوەڕت بەو قسەیە هەیە، جوانیی ڕوخساری کوڕ بۆ کچان هیچ گرینگ نییە؟"

نیان کە نیازی نەبوو درۆی لەگەڵ بکات، تۆزێک بەتەوسەوە بەتیلەی چاو سەیری کرد، سەروەر گوتی، "مەبەستم ئەوەیە بۆ دڵدانەوە و هاوخەمی نییە؟"

سەروەر چاوەکانی تەڕ بوون، وەک ئەوەی گریابێ، بەڵام

نـا، ئـەو لـەوە بەهێزتـر بـوو بگریـا، دەشـێ دڵخۆشـیش بووبێ، ڕاشـکاوانە گوتـی، "هەمـوو ئەوانـەی لێـم نزیـک بوونـەوە، تەنهـا بەزەیپێداهاتنـەوە و دڵدانـەوە بـووە، کـەس سـەروەری نەویسـتووە، کـەس لـە دڵـەوە بیـری نەکـردووم، کـەس حـەزی نەکـردووە لـە مـن نزیـک بێ، مـن لـە لایەکـم و هەمـوو دنیـا لـە لایەک، تـا سـەروەر نەبێ، نازانـی سـەردار چەنـد بەختـەوەرە."

نیـان کەوتبـووە بـەردەم ئەرکێـک، ئەرکێکـی تـا ڕادەیـەک ئەخلاقییـش، کەسـێک دنیـا برینـداری کـردووە، نـەک برینـدار، نیـوەی سـەری بڕیـوە و فڕێـی داوەتـە بـەردەم ئـەو، ناشـیەوێ بەزەییـت پێیـدا بێتـەوە، ناشـیەوێ بیلاوێنیـەوە، بۆیـە گوتـی، "هۆکارەکانـی بوغـز و بریندارکردنـی یەکتـر بیانـوون، دەنـا جوانـی و ناشـیرینی وەک یـەک ئازاریـان هەیـە، مـن ئەوەنـدەی دەردم بەدەسـت سـتاییش و پیاهەڵدانـی خەڵـک و ناسـیاوەوە دیتـووە، ئەوانـەی بـۆ مەبەسـتی خۆیـان ستاییشـی جوانییـان کـردووم، سـەد هێنـدەی ئەوانـە ئازاریـان داوم، کـە لـە دڵـەوە ڕقیـان لێـم بـووە."

سـەروەر ڕوونتـر گوتـی، "گرینـگ جوانـی و ناشـیرینی نییـە، گرینگ هاوبەشێکە بۆ ئـەو هەسـت و بیرکردنەوانەی تـۆ هەتـە. مـن نامـەوێ تێکەڵـی خەڵـک بـم، حـەز بـە دۆسـتایەتیی کـەس ناکـەم، کـەس لـە دڵـەوە گـوێ ناگـرێ، تەنهـا ئـەو سـەردارەم خـۆش ویسـت، ئەویـش تەنهـا لەبـەر ئـەوەی ڕۆژێـک گوتـی، "هەمـوو ئـەو ئینسـانانەی دەیانبینـی زبڵـن، دەبێ ڕۆژێـک فـڕێ بدرێـن."

نیان سەری لەو قسەیە دەر نەکرد، ئینسان و زبڵ، سەروەر گوتـی، "مـن دەمەوێـت لـە چـاوڕاو و ڕواڵەتبـازی ڕزگارم بـێ،

من دەمەوێ چاو بنووقێنم بە ناخی خۆمدا گەشت بکەم، خۆشترە لەو کاتەدا گەرمی لە ڕۆحی برادەرەکەت وەر گری. بەڵام ئاخ توخمی مرۆڤ ڕقیان لەیەکترە."

نیان پرسیی چۆن؟ سەروەر گوتی، "هاوتوخمەکان دوژمنی یەکترن، هاوتوخمەکانت دەتکوژن نەک دژەکانت. من وا بیر دەکەمەوە جوانیی ڕوخسار هیچ بۆ نەشئەی دڵ و سامانت زیاد ناکات، تەنها ئەوەندەیە ناشیرینەکان بەکەم تەماشا بکەی، کە مەبەست گەوهەری ئینسانە، ئیدی ئەو جیاوازییانە چین."

قسەیان ناخۆشتر بوون کاتێک لێک جیا بوونەوە، سەروەر گوتی، "بۆ ئەو دیدارەش دەبێ منەتباری سەردار بم، ئەگەر نامەکەی ئەو نەبا..."

نیان دوور کەوتبۆوە، وای زانی نابیستێ، بەڵام لەپڕ وەستا ئاوڕی دایەوە، "منەتباری سەردار بم!" بەو قسەیە هەنگاوێک زیاتر لە دڵی نزیک بۆوە، ئاخر بۆ ئەوەی کچێک دەستت بگرێ دەبێ بزانێ تۆ بەتەواوی کەوتووی، کەوتووی و توانای هەستانەوەت نییە. تۆزێک زیاتر بە ڕۆحیدا ڕۆ چوو، سەروەر هێشتا وەستابوو، نیان بۆی پێکەنی، "خەندە خستنە سەر لێوی دڵشکاوان زەکاتی جوانییە." هەر وەستاوە و سەیری ڕۆیشتنەکەی دەکات، نیان بۆی پێکەنی، دەستیشی بۆ بەرز کردەوە، لە بەر خۆیەوە گوتی، "ئەو ڕۆحە بریندارەت لەکوێ هێناوە، هەی بەستەزمان؟"

***

سەروەر ئەو ڕۆحە بریندارەی لەکوێی هێنابۆوە؟ سەروەر ئەو ڕۆحە بریندارەی لەکوێ هێنابۆوە، سەروەر لەبیریەتی لە کۆلانی ئاغالار کوچەسی، لە قەلاتێ، لە گەڕەکی سەرەڕای،ماڵیان لە کۆلانێکی بنبەست بوو، سەروەر هەمیشە بەرەو سەرە بەستراو یان داخراوەکەی کۆلانەکەیان دەچوو، لەوێ لەسەر بەردێک دادەنیشت، سەرنجی مێرووە ڕەش و زۆر بچووکەکانی دەدا، هەر لەو کاتەشەوە هەستی بە ڕۆیشتنی سەدان مێرووڵەی لەوان وردتر و ڕەشتر دەکرد لەناو کاسەسەری. چاوەڕێ بوو ڕۆژێک لە کونەکەپووی یان زاری یان چاو و گوێی، هەتا لە کونە میز و قوونیشی بێنە دەرێ، بەلام نەهاتن، ئەو مێرووڵە وردانە کاسەسەری سەروەریان کردبووە ماڵی خۆیان. کە گەورەتریش بوو، وەختێک مامۆستای زانست، ست ڕووناک، باسی ئەوەی بۆ دەکردن، کە مێرووڵە لەژێر زەوی ماڵی خۆیان دروست دەکەن، چینەکانی ژێر زەوی دەشکێنن و کونکونی دەکەن، ماڵ و ژوور و حەوشە و بانی خۆیانی تیدا چێ دەکەن. سەروەر ئەوەی بەبیردا دەهات، کە مێرووڵە وردەکانی ناو کاسەسەری ئەویش، کە ڕۆژبەڕۆژ زیادیان دەکرد، ئاوا لەناوەوەی کاسە سەری، لەناو مۆخ و ژوورەکانی لووتی حەوشە و ماڵی خۆیان دروست کردووە، کە تووشی سەرەگێژە و وژەوژێک دەبوو لە گوێکانیدا دەیزانی کە ئەوە هەڵکۆڵین و کونکردن بۆ دروستکردنی ژوورێکی تازە گەیشتۆتە ئاستی گوێی.

گرینگترین چیرۆکی مێرووڵەش کە سەروەر بیستبێتی چیرۆکی مێرووڵەکانی ناو دەرپێی نوور سەباح بوو، سەروەر نوور سەباحی نەدیبوو، بەلام نەوەکەی، خورشیدە

ژنانی، کە ماڵیان لە کۆڵانی دار بروخ بوو بە ناوی مێرووستان تورە دەبوو. تەنها سوراح شروب سەتان بە دەنگی بەرز بە خورشیدی دەگوت، ئەوەش ئەو جارەی کە سەروەر لە مەکتەب دەهاتەوە گوێی لێ بوو، "من هەتا ماوم نوور سەباحم لەبیر ناچێ، تۆ نەچوویتەوە سەر ئەو، بالابەرزییەکەی، کەتەیی و پتەویەکەی، دەنگی خڕخاڵی، گۆزنگی سپیی لەوسەری کۆلانێ دەنگی دەدایەوە. ژنیش عاشقی دەبوون، خورشید هیچت بەو ناچێ..."

ئەو ڕۆژەی سەروەر گوێی لەو قسانە بوو، خورشیدیش وەڵامی دایەوە، "پێم وا نییە ئەوەندەی تۆ جوان بووبێ سوراح، ئەو بەخێر باسی ئێوەی دەکرد..."

سوراح شروب سەتان بەتوانجەوە گوتی، "هەر باسی ئێمە! ئەو دۆستایەتی و یادەوەریی زۆر زۆر بوو..."

دواتر بەهێواشی ئەوەندەی بۆ خۆی گوێی لێ بێ، گوتی، "ئەو یادەوەری لەگەڵ مێروولەش هەبوو..."

لێرەوە سەروەر شەڕەقسەکەی ئەو ڕۆژەی نایەتەوە یاد، بەڵام چیرۆکەکانی ئەو قەراتەی هەموو ڕۆژێ دووبارە دەبنەوە. دوای چەند ساڵی دیکە سەروەر گەورە ببوو، شەوێکی ڕەمەزانێ لەگەڵ بابی چووبوونە چاخانەی عەبۆی قاوەچی. ئەو نەیدەزانی بۆچی چووبوون، دواتر بۆیان باس کردبوو کە بابی، مەحموود بەڵەک، هەندێ شەو هەمبەڵەی دەخوێندەوە، عەبۆی قاوەچی بە دەنگی بەرز چیرۆکی نوور سەباحی بۆ هاوڕێکانی دەگێڕایەوە، تەنها هاوڕێکانی نا، بۆ هەموو ئەوانەی لەوێ بوون. ئەوەش وەختێک کە چایەکی خەستی بۆ بابی دانابوو، گوتبووی، "مەحموود بەڵەک، تۆش

دەزانی دڵی من چەند بەداغە، چۆن دەستم بە ئاو و چای گەرم سووتاوە، هەموو پێستەکەی مردووە، ئیدی هەست بە گەرمی و ساردی ناکەم، دڵیشم ئاوا هەمووی سووتاوە، مردووە هەست بە گەرمی و ساردی، بە خۆشی و ناخۆشی ناکات، ڕاناچڵەکێت و نالەرزێ."

بابی سەروەری کە پێیان دەگوت مەحموود بەڵەک، پێشتر باسی ئەو بابەتەیان کردبوو، گوتی، "باشیشی برام، باشیشی، تێزابی نوور سەباح بەسەر دڵی هەرکەسدا بڕژێ دەیتوێنێتەوە."

عەبۆی قاوەچی گوتی، "بەڵەک ئەوەی بە من مەڵێ تۆ دەزانی ئەمن گەوادیم پێ قبوڵ ناکرێ."

بەڵەک گوتی، "تەماعی خۆشتی تێدا بوو، کاکی قاوەچی."

عەبۆی قاوەچی گوتی، "ئەو دەمی نا، ئەو دەمی نەمابوو، زانیم بەینی لەگەڵ ئەفسەرە تورکەکە هەیە، نەک ئەوە پێشیەوە دەنازین، بیستم شەوی وا هەیە بۆی دەچێتە سەربانی سەرایە. نەمتوانی ئەو گەوادیەی قبوڵ بکەم، چووم هەر لە بەر قەسابخانەکەی بابی نوور جیهانی، لوولاقێکی درێژ و باریکم پەیدا کرد، لە بەر هەتاوێم دانا، مێرووستانی هەموو هەولێرێ بۆ مۆخەکەی چوونە ناوی، لوولاقەکە پڕپڕ ببوو لە مێرووستان، شەوێ خۆم مات دا، چاوم لێ بوو، نوور سەباح لە ماڵێ هاتە دەرێ، بە دیوی حەمامێدا چوو، کۆڵانەوکۆڵان، گەیشتە ئاغالار کوچەسی، ویستم پێشی پێ بگرم گوتم، نا ئەوە کاری مەردان نییە، هاتە کۆڵانی سەرایە، ئەو چاوەڕێی دەکرد، دەستی گرت و بە دیواری هەڵگەڕا، چووە سەربانی، لێی گەڕام هەتا گەمەکەیان گەرم بوو، هەر

بەبن تەختەخەوەکەیاندا، لوولاکەکەم بردە ناو لینگی نوور سەباحی و فووم پێدا کرد. ناو لینگی پڕ بوو لە مێرووستان، دەرپێکەی پڕپڕ بوو لە مێرووستان، هەر ئەوەندەی پێکرا خێرا دەرپێکەی داکەند و فڕێی دا، دەرپێکەم فڕاند، لەبەر ئەو مێرووستانە نەفرەتییانە نەبا ئەو شەوە وەبن سەری خۆم دەنا، هەر بۆ بەیانی دەرپێکەم لە بەردەرگەی قەراتێ بە بەرزییەوە هەڵواسی. سوورمە بوو سوورمە، لە گردی قالینجاغایڕا بریسکەی دەدایەوە. گوتم ئەوەش عەلەمی عوسمانییان."

مەحموود گوتی، "دەرپێی بەتاڵ بە تۆ چی؟ خۆزگەت بە مێرووڵەکان خۆ هەندێکیان چوونە بەریەوە."

عەبۆ گوتی، "هەی بەنەفرەت بی قسەی وا دەکەی دوای ئەوەندە ساڵە ناوکی پیاو دەخەی."

سەروەر نوور سەباحی نەدیوە، بەڵام کەیفی بە مێرووڵەکانی ناو سەری هات، کە دەشێ ڕەچەڵەکیان بچنەوە سەر ڕەچەڵەکی مێرووڵەکانی نوور سەباح. جگە لەوەش لە گەورەییدا سوهێر ڕەمزی، ژنەئەکتەری شۆخی میسری بەو دەچواند، لاقە درێژ و پتەوەکانی، پرچە ڕەشماڵییەکەی، سینگی تەخت و پانی، باڵای سیحری. سەروەر بە هەرزەکاری، هەرزەکاریی تەواویش نا، ئەو دەم ببووە شازدە ساڵ. شێتوشەیدای مەمکە گەورەکانی سوهێر ڕەمزی ببوو، بە دەیان شەو لە خەونیدا وەک قوڕنە و گەنە پێوەیان دەنووسا. ئەو ساڵە و ساڵی دواتریشی هەر لەناو گەرما و و ناو نوێن بەسەر برد. خەو و خەونی دووردرێژ. سەروەر لە هەرزەکارییشدا نەیتوانی لە خەونەکانیدا بیر لە کچی زیندوو،

ناسراو و دیتراو بکاتەوە، نەیتوانی بیر لە کچی هاوسێ یان خزم و دۆست بکاتەوە. یەکەم کەس بیری لە سوهێر ڕەمزی کردەوە، سەرەتا تەنها قوشقی بوو بەرامبەری، تەنها سەیری دەکرد، چاوە کراوە و گەورەکانی، لێوە هەر گۆشت و پڕ و سوورەکەی، ژنێک نەبوو سەر شان و سینگی وەک سوهێر ڕەمزی پڕ و پڕشەهوەت بێ، پەیکەرێکی جوانی بوو دەجوولا و قسەی دەکرد، کە سەیری ڕانە سپی و پتەو و لووسەکانی دەکرد، ددانی چۆقەچۆقی پێ دەکەوت، دەستی دەلەرزی، تاکەکەسێک وەک سوهێر ڕەمزی هاتبێتە بەرچاوی نوور سەباح بووە، ئەوەش بەپێی وێنەکانی سوراخ و عەبۆی قاوەچی کە لە وشە بۆیان دروست کردبوو، سەرەوەر پێی وا بوو لە مردنیشدا چاو بنووقێنێ هەر سوهێر ڕەمزی دێتە بەر چاوی، لە چلەی هاویندا کاتێک سوهێر ڕەمزی بیر دەکەوتەوە بەڕووتی بەناو ئاودا دەڕوات و شەق لە ئاوەکە دەدات و دەیپرژێنێتە سەر بەرد و چەوی کەنار، فێنک دەبۆوە. تا گەورەتر دەبوو زیاتر سەری لەوە سووڕدەما بۆچی ئەو بەردانە ڕۆحیان ناچێتە بەر و پێی ماچ ناکەن، لە ژوورێکی نسرمی قەراتێ، بە شەقێکی ئەو، کە ئاوی نیلی دەپژاند، سەرەوەر چاوەکانی بچووک دەکردنەوە وەک پرژەی ئاوەکە بە دەموچاوی ئەو کەوتبێ.

ڕقی هەرە گەورەی لەو پیاوە قۆز و باڵابەرز و چاوسەوزە دەبۆوە کە هەمیشە بەتەنیشت سوهێر ڕەمزییەوە بوو، سوهێریش لە هەموو فیلمەکاندا حەزی لێ دەکرد و خۆی بۆ ڕووت دەکردەوە، مەمکە لۆکەیی و گەورەکانی کە هەر ئەوەندەی سەر گۆکانی داپۆشیبوو یان نا، دەخستە سەر

سینگی توکاویی ئەو جانەوەرە چاوسەوزە. سەروەر هەموو لەشی دەبووە ئاگر، ئەو پیاوە بێڕەحم و خودانەناسە لچە ئەستوور و بێسمێڵەکەی دەخستە ناو دەمی هەنگوینی و هەنگوینی و هەنگوینی سوهێر ڕەمزییەوە.

سەروەر بەو چوکەڵەیەی خۆیەوە هەستی دەکرد چووکی خەریکە هەتا نزیک شاشەکە درێژ بێتەوە، شاشەی چی، سەروەر هەستی دەکرد ژیانی ڕاستەقینە لەوێدایە و کاتێک دەکوژایەوە هەستی بەتەنهایی و بێزاری دەکرد، هەمان ئەو هەستەی ئادەم هەیبوو کاتێک فڕێیان دایە سەر زەوی. شاشەکە سەد ئەوەندەی قەرات و ناو بازاڕ و باخچەکانیش زیندوو بوو، ئەوەی شاشە دابوویە سەروەر، کەس نەیدابوویە.

ئەو ڕۆژەی زەرگەکەی سەروەر ئەوەندە درێژ ببۆوە خەریک بوو بگاتە شاشەکە، هەر کە گوێی لێ بوو سوهێر گوتی، "جگە لە دڕاندنی دەرپێکەم ڕێگایەکی دیکە هەیە بۆ لابردنی،" مەبەستی لەجیاتییی دڕاندنی داکەندنی بوو، کەچی ئەو پیاوە دڕندە هەر پەلەی بوو، هەر ئەو لەشەی سەروەر کە تا شاشەکە درێژ ببۆوە فیچقەی کرد و پشتەملی کوڕەکەی پێش خۆی سواغ دا. کوڕە ئاوڕی دایەوە، پێش ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، دەستی بۆ پشتەملی خۆی بردبوو، لە لینجاییەک سڵەمیبۆوە، دەستی لێ نەدابوو، کە سەروەری دیت تاریکییەک لەناو تاریکیدا، بەو هەموو نابووتییەوە، دیسان دەستی بۆ پشتەملی خۆی بردەوە. شتێکی لینج و گەرم، لینج وەک هێلمی دارتاشەکان بە دەستیەوە نووسا.

کوڕە هەستا دەستی سەروەری گرت و بردیە دەرێ،

سەروەر هەر چاوی لەسەر شاشەکە بوو، لەو کاتەدا سوهێر ڕەمزی بە نووکە پێیەک ئەو هەموو ئاوەی بە شاشەکەدا کردبوو، دەنگی پێکەنینە شەهوەتبازەکەی لەگەڵ خۆی بردە دەرێ. سەروەر دیتبووی، بەڵام نەیدەناسی، ئەو پێشتر نەوزادی عەزەی نەجاڕی نەدەناسی، جا ئەو کێی دەناسی؟ نەوزاد دوو کوڕی دیکەی لە خۆی زلتری لەگەڵ بوون، دەستی سەوەری گرت و بای دا، سەروەر سووڕا و ئەو لەدواوە خۆی پێوە نا، سەروەر هەر وای زانی دەیەوێ چەند مستەکۆڵەیەک لەدواوە لە پشتی بدات، تا هەستی بە قورسی لەشی نەوزاد و شتێکی ڕەق کرد لەناو ڕانیدا، ئەوەندەش غەشیم نەبوو نەیناسیێتەوە، ئەگەر سەروەر ئەوەندە ڕەش نەبایە دەکرا دەموچاوی سوور بێتەوە، بەڵام نا، سوور نەبووە، مۆر بۆوە، خۆی ڕاپسکاند و دەستی خۆی ڕزگار کرد، بە هەرسێکیان بردیانە ئاودەستەکان، نەوزاد گوتی، "داک قەحپە دەسرەکەت دەر بێنە و پشتەملم بۆ بسڕەوە، تەڕی بکە جا پێی بسڕەوە، نەگست کردم."

وەختێک سەروەر دەسرەکەی تەڕ کرد و پشتەملی نەوزادی خاوێن دەکردەوە، یەکێکیان لەپشتەوە دەستێکی بۆ قوونی برد، سەروەر ڕاچڵەکی و بۆ لایان سووڕا، ئەوی دیکەیان قوڕقوڕاگەی گرت و بە دیوارەکەیەوە نووساند، سەروەر هەناسەی گیرا و لرخەلرخی پێ کەوت. سەروەر زانیی بەو دێوانە ناوێرێ گریا، تاڵی گریانی بێدەسەڵاتی و تەسلیمبوون چووە ناو قووڵاییی ناخیەوە، وەختێک لاقی ڕادەوەشاندن خۆی ڕزگار بکات گریا، نەوزادی عەزەی نەجاڕ کە دەستی بە سمتیدا دێنان گوتی، "بەڕەڵڵای کەن ،

وازی لێ بێنن تورکومانی حیز قوونی گانیشی نییە."

با هەر جنێو بدەن، بێئەخلاقی سەرسەرییانە، تەنها وازی لێ بێنن بەسە، واشیان کرد، نەوزادی عەزەی نەجارڕ گەڕایەوە ناو هۆڵی سینەماکە و لای سوهێر ڕەمزی، دووەکەی دیکەیان تەماشایەکی یەکیان کرد، کراسڕەشەکەیان چاوێکی لەوەکەی دیکەیان داگرت، ئەو چوو دەرگای ئاودەستەکانی داخست، چەقۆیەکی نووکتیژی دەر هێنا، لەسەر کەلەکەی سەروەری ڕاگرت، کراسەکەشی کون کرد و نووکە تیژەکەی گەیشتە سەر پێستی، دەشێ بڕیبێتیشی، گوتی، "پانتۆڵەکەت داکەنە، با جەرگت کون نەکەم."

کراسڕەشەکەیان کە چووبووە ئاودەستەکەی ئەوسەر گوتی، "ئەسعەد بیهێنە بۆ ئێرە، مەیکە بە دەنگەدەنگ."

بردیانە دوائاوەدەست، سەروەر نەیزانی چۆن، بەڵام قاییشی پانتۆڵەکەی پچڕابوو، پانتۆڵەکەیان داکێشایە خوارێ، کەوتە سەر پێڵاوەکانی، سەد جار لە ماڵێ بە دایکی گوتبوو ئەو پانتۆڵەم شلە لێم دەکەوێ، دایکی لە باتی ئەوەی کەمەرەکەی بۆ قارس بکات، بەو قاییشە بۆی توند کردبوو. سەروەر پەشۆکا، تەزی، ناخی، دڵی و شەرەفی تەزی، کەرامەت و ڕۆحی تەزی، ڕاچڵەکا، خێرا داهاتەوە پانتۆڵەکەی هەڵکێشێتەوە، ئەو، ئەو گورگە کراسڕەشە کارا بوو، ئەو داهاتنەوەی بەزایە نەدا و ڕاست، خۆی پێوە جووت کرد، شتێک، وەک ئاگر و باروت و چەقۆ ڕیخۆڵەکانی بڕی، پێستی، گۆشتی، لێواری دڵی زیرەی لێ هەستا. دوای ساتێک، سەروەر نازانێ، سەری بەر کاشییە سپییە بچووکە چوار گۆشەکانی ئاودەستەکە کەوتبوو، کەوتبووە سەر ئەرزەکە، دوای ساتێک

لەناو میز و گووی خۆیدا بەئاگا هاتەوە. قوڕگی، دەنگ و هاواری و هوروژمی بورکانێکی تێدا وەستابوو، هاواری کرد تا فیلم و ساپیتەی سینەماکە و دیوارە نەگریس و چڵکنەکانی ئاودەستەکە و ڕۆحی خەڵکەکە و هەموو شار بەسەر خۆیدا بڕووخێنێ، هاواری کرد تا دنیا لە ستەم، لە ناداپەروەری، لە کوشتن و ئەتک و ئیهانە بەئاگا بێنێ، هاواری کرد لە حاکمی شار، تا موفتی وڵات، تا پۆلیس و سەرباز و شەرفمەندانی شار بەسەر خۆیدا بڕێژێ. هاواری کرد تا ئەو هەتیوە گڵاوە کراسڕەشە، تا ئەو ئەسعەدە ژەهری مارە ئاگر دا، هاواری کرد لەگەڵ دەمکردنەوەی ڕەشاوێک، هەموو ئەوەی لە منداڵییەوە خواردبووی، لە ژان و دەرد و تاعوون، هەموو ئەوەی خواردبووی، هەموو ئەو نان و چێشتەی لەسەر سفرەی بابی خواردبووی، شیرە خەست و سپییەکەی مریەمی دایکی، ئەوەی ببووە خوێن، ببووە کەرامەت و کبریا لەگەڵ ڕەشاوێکی تاڵ، تاڵ و پڕدەرد و خوێناوی لە دەمی هاتە دەر و دیواری ئاودەستەکەی ڕەشتر کرد.

وەک سوپایەکی شکاو، سوپایەک خوێنی دنیای لە بەر ڕۆیشتبێ، سوپایەک ئەتکی شەرەف و سەرکردەکەیان کرابێ، سوپایەک لەبەر گرانی مەیتەکانی سەر شانیان، لەبەر بەزین و دۆڕان، ئەوەندە قورس بووبێ لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا زیاتر و زیاتر بە زەویدا بچێ، زەوی خاکی پڕنهێنی نەتوانێ هەڵی گرێ.

سەروەر بە بارێکی قورسترەوە، بە دۆڕان و بەزینێکی بێوەسفەوە، بەسەر قەلاتێ کەوت، خۆ ئەو قەلاتە خاک نییە، خاکێکی پڕژیان و زیندوویەتی نییە وەک زەوی لەژێریەوە

دەریا و شاخ و ئاسن و بارووت و زێڕی تێدا بێ، ئەو قەڵاتە گڵە و وەسەر یەکنراوە، چەوی بێپیت و فەڕ خراوەتە سەر یەکتر، دەنا دەبوو ئەویش لەژێر باری قورسی سەرشانی سەرووەردا، وردەوردە ڕۆچووبایە و دیار نەمابایە، کە هیچ نەبا ئەو ئێسکوپروسکە بێشەرم و ئەتککراوەی سەرووەریان بۆ ئەبەد شاردبایەوە. بە هەنگاوی شکاو سەرکەوتە سەرێ، تووشی کەس نەبوو، دەشێ تووشیش بووبێ، ئاوڕێکی بۆ لای سەرایە دایەوە، سەیرێکی کۆڵانی ئاغالار کوچەسی کرد، نا نەچوو، بەلای تۆپخانەیدا بای دایەوە، دەمێکە تۆپەکە نەماوە، تۆپە ڕەش و ئاسن و مسەکە، تەنها ناوی لە یادەوەریی گەڕەکدا مابوو، ئەویش بە گرمە و ناڵەی زارووی منداڵی ناو لانک و ژنی زەیستان و نەخۆشی بردبوو، ڕۆژێک لەسەر قسەی خەڵکی گەڕەک دەمیان بۆ هەمیشە قەپات کرد، دواتر بردیان و نەما. سەرووەر حەوسەڵەی ئەوەی نییە گوێ لە حیکایەتی پیرەتۆپ بگرێ لەسەر زاری عەبۆی قاوەچی، نا حەوسەڵەی ئەوەی نییە باسی ئەو ترس و تۆقینە بکات کە ئەو تۆپە دەیخستە ژیانی خەڵکەوە، ئەوەش لەسەر زمانی دایکی مریەمەڕەشی غازیی کوورەچی، ئەو ڕۆژە چەندی کرد نەیتوانی بیر لە باپیرە غازی بکاتەوە، وەختێک دەستی لەناو باخەڵە قووڵەکەی دەنا و خرینگخرینگ دەرهەمێکی ئاسنی دەر دێنا و دەیدایە. ئەگەر ئێستا غازیی کوورەچی بەو کەتنەی بزانیبایە سەری ئەو هەتیوە کراسڕەشەی دەخستە ناو کوورەکەیەوە. کوا سەرووەر حەوسەڵەی ئەوەی هەیە باسی ئەوە بکات چۆن لە کاتی ترسدا خۆی لەژێر شاقەلی فش و درێژی باپیرە غازیدا دەشاردەوە، خۆی بە دەرپێ سپییەکەیەوە دەنووساند.

چووە حەرەم کوچەسی و بە بەردەم ماڵی سەید وەقاسدا سووڕایەوە، هاتەوە دیوی بازاڕی و لەپشت ماڵی ئەمیری سەقاو، پشتی بە دیواری ماڵی کابرای تووتنچییەوە دا و ڕووبەڕووی خۆرنشین دانیشت. چەند جار ویستی لەو بەرزییەوە خۆی بەر بداتەوە، وەک ئەوەی لاقی بترازێ، لاقی خۆیشی ترازاند و ڕەتڵی برد و چەند هەنگاوێک گیرسایەوە. تا ئێستا نەی بیستووە کەسێک بە هەر بیانوویەکەوە بێ خۆی لە قەڵاتێ هەڵدابێتە خوارێ، شەقامەکە باریکتر دیار بوو، ئەو ڕێک کەوتبووە ئاستی سەر دوکانەکەی مام گیو. ڕێک سەر دوکانەکە نا، نا لەسەرەوە، لەپشت ماڵی مام حوسێنی تووتنچی، ڕێک بە ئاراستەی دوکانەکەی مام گیو دانیشتبوو، پاڵی بە دیوارەکەی ماڵی مام حوسێنەوە دابوو، هەر بە ڕاستی بۆنی تووتنی دەکرد، بۆنی تووتن یەکەم بۆن بوو بەسەر بۆنی گوو و میز و ڕشانەوەی ئاودەستی سینەماکەدا زاڵ بێ.

لە پەنجەرەکەوە بۆنی تووتن دەهات، سەروەر نەیدەزانی، بەڵام مام حوسێن دەیزانی، بۆ ئەوەی فەردە تووتنەکان شێ هەڵنەهێننەوە دەبێ جارجار ئەو ڕۆژانەی دنیا گەرمە، یان فەردەتووتنە گەرم داهاتووەکان هەڵگێڕ و وەرگێڕ بکرێن، دەشبێ پەنجەرەیان لەسەر بکاتەوە، بەتایبەتی ئەو ڕۆژانەی ئارەقەیان دەکردەوە، مام حوسێن زۆر جار بە ژنەکەی دەگوت، "تووتن وەک ئینسان وایە ئارەقە دەکاتەوە و گەرم دادێ، ئاگات لێ نەبێ گەڵاکانی ڕەش و بێهێز و چرچ دەبن و دەسووتێن."

سەروەر لەو ڕۆژەوە بۆنی تووتنی خۆش ویست، بۆنی

گیا و درەخت و ڕووەک چەند لە بۆنی پیسی ئینسان جیاوازە. دەشێ عەشقی بۆ جگەرە لەو ڕۆژەوە بووبێ، نەک لە بازنە دووکەڵەکانی سەردارەوە. سەروەر هەموو توتنێک ناکێشێ، زۆر حەزی لە جگەرە پێچانەوەیە. دواتر زۆر دواتر جگەرە قامیشەکانی بۆ بابی لەسەر سینییەکی خڕ ڕیک دەخستن و بە پشتێنێکی باریکی بازنەیی دەیبەستن و توتنی بەسەر وەر دەکردن، سینییەکەی هەڵدەتەکاند تا پڕی دەکردن لە توتن، کە پێشتر وردوردی کردبوو. هەم توتنەکە دەچووە ناو سیغارە ئامادەکراوەکان کە پێیان دەگوت جگەرەی قامیش یان زەل، هەم تۆزێکی نەرم و ورد لەسەر سینییەکەوە دەکشایە سەر سەر و چاوی سەروەر و ئەویش هەناسەی توندی هەڵدەمژی. هەموو بۆنێک لای ئەو بە بۆنی توتن لەناو دەچێ.

خۆر بەرەو ئاوابوون دەچێ، ئەو لە دڵەوە دەستی لە ژیان هەڵگرتبوو، لە دڵەوە دەیویست تاریکی بە جارێک و بۆ هەمیشە تەمەنی ئەو داپۆشێ و چاوی بە ئینسان نەکەوێتەوە. خۆر لەو کاتانەیساڵدا، لە ئێوارانداء یەک پارچە ئاسۆ دەکاتە خوێن، سەروەر هەر لە قسەی سەید وەقاسەوە وا تێگەیشتبوو، "لەوسەری دنیا کوشت و بڕینە، خوێن ڕشتن و کەلاک خستنە سەریەکە، لەوسەری دنیا." هەر سەید وەقاس دەیگوت، "لەکوێی دنیا دڵسۆزی و حورمەت وەک هەولێر ماوە، لەو حیجازەش نوێژ و خوا پەرستی هێندەی هەولێر ناکرێ، کوا شارێکی دیکەی خاوێن وەک هەولێر لە سەرانسەری دنیا دەست دەکەوێ." سەید وەقاس قسەی بۆ موریدەکانی دەکرد، "لێرە پیاوی بە نفوس و زار و بەهەیبەتمان

هەیە، حورمەتی ئەوانە ئاهونفوسی ئەوانە، بڕۆ ئەو موسرەی، ئەوەتا چەند مەترێک لێرەوە دوورە، من نەچووم بەرانەکینی بیستوومە، گەڕەک و ناوچەی وایان هەیە هەر هەموو ماری فاحیشە و خراپن، دەتەوێ بچیە هەر مارێک بە دوو دیناران بچۆ، هەر ئەوێنا بەغدا، لەوسەر بۆو سەری دیجلە جێگای دیسکۆ و ڕابواردنە، مەلهاکانی هەر باس ناکرێ، نە یەکە و نە دوو، نە هەزار، شەو تا بەیانی کەس ناخەوێ، ناوی خوا و پێغەمبەریان لەبیر چۆتەوە، کارەبا، گڵۆپی سوور ئەو خەڵکەی لە دین دەر کردووە، بێئەخلاقی کردوون، من هەر زوو گوتم کارەبا و ڕادیۆ و تەسجیل، نامووس و غیرەت و پیاوەتیمان دەبا، شەرەف بەو خەڵکە ناهێڵێ، باوەڕتان نەکرد."

ساڵێک پێشتر سەید وەقاس ڕاست تەماشای چاوی سەروەری کردبوو، کە لەپەنا بابی وەستابوو، گوتبوی، "ئەو سینەمایانەش گەنجەکانیان هەموو لە ڕێ دەر کردووە، بزانە ئەو گەنجانەی خوویان دایتە سینەمای ئەگەر نامووسیان لەسەر دانەنا من سەید وەقاس نیم."

سەروەر هێشتا پاڵی بە دیواری ماڵی مام حوسێنی توونتچییەوە دابوو، خەڵکی بە کۆمەڵ و تاک و جووت بە بەردەم دوکانەکەی مام گیویدا تێدەپەڕین، لەو سەرەوە نەیدەتوانی بەباشی لێیان بڕوانێ، ئەوان بچووک و وردیلە دیار بوون، بەڵام سەربەرز و بەهەیبەت کەس ئەتکی نەکردبوون، کەس پانتۆڵی لە پێ دانەکەندبوون، کەس قاییشی پشتی بە چەقۆ هەڵنەبڕابوو، تەنها ئەو، تەنها ئەو و کەسێکی دیکە نا، فڕێ دراوەتە ناو دورگەیەکەوە کە ناوی دورگەی بێناموسی

و حیزییە. لەگەڵ وشـەی حیز تاسـا، تاسا و ڕاچەنی، ڕاچەنی و گوێی لێ بوو هەموو دنیا بەسـەریدا هاوار دەکات، "تـازە تۆ حیزبووی. "بچێتە هـەر شـوێنێک دەبێ سەرشۆڕ و ملکەچ بێ، لـە هەمـوو شـەڕێکدا دۆڕاو و بەرامبـەر هەمـووان بەزیـو. حیـز هەرگیـز نابێتە خاوەنـی کەرامـەت، خاوەنـی نـاو و سـەربەرزی، نابێتە خاوەنی غیـرەت، هەتـا نابێتـە خاوەنـی خۆشی.

لـە چرکەیەکـدا هەمـوو ئـەو قسـانەی بیـر کەوتـەوە، هـەرزەکار و قوتابـی و کێشـکەفرۆش و خەڵکـی گـەڕەک بـە حیزیـان گوتبوو. ئـەوەی حیـزی بـکات دزییش دەکات، کەسێک وەفـای بـۆ قوونـی خـۆی نەبـێ، بـۆ کەسـی نابـێ، حیـز وەفـای بـۆ دایکـی خـۆی نییـە، حیـز نیشـتیمانی خـۆی، شـەرەفی خـۆی دەفرۆشـێ. سـەدان دەنـگ وەک سـەدان زەردەواڵـە گیزەیـان بـە گوێچکەیدا دەکرد، پێوەدانیشیان زۆر لە ژەهری زەردەواڵەکان بـە ئازارتـر بـوو.

هـەر وا دانیشـتبوو، لـە مـردن ناخۆشـتر ژیانـە بـە دەروونێکـی شـکاوەوە، دوکاندارەکان وردەوردە قەپەنگەکانیـان دێنـا خـوارێ و دوکانەکانیـان قفـڵ دەدا، هەسـتی بەفێنکـی و لەزەتـی ئـەو ئێوارەیـە نەکـرد، شـەوانی قەراتـێ لـە شـەوانی لەندەن خۆشترن، کزەبایـەک لـە گەردنـی قـەلات دەدات و بۆنـی گـوڵ و گیـای تـەڕ و کەسـک بەنـاو کـۆڵان و سـەربان و هەتـا حەوشـەی ماڵـەکان و ژوورە نسرمەکانیشـدا بـڵاو دەکاتـەوە. هـەر وا تۆزێکی کـە کچـە پەنیرییەکـەی حاجی عەلی پندر پەردە شینەکەیان، بە دەوری تەختـە خەوەکـەی سـەربانیاندا دەگرێ. هەمـوو کچـە باڵـق و عازەبـەکان دەچنـە سـەربانی خۆیـان و لـە دەوری تەختـەکان پـەردە دەگرنـەوە، پـەردەی سـوور و سـپی

و شین و زەرد، هەموو ڕەنگێک، پێش ئەوەی بابیان بێتەوە، دەوری تەختە خەوەکان و سەربان و حەوشەی ماڵیان هەموو ئاورشێن دەکەن. سەروەر شاگەشکەی شەوانی قەرات و بۆنی ئاورشێن بوو، بە تایبەتی بەهار و هاوینان و سەرەتای پاییز، ئەستێرەی هەموو دنیا لە دەوری ئەو چەند ماڵەی قەراتێ گرد دەبوونەوە، سەروەر پێی وا بوو ئەوانیش حەز دەکەن، ئەو ئەستێرە بریسکەدارانەش حەز دەکەن ماڵیان لەسەر قەراتێ بایە. ئێواران بابیان بە خۆی و شوتییەکی بەستێ بێتەوە، یان بابیان بە بۆنی گندۆرەی دێمییەوە بێتەوە، هەر لە دوورەوە بەرەو ڕوویان غاردەن، لە سەربانی یان لە حەوشەی، لەپەنا بۆنی ئاورشێنی بۆنی برنجی پەشمەکی و نان و ئەو چایەدێمکراوە بێت و ئەویش، ئەو ئەستێرە دوورانەش حەز دەکەن، سەر بە ڕانی بابیان کەن و گوێ لە ڕادیۆ بگرن.

سەروەر نەیزانی چۆن وێراویەتی لەو حەیاچوونەدا بیر لە بابی بکاتەوە، بابی مەحموود بەڵک، ئەوەشی پێ سەیر بوو بۆچی بە بابی دەڵێن بەڵک و نارێن مەحموود بەڵەک، لەو بیرکردنەوەی خۆی تاسا و بەتوندی گوڕی دایە خۆی، خۆی هەڵدێرێ، خۆشی بەر دایەوە، لە پشت ماڵی مام حوسێنی توتنچی خۆی هەڵداشت، وا خۆی هەڵداشت ڕاست بە سەر دوکانەکانی بن قەڵاتێدا بکەوێتە ناوەندی جادەی، لەوێش بەختی هەبێت و لەو کاتەدا قادر جیمسی بە خۆ و ترومبێلەوە بەوێدا بێت و پانی بکاتەوە، بەوەش نەک غەمبار نابێ ئاسوودەش دەبێ.

گلۆر دەبۆوە، هەولێشی دەدا خۆی بگرێتەوە، وەک

ئەوانەی دوای چرکەیەک لە گڕلەخۆبەردان بۆ خۆکوشتن هەوڵی خۆڕزگارکردن دەدەن. سەروەر ببووە یەکەم کەس کە خۆی لە قەڵاتێ هەڵداشتووە، یەکەم کەس دەبێ، کە ئەو ڕەنگە بۆ خەڵکی بڕێژێ، کە دەشێ ئەو قەڵاتە چۆن دەکرێ بۆ ژیان بەکار بهێنرێت، هەر واش دەکرێ بۆ خۆکوشتنیش سوودمەند بێ. لە تلی سێیەم و چوارەمدا ئەوەندە تیکە بەرد و کەرسەک بەر ڕوخساری کەوتبوون هیچی نەدەدی و لە تلی شەشەمدا دنیا لە بەرچاوی دەسووڕا و خۆر بەڕاستی وەک سەید وەقاس دەیگوت خوێنی ئینسانی لەتوپەت سووری هەڵدەگەڕێنێ. لە تلی هەشتەمدا بوو کەوتە ناو خەندڕکێک یان چاڵێک کە باران دروستی کردبوو، ئەویش فڕێی دایە سەر بەردێک، سەری تەقی، تەقینێک وەک کودی وشکەوەبوو شەقبەرێ، کەوتە سەر بەردێکی دیکە و لینجاوێکی خەست لە دەمیەوە قوڵپەی کردە سەر جل و کراسەکەی.

سەروەر دەنگی، "ئاگات لە خۆت بێ."ی نەبیست، دەنا دەیزانی ئەوە سەید مەردانە، سەید مەردان تاکە دۆستی بابی بوو، هەموو جارێ دایکی دەیگوت، "مەحموود ئەتوو ئەوەندە لادین، نازانم سەید مەردان لۆ ئەوەندەی خۆش دەوێ."

مەحموود بەڵەک تەواو لادین نەبوو، هەر ئەوەندە حەزی لێ بوو ئێواران لەگەڵ ئەحمەدی قەساب و ئامۆزاکەی چەند پێکێک هەڵدەن، جارجاریش لەگەڵ مستەفا مێخەی ناتر لە حەمامەکەی عەبدولڕەحمان ئاغای قەساب یان لە ژوورەکەی پشت توونی حەمامەکە سەرگەرم کەن.

سەید مەردان کە دەنگ و سەدای خۆشی، گۆرانی و چریکەی، سەڵاوات و بانگی بە هەموو ژوور و کونوکەلەبەرێکی

قەراتێدا چووبوو، نیوەی ژنی قەراتێ هەر بە بیستنی دەنگی سەید مەردانی دەگریان. بەشی زۆری فەقێی ئەو شارەی هەر لەبەر خاتری وی حەزیان چووە بانگدانێ، لای ئەو فێری قورئانخوێندن بوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک شەوان سەید مەردانیان دیوە، ئەوەندە بیری مەحموود بەڵەکی کردووە ناچار چۆتە ژوورە پڕبۆنەکەی مستەفا مێخەی ناتر و بەرامبەریان دانیشتووە تا لێ بوونەتەوە. مێخە ئەوەیشی درکاندووە کە شەو شەوە لەبەر خاتر مەحموودی لێویشی تەڕ کردووە. سەروەر گوێی لێ بووە بابی بە سەید مەردانی گوتووە، "شین و شایی دەستەوایی." سەیدیش بەتوانجەوە پێی گوتووە، "ڕەمەزان نزیک بۆتەوە." مەحموود بەڵێنی دەدایە، "هەموو نوێژەکان لەپشت تۆوە دەکەم، یەک ڕۆژوشی لێ ناخۆم."

ئەو ڕۆژەی سەروەر خۆی گلۆر کردەوە و لە تلی هەشتەمدا سەری بەر بەردێکی بارانکونکردوو کەوت و وەک کودی تەقی، گوێی لە هاوار و دەنگی سەید مەردان نەبوو، "کوڕە ئاگات لە خۆ بێ خۆت بگرەوە." لە دەنگی وی، دوو کوڕەکەی مام حوسێنی تووتنچی بە لینجی و بۆنی تووتنەوە هەر لە پەنجەرەیڕا خۆیان هەڵدایە ئەودیوی و بەغار گەیشتنە لای سەروەری، سەروەر تۆزێکی باڵا هەبوو بەس بەحاڵ چل کیلۆ دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرخستنی بۆ سەرەوە ئاسان نەبوو، سەید مەردان چەند هەنگاوێک هاتبووە خوارێ، کە کوڕەکان سەروەریان هێنایە سەرێ، جا ناسییەوە و گوتی، "ئەوە چ بەرایەک کوڕەکەی مەحمموودی گەیاندۆتە ئێرە!"

کە گەیشتنەوە کۆڵانی ئاغالار کوچەسی کچە پەنیرەکەی حاجی عەلی پندر لە سەربانەوە چاوی پێ کەوت و ناسیشیەوە، کوڕە گەورەکەی مام حوسێنی تووتنچی لە کۆڵێی کردبوو، هەر لە سەربانەوە هاواری کرد، "یایی مریەم، یایی مریەم، وەرە بگەیە، بزانە سەروەر چیی بەسەر هاتووە، لە پشتی ئەو پیاوانەیە." لەو دەنگە سەروەر نا، بەردێکیش چاوێکی هەر هەڵدێنا، سەرووەریش چاو هەڵێنا، چاوە ڕەشە گەورەکانی تەواو هەڵێنان، وەک برژۆڵە درێژەکانیان پێ قورس بێ، لێکی نانەوە.

لەو کاتەدا مریەم بەڕە دەستچنەکەی دایکی مەحموودی بەدەستەوە بوو، دەیویست بیتەکێنێ و بیباتە تەنیشت تەختە خەوەکەی ڕای بخا. گوێی لە دەنگی ترساو و لەرزیوی کچەکەی قادر پندری بوو، "سەروەر چیی بەسەر هاتووە." ئاخر مریەم لەوەتەی هەیە لەو چەند چڵ ئێسقانەی سەروەری ترساوە، منداڵێکی باریک و دەردەدار، سەرپێکەوتنێکی زەرد و لەرزۆک، لەرزوتا و نەخۆشی، مێکوتە و خروێلکە، سەروەر لە بەردەم ئەو هەموو دڕندانە ڕزگاری ببوو، ئێستا چی لێ بەسەر هاتووە لە پشتی خەڵکە؟ بەغاردانەوە بۆ دەرێ چوو، پرسیی، "کوا، کوا سەروەر چ دەردیەتی؟"

سەید مەردان کە هێشتا لێوە خوێناوییەکانی سەوەری دەسری، گوتی، "هیچ نییە، بەر بۆتەوە."

هەر لە هەیوانێ بەڕەکەیان بۆ ڕاخست، مەحموودیش گەیبۆوە، سەید مەردان دەمی بۆ خاوێن کردەوە، پشتە سەری بۆ تیمار کرد و جوان پێچای، زاخ و مێخەکی لەسەر ددانە شکاو و بە خوێنەکانی دانا و گوتی، "مەحموود

کوڕەکەت چ بەڵایەتی؟ تلێکی دیکە گلۆر بایەوە دەکەوتە خواریێ و ترومبێل دەیان شێلا.“

لەگەڵ ئەو قسانە مریەم قاییشە بڕاوەکەی لە پانتۆڵەکەی سەروەر دەر کێشا، مچوڕکەیەک بە لەشی بێگیانی سەروەردا هات. چاوی هەڵێنا، کچە پەنیرییەکەی حاجی عەلی پندر لە سەربانەوە تەماشای دەکرد. ئەو جارە سەروەر بەڕاستی گیانی تێدا نەما و بوورایەوە، ئەوەش دواجار بوو بتوانێ ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانی ئەو کچە پەنیرییە بکات، کە ژیانی بە کۆڵانی ئاغالار کوچەسی و سەربان و پەردەی تەختی خەو و ئاوڕشێن و ئێواران دابوو. کەس نەبوو لەو قەراتەی عاشقی ئەو کچە پندریە نەبووبێ، ئەویش جگە لە بەلەکێکی سپی و پەروەردە دەماری ئاڵ هیچی نەدابوونێ. چاوێک و لەتە دڵێکی خوشکانەشی دابووە سەروەر، ئەویش تەنها لە سۆنگەی ئەو هەموو سۆز و پەرۆشییەوە بوو لە هەناسەی مریەمدا هەستی پێ کردبوو.

ئەو شەوە سەید مەردان بە دەنگێک لە قووڵایی دڵی مەحموودیەوە هێنابوو، دوو سوڕەت و هەندێ وردە ئایەت و دوعا و نزایەکی زۆری لەسەر سەروەر خوێند. کە چاوە پڕئاوەکانی مەحموودی دیت لاواندنەوەکەی بەیتی سەیدەوانی بە دەنگەوە گوت. تا ئەو ڕۆژە کەسێک ئەو دەنگەی سەید مەردانی بەو تەڕ و بارانەوە گوێ لێ نەبووە. دەنگێک ئەوەندە پڕگریان ئەوەندە ئارامکەرەوە. ژنەکان بێدەنگ لەسەر گوێسەبانەوە گوێیان گرتبوو، پیاوەکان لە حەوشەی دانیشتبوون، جگەرەیان دەپێچایەوە، لەسەر هەست بوون، دەنگەکە شەق بێت و درزی تێ بێت و ببێتە ناڵە و

ئەوان بچن گۆڕ بۆ سەروەر هەڵبکەنن. دەنگی سەید مەردان بەو هەناسە کز و لێدانە هێواشەی دەماری ملی سەروەرەوە بەند بوو، خەڵکەکەش بە دەنگەکەوە، سەروەر بێئاگا لاقی درێژ کرد، دەمارەکە نزمتر و دەنگەکە پچڕپچڕ و ئەژنۆی مەحموود بەلەکی شلتر.

ژنەکان گریەکی تاڵ و قورس و گەورەی گریانیان لە ئەوکی گیر ببوو، سێوەکەی قورقوڕاگەیان ئەوەندەی دیکە دەر پەڕاندبوو، مردنێکیان دەویست بۆ تەقینەوە. سەید مەردان دەڕوانێتە چاوی بێئومێد و نیگەرانی هاوڕێیەکەی و دەڵێ، بە دەنگ و گۆرانییەوە دەڵێ، "کوڕەکەم، نەمامی باغی قەراتێ، دە چاوێکی هەرێنە، با ئەو ئەسپە برینداڕەی دڵی من، وەکی داری وشکی بیابانێ کەمە ئاوێکی بگاتێ،" مریەم کە هێشتا ئاوا ڕەش نەببوو، قوڵپی گریانی قوڕگی، بلقی دا. لەگەڵ خواردنەوەی خەریک بوو هەردووک چاوی دەر پەڕن، سەید مەردان بەردەوام بوو، "کوڕەکەم، شلکە کورەکەی گەڕەکی سەرایە، دەپاڕێمەوە لە بەرقاپی خودایە، نزام دەبەمە بەر مەرحەمەتی ڕەسورەلایە، چاوێکی لە داکە جگەرسوتاوەکەت بکە، بۆ خاتری هەر چی یار و یاوەری غەوسی ماڵ لە بەغدایە، دەچاوێکی لە داکت بکە لە ئێشی تۆ چاوی هەڵنایە."

پیاوەکان تەماشایەکی یەکتریان کرد تێگەیشتن، کوڕە تەڕەزانەکەی حاجی خاڵیسی بەننا، عەبدوڵای خەلیفە، یونسی حاجی عەلی پندر هەستان و دەستیان خستە سەر شانی مەحموود بەلەک، "برای ئێمەش بوو." وەک دڵنەوایی و هاوبەشی غەم، بە چاوێکی غەمبار و تەڕ و خۆڕاگرانەش،

مەحمـوود چـاوی داخسـت، بـۆ ورە و هێزێـک دەگـەڕا لـە ناخـی خۆیـدا، لێـوی جووڵانـدن دەم بکاتـەوە، لـەو تاسـان و تەسلیمبوونەدا، مریەم کە جارێ ڕەش نەببوو، هێشتا خاتوونە خوێنگـەرم و ئەسـمەرەکەی مـاڵ بـوو، بەرگـەی ئـەو گریێـە قورسـەی قوڕگـی نەگـرت و قوڵپـەی گریانـی وەک شـریخەی دادڕانـی ئاسـن هەمووانـی شـڵەقاند، یەکـەم جـار دەنگـی سـەید مەردانـی سـڕییەوە، جـا چاوەڕوانـی ژنەکانـی دیکـەی کۆتاییـی پـێ هێنـا.

تاکـە کەسـێک نەجـووڵا و ئـارام وەک هەمیشـە مایـەوە، تاکـە هەسـت و سـۆزێک نەتەقیـەوە و وەک خـۆی بێدەنـگ و کـپ، مەحمـوود بەڵـەک نەبـوو قـەرات بـوو، خـاک و بـەرد و خانـووە کۆنەکەیـان بـوو، ئەویـش نـەک لەبـەر ئـەوەی بەهێـز بـوو، یـان بێهەسـت و سـۆز بـوو، نـا، لەبـەر ئـەوەی سـەدان جـاری دیکـە ، هـەزاران جـاری دیکـە، ئـەو گریـان و هـاوارە، ناڵە و مردنـی بەسـەردا کرابوو، لەسـەر سینگی غـەم و مـردن کەڵەکە ببوو، تـۆپ و شەسـتیر جەرگـی بڕیبـوو، سـەلکە زەلام بە گەردنیدا گلۆر ببۆوە، ئیدی قەرات حەوسەڵەی ڕاچڵەکانی دیکـەی نەمابـوو، نەیدەپڕژایـە سـەر مردنـی هەرزەکارێک. زۆر لـەو ژنانـەی لـەوێ بـوون، لەوانـەی بسـکی خۆیـان دەڕنیـەوە، دەشـێ سـەروەریان نەناسـیبێ، دەشـێ جارێکیـش چاویـان پـێ نەکەوتبـێ، بـەڵام ژنـی ئـەو قەراتـەی ئەوەنـدە دڵشـکاون، ئەوەندەیـان پەنجـە بـە چاویـدا کـراوە، ئەوەنـدە کەسـوکاری ئازیزیان لەدەست داوە، بیانوویەکیـان دەویسـت، تـا فرمێسـکی داوەسـتاویان بتەقێتـەوە.

ئـەو ئێوارەیـەی سـەروەر مـرد، ئـەو ئێوارەیـە نـا، تـۆ بڵـێ

ئەو شەوەی سەروەر مرد، وەک شەوەکانی دیکە پەردە بە دەوری تەختە و جێخەواندا گیرابۆوە، هەندێک سەربانیشیان ئاوڕشێن کردبوو، ماڵە نزیکەکان، هەتا دوورەکانیش ئەوانەی دیوی ئارتلریوقش، قادرمەکانی ژنان، دەنگی گریانی ماڵی مەحموود بەڵەکیان بیست، هەتا تەکیەش گوێیان لێ بوو، تەنها ئەو چەند ماڵەی دیوی دەرگای ئەحمەدی بێباک و ئارام تەماشای گڵۆپەکانی ئۆردووی سەربازانیان دەکرد. لەناو ئەوانیشدا کراسڕەش و ئەسعەدی هاوڕێی وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ، بێغەم لە سەربانی پاڵیان دابۆوە و لە ئاسمانی قەراتییان دەڕوانی، ئەوان جگەرەیان دەکێشا و لەپەنا ئەستێرە بێشومارەکان و لە قووڵاییی تاریکیدا ئەو منداڵە تورکومانە سپی و خرپنانەیان دەدی، کە بە ڕۆژ بۆسەیان بۆ دەنانەوە، بەڵام چ سوود خۆ بابیان ڕێیان نەدەدان بستێک لەگەڵ ئەوان لە دوکانەکانیان دوور بکەونەوە.

هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات ئەوە هەرزەکارێک، قوربانییەکی دەستی ئەوان، سەروەرێک خەریکە گیان بدات، ئەویان هەر لەبیر چووبۆوە، کە لە ئاودەستی ئەو سینەما نەفرەتییەدا چییان لەو کوڕە کردووە. ئەوان هەر خەریکی قووڵاییی تاریکییەکە بوون کە گوێیان لە دەنگێک بوو، بانگ دەکات، "ئەسعەد، ئەسعەدی نامۆبارەک،" لەناکاو ئەسعەد ئەوەی بیر کەوتەوە چییان بەسەر ئەو کوڕە هێنا، کراسڕەشیش کە هەموو دەموچاوی زیپکەی گەورەگەورە بوو، هەستی بە ترس کرد، ئەو منداڵەکەی بە قوونی ڕووتی جێ هێشتووە. دەنگەکە هیی یونسی حاجی عەلی پندر بوو، "ئەسعەد، ئەسعەد ئەوە مردووی،" ئەو کوڕەی

حاجی عەلی پندر تووڕە و هەڵەشە و کەتە بوو، هەر بۆیەش کەس نەیدەوێرا بەئاشکرا خۆشەویستیی خۆی بۆ خوشکە پەنیرییەکەی دەر ببڕێ. دیسان یونس هاواری کرد، "هەتیمە بیژیە وەرە، بێرەکەش لەگەر خۆت بینە." ئەسعەد لە سەربانەوە هەرای کرد، "چ بووە؟ خاکەنازی لۆ کێندەر لەگەرە خۆ بینم،" یونس گوتی، "بۆ قەبری بابت، هەتیم، سەروەری مەحموود بەڵەکی مردووە."

کراسڕەش نەیدەزانی ئەوەی لە ئاودەستەکاندا جێی هێشتووە ناوی سەروەرە، لەگەڵ ئەوەشدا هەناسەی تەنگ بوو، تۆزێک تاسا، جا ڕاما و پرسیی، "بە چ مردووە؟" یونس دەنگی کراسڕەشی ناسییەوە، گوتی، "ئەتووش لەوێی نەفرەتی؟ هەستە ئەتووش وەرە، ئەو عەردە ڕەقە هەمووی بەردە ئاسان هەڵناقەندرێ،" ئەسعەد پرسییەوە، "بە چ مردووە؟ "یونس لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەویست بیڵێ، چونکە دەیزانی ئەوان کاریان بەو پرسیارە نییە، بەڵام هەر گوتی، "لە قەراتێ هەردێراوە،" کراسڕەشی زیپکاوی گوتی، "نابێ منداری قەراتێ بێ، منداری قەراتێ وەکی بزنە کێوینە، لە قەراتێ هەرنادێرێن."

لە ڕاڕەوەکەی وەستان، ئەسعەد دوو پلیکانە چووە ژوورەکەی خوارێ، تاریک، تاریکتر لە تاریکی، ڕاستە، سەید مەردان ڕاست دەکات نیوەی جندۆکە و خێوی ئەو دنیایەی لەو ژوورە تاریک و نسرم و قووڵانەی قەراتێدا دەژین، کەس نییە لەو قەراتەی خێوی خۆی نەبێ، یان دەستی لێ دەوەشێنێ و شێتی دەکات، هەر شێتە و بە جۆرێک، یان هاوکار و یارمەتیدەریەتی. لەناو تاریکییەکەدا نەوزادی عەزەی

نەجاڕ وەک خێو پەیدا بوو، گوێی لە هەموو قسەکان ببوو، دیسانەوە وەک خێو سینگی کراسڕەشی گرت، "سەگباب ئەوە چیتان لەو کوڕە کردووە، نەمگوت وازی لێ بێنن، ئەوە تووشی قەتڵیش بوون." کراسڕەش کە دڵنیا نەبوو ئەوەی بەردەمی خێوە یان نەوزاد، گوتی، "خۆی حەزی لێ بوو، بەس شەرمی دەکرد، کێ دەڵێ ئەوە مردووە، تا ئێستا کێ بەوە مردووە، ئەوە هەردێراوە."

یونسی حاجی عەلی پندر گەیشتبووە ڕاڕەوەکە، گوێی لە شتێک بوو، دەنگی نەوزادی حاجی عەزەی نەجار بوو، "ئێوە کەسێکتان کوشتووە، بەسەرتانەوە ناچێ." کراسڕەشی زیپکاوی کە دڵنیا بۆوە ئەوە نەوزادە و خێو نییە گوتی، "خۆت شەریف مەکە، بۆ مندار ماوە تۆ سواری نەبووبی، جگە لەوەش ئەوەی ناو ئاودەستەکان باوەڕ ناکەم قەراتی بووبێ." یونس گەیشتبووە ژووری گوتی، "ئەوە لێرە هەرای چیتانە؟ بێشەرەفینە کارتان بە منداری خەڵکەوە چییە؟" نەوزاد گوتی، "هیچ نییە، ئەوە ترساوە و قسە لەگەڵ جندۆکە دەکات."

نەوزاد سینگی هەردووکیانی گرت، "بۆ خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم، بەرام جارێ خاکەنازەکان بێنن."

***

کوڕەکەی حاجی خالس، ئەوانی دیکە چینێکیان عەرز هەڵکەندبوو، یونس دەستی بە دەردانی گۆڕەکە کرد، یەکێک گوتی، "درێژییەکەی مەتر و شەست سانتیمەتر بەسە."

کراسپەشەکە لە فکرەوە چوو دەشێ زۆر بێ، بەڵام یونس گوتی، "با تۆزێک درێژتر بێ، کوڕیچکەکەش دەیەوێ، با بەرەحەتی لە گۆڕەکەیدا ڕاکشێ."

عەبدوڵای خەلیفە ڕووی لە ئەسعەدی کرد، "مەتر و شەست بەس نییە؟ ئەتوو سەرووەرت نەدەناسی."

ئەویش تەماشایەکی کراسپەشی کرد و گوتی، "ئەو دەیناسی، ئەو باشتری دەناسی."

ئەوان هەر لە مشتومڕی خۆیاندا بوون، سەید مەردان چاوی لە ئەژنۆی مەحموود بەڵەک نەدەترووکاند، ئەژنۆی ئەو بشکێ، ژیانی ئەویش دەشکێ و خۆڕاگرتن ئەستەم دەبێ. لەو کاتەدا چاوی بە هورمز کەوت، هورمزی مزەمید، هورمز هەر موزەمید نەبوو، لە سەقاوەکانی قەلاتێ زیاتر ئاوی دەبەشیەوە، بەڵام ئاوی سپی، ئاوی هورمز لە شەربە و بەرمیل نەدەکرا، بە کوندە نەبوو، ئاوی هورمز بە بوتڵ بوو، بوتڵی گەورە و بچووک. خەڵکی ئەو قەراتەی دڵیان وەک سروشت خاوێنە، چەند ئاوی باران بەسەرماڵەکاندا دەڕژێت ئەوەندەش بوتڵی هورمز بەسەر دڵیاندا.

هورمز سەرێکی سووری وەک چەوەندەری هەبوو، هەتا سپێنەی چاویشی سوور بوو. ژنەکان خەریک بوو دەنگیان دەنووسا، کەچی گریانیان بەردەوام بوو، ژن چەند بە دەنگەوە دەگری سەد ئەوەندە لە ناخەوە فرمێسک هەڵدەڕێژێ، ئەگەر ژن بیتوانیبایە فرمێسکەکانی ناخی هەڵڕێژێ، ئیدی زەویەکی بیابان لەو دنیایەدا نەدەما، ئەوەندەش پێویست نەبوو جوتیارەکان دەست بە نزا بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە. ئەوەش حاڵی گەنم و جۆی قەراجی باش نەدەکرد، چونکە فرمێسکی

ژن ئەوەندە پڕئاهوداغە دڕکودالّیش بەرگەیان نەدەگرت.

سەید مەردان هەستایە پێ، هورمز چووە ژوور سەری سەروەر، هێشتا مەحموود بەڵەک وەک بەرد لەپشت سەری، لەسەر ئەژنۆ بوو. سەید مەردان لە بەر خۆیەوە گوتی، "کاری ئەو منداره لە دەنگی من و فریشتەی ئاسمان تێپەڕیوە، ئیدی وەختی کاری هورمز و ئەهریمەنە."

ئەو قسەیەی یەک-دوو جاری دیکەش کردبوو، مەحموود بەڵەک بەو قسە پێکەنیبوو، ئەو دەم نا، پێشتر، هورمزیش، بەلاّم هەر وەلاّمیشی دابۆوە گوتبووی، "ئیدی وەختێک فریشتە کاری چاکی پێ ناکرێ. دەبێ سوپاسگوزاری ئەهریمەن بین."

هورمز وەک سوپاسگوزاری ڕوانییە مەردان، کە جێگاکەی خۆی بۆ ئەو چۆڵ کردبوو، جارێ بۆ مەحموود درەنگ بوو پێبکەنێ، ئەو جارێ بەرد بوو، هورمز ڕوانییە ژنەکان، کە ئێستا ئیدی بێدەنگ ببوون. دانیشت و دەستێکی لە نێوچاوانی کوڕکە دا، هێشتا ئەوەندە سارد نەبوو یەکسەر دەستی بکێشێتەوە. ڕوانییە چاوەکانی، برژۆڵی هەڵدانەوە، شووشەیەکی بچووکی لە لای ڕاستی چاکەتەکەی دەر هێنا، مەیلەوسوور بوو، بن کەپووی کوڕەکەی پێ تەڕ کرد، تۆزێکیشی لە برینەکەی سەر لێوی دا، ئەوانی دیکە نەیاندی، تەنها مەحموود بەڵەک و هورمز دیتیان پێستی ڕووی تۆزێک گنجی کرد، ئەوەش بۆ هورمز کەم نەبوو، هێشتا زەرد بوو، بوتڵێکی بچووکی هێندەی لەپەدەستێک لە باخەڵەکەی بن چاکەتەکەی سەر دڵی دەر هێنا و سەرەکەی کردەوە، بۆنێکی توند بە تامی ژیان بلاّو بۆوە و ختوکەی هەمووانی دا، بە

قەپاغەکەی سەری تۆزێکی لە دەمی سەروەر کرد.

هورمز بۆ خۆی ناوی ئەو قوومەی نابوو قوومی ژیان، یان مەرگ، ئەوە دواتر دەر دەکەوت. دواتر دەر دەکەوێ قوومی ژیانە یان مەرگ. دەر کەوت خێراش دەر کەوت، هەر قوومەکە گەیشتە قورگی و دەر کەوت. سەروەر کۆخی، کۆخی و قوومەکەی ڕشاندەوە، سەید مەردان، ژنەکان، پیاوەکانی حەوشە هەموویان بە یەک دەنگ گوتیان یا ئەڵڵا، هورمز سەری بەرز کردەوە، کوڕەکە بەهۆش هاتبۆوە، سەیری سەید مەردانی کرد، ویستی بڵێ، "با سوپاسگوزاری ئەهریمەن بین." نەیگوت، مەحموود هێشتا بەرد بوو، بەردێک جیلوەی تێ کەوتبێ.

هەواڵەکە هەموو شاری تەنی، مردوویەک زیندوو بۆتەوە، قەبرەکەی سەروەر هەر مابوو، هیی ئەوە نەبوو پیاو، یان ژنێکی تێدا بنێژرێ، منداڵیش نا، سەروەر چاوی هەڵێنان، چاوی لە دایکی کرد، باش بوو بابی لەپشت سەری بوو، هورمز هەموو دەموچاوی بۆ چەور کرد، برینەکەی پشتی، لاقی، سەری، ئیدی مریەمەڕەش کە هێشتا ڕەش نەببوو، دەشێ یەکەم ڕۆژی ڕەشبوونی بووبێ، ڕووە ئەسمەرەکەی گەشبۆوە، خەنی، خودا کوڕەکەی دابۆوە.

کەس نەیپرسی بۆ کەوتی، لەو ڕۆژەوە بێدەنگی ماڵی سەروەر بوو، سەروەر لە بێدەنگیەکی بێئامان و شەکەتدا دەژیا، لەو گۆڕە تەنهاتر کە بۆی هەڵکەندرابوو، ئەو هیچ نەبێ هەندێ جار سەگی بەڕەڵلای تێدا دەکەوتن، یان باران پڕی دەکردەوە، شتێک نەبوو بە ناوی ئاشتبوونەوە، بە ناوی خۆشەویستی، سەروەر لەو باوەڕەدا بوو هاوڕێ،

دۆست و خزم، هاوسێ و هاوپۆل دەکرێ بکوژ و ئەتککەر و دڕەندە بن، نەک دەکرێ، هەن، بەڵام جارێ هەلیان بۆ هەڵنەکەوتووە.

سەروەر بووە خاوەنی سامانێکی لەبن نەهاتوو، لەو ڕۆژەوە سامانێک بەسەریدا ڕژا، کە هەرگیز نەیتوانی بیبەخشێ، یان سەرفی بکات، ئەو سامانەش ڕق و بوغز و بێزاری بوو، یەکەم لە خەڵک و دووەم لە خۆی. ئەوەندە قووڵ لە خۆی نیگەران و داغدار بوو، کە هەرگیز نەیتوانی خۆی ببەخشێ. نەشیدەتوانی هەردوو دەستی لە بینەقاقای خۆی بنێت و خۆی بخنکێنێ، وەک گلاو و بۆگەن سەیری خۆی دەکرد. جەستەی پیس و حەرام و بۆگەن بوو. چەند لە ژووری کەوت و چەند تاریکیی نسرمی قەراتێ لەسەری نیشت. دایکی دەهاتە لای و لاقە باریک و بێهێزەکانی بۆ دەشێلا، ئەوەش ئەو ڕۆژانە بوون کە مریەمە ئەسمەر و خوێنشیرینەکە گۆڕابوو بە ئەسمەرە ڕەش، ڕەشێک وەک میوانێکی تازە دەنیشتە سەر ڕوخساری. لەپشت هەموو ژنێکی پێستسووتاو، کچێکی ئەسمەری هەنگوینی هەیە، پیاویش. مەحموودیش کوڕە ئاڵەکەی منداڵی نەمابوو، ئەوەی پیاو جیاوازە، پیاو دڵی، ناخی وردەوردە لەگەڵ پێستی دەگۆڕێ، زوو تریش.

ئەو شەوە نا، کە سەروەر مرد و نەمرد، نا ئەو شەوە نا، ئەو شەوەی ئێوارەکەی کچەکەی حاجی عەلی پندر پەردەی تەختە خەوەکەی دەگرتەوە، سەربانی ئاوڕشێن دەکرد، سەروەر دەیزانی خۆ گەنجەکان بە بۆنی گڵەکە نەدەمردن، ئەوان بەو بۆنە دەمردن کە لە بەلەکی ئاڵتوونیی ئەو کچە

هەڵدەستا. ئەویش چەند ئاوی بە سەربانیدا دەکرد هێندەشی بە بەلەکی دەکەوت. تەنها گەنجەکان ئەو بۆنی بەلەکەیان دەکرد و شێتوهار دەبوون. ئەو کچە خوشکی یونس نەبا، خوشکی دارۆغەی بەغدایە با، ئاوای بۆ نەدەچووە سەر، هەموو خەڵکی ئەو قەلاتەی لە میزی خۆیدا بگەوزێنی.

ئەو شەوە نا، شەوی دواتریش نا، شەوی دواتر سەروەر دەیتوانی شۆربا بخوات و لەسەر قوون دانیشێ، دایکی ئاڵ ببۆوە، بەلام هەرگیز ئالبوونەوەی ژنێک، کە ماکی ڕەشی بەسەردا هاتبێ تاسەر نییە، سێیەم شەو دوای ئەو مردنە، مستەفا مێخەی ناتر، هەموو برادەرەکانی بانگ کردبوو، ئەحەمەدی قەساب و ئامۆزاکەی، هورمز بە خۆی و بوتڵەکانیەوە، مەحموود بەڵەکیش، ئەو هەموویانی لەبەر مەحموود بەڵەک بانگ کردبوو، شەوی ئاشتبوونەوە بوو لەگەڵ عەرەق و نەشئە، مەحموود جوولابوو لەسەر ئەژنۆ هەستابوو، بەلام هێشتا هەر بەردێک بوو. پیاوێک جگەرسووتان بیکاتە بەرد، هیچ نەشئەیەک قورسی بەردی لە کۆڵ ناکاتەوە.

یەکەیەکە چوونە ژوورەکەی مستەفا مێخەی ناتر، باسی مردن و سەروەریان نەکرد، هورمز سێ بوتڵی لەناوەڕاستی مەجلیسەکە دانا، مێخە خەیار و ماست، نۆکاو، فستەقی مزری ئامادە کردبوو، هەر یەکە و ئیستیکانی خۆی لە باخەڵی دەر هێنا، تەنها مەحموود نەبێ، مستەفا مێخە دوو پیاڵەی سادەی هێنا، بۆ خۆی و بۆ مەحموود، هورمز یەکە-یەک پیاڵەکانی پڕ کردن، پڕپڕ نا، پەنجەیەکی مابێت، پێکەوە هەڵیان گرتن، بە دوو پەنجە، هەوای لووتیان ڕاگرت وەک ئەوەی بە دوو

پەنجە لووتیان گرتبێت، پێکەوە پێکەکانیان هەڵدا، عەرەقێکی خەست، خەستوخۆڵیش، بەخوڕتر لە تاڤگەکەی گەلی عەلی بەگ، لەسەر زمانیانەوە هەڵیان دا، بەقوڕگیاندا هەڵڕژا، وەک خەم و دەردیان لەگەڵ هەڵدابێتە خوارێ. هەر پێنجیان هەستیان بەساردی و بەتاڵی گەدەیان کرد، ئاوادانییەک کەوتە ناو نەفسیانەوە.

یەکەم کەس هورمز گوتی، "من، مەحموود عەرەق بە خۆشی تۆ."

مستەفا مێخە گوتی، "یەک مانگ لەسەر یەک بخۆینەوە، جا قەرەبووی ئەو ماوەیە ناکەینەوە، مەحموود ئێمەت کوشت."

دووەم پێکیان هەڵدا، لێویان بە ماست کرد، ئەحمەدی قەساب، کە هەر پێیان دەگوت ئەحمەد ئاغا گوتی، "ماستەکە لە عارەقەکە زیاتر دەمگرێ، هەی بەقوربانی هەر چی ژنی کەندیناوایە بم."

دەنگێک لە دەرێ گوتی، "هەی هەر چی ژنی کەندیناوایە بە سمێڵت هەڵمیزن."

دەنگی سەید مەردان بوو.

"بە پێڵاوەکانڕا هەمووتانم ناسی. مەحموود دەمزانی لێرەی."

هەر چاوی بە مەحموود کەوت گەشایەوە، زەردی و ماتی ڕوخساری مەحموود بەڵەک ڕێی بۆ سووری و شەرمنییەک خۆش کردبوو، دەستی سەید مەردانی گرت و لای خۆی جێگای بۆ کردەوە، دەستیان هەر لە دەستی یەکدا بوو، "بۆ منیش تێ بکەن، شتێک ئەوەندە مەحموود خۆشحاڵ بکات

منیش دەیخۆمەوە."

ئەوە قسەی سەید مەردان بوو، مستەفا گوتی، "مەستم بە عەرەق و مەحموود، فەرموون بۆ ڕۆحتان درود."

ئەحمەد ئاغاش بۆی ستاندەوە، "چاوم، چاوم لە ڕێی تۆیە، خۆشیم بە تۆزی ڕێی تۆیە."

هورمز پیاڵەکانی پڕ کردنەوە، بوتڵە بچووکەکەی بنباخەڵیشی دەر هێنا و هەر یەکە و ئەوەندەی قەپاغی بوتڵەکەی بۆ تێ کردن و گوتی، "بۆ خۆشی سەید مەردان."

ئەو شەوە دەنگی مەقامی سەید مەردان، سەرەتا ژوورەکە، جا ماڵەکە، جا تەواوی گەڕەکەکەی گرتەوە، هەمو زانییان ئەو شەو عەرەقخۆرەکان کەسێکی دیکەیان زیاد کردووە، دەنگی سەید مەردان خۆشی و شادییەکی لە دڵی گەنجەکاندا دەڕواند، بە کوتک هەڵنەدەقەندرا. ئەو خۆشییە بەکوێدا بچێتە ژووره نسرمەکەی سەروەرەوە؟ کوا ئەو تاریکییە قووڵە جێگای خۆشحاڵی لەسەر دەبێتەوە، هێشتا پرسیارەکەی نیان، کە دوای دە ساڵ لەو ڕووداوە کردی لە شوێنی خۆی دایە، "سەروەر ئەو ڕۆحە برینداڕەی لەکوێوە هێناوەتەوە؟"

ئەوەش چونکە تا ئێستا نەیهێناوەتەوە. تا کاتی ئەو گۆرانییە نەیهێنابۆوە، ئەو دڵەی لە قووڵاییدا دەشکێ هەرگیز چاک نابێتەوە، هەرگیز دەستێکی ئەوەندە باریک و سیحری نییە بگاتە ئەو قووڵاییە. بە دڵی شکاوەوە هەرگیز جەستە تەسلیمی سەما نابێت و ناتوانێ هەڵپەڕێ. هەرگیز قاقایەک، خەندەیەک سادە و فراوان ناچێتەوە سەر ڕوخساری، دەچێت، دەچێت، بوغزێک دەچێتە ناو چاوی ئەگەر تەسلیمی بێت، حەز

دەکات هەموو دنیا وێران بکات و منداڵی ناوبێشکە بسوتێنێ. سەروەریش زۆر حەز دەکات بێگومان ئەگەر تەسلیمی ئەو بوغز و ڕقە ڕەشە بێت. زۆر حەز دەکات پاڵەوانەکان، زانا و ئەشرافەکان، سەرکردە و بەناوبانگەکان، پێشەوایانی ئایین و فەرمانبەرەکان ئەتک بکات، سواریان بێت و گونی لە پشتە قوونیان تەکەکی بێت. جا بۆ کەسێک هەیە دڵی بەو قووڵییە شکابێت و تەسلیمی ئەو بوغزە نەبووبێت. ئەو بوغزە هەر چی تۆوی خۆشەویستی و ڕێزە، دڵنەوایی و بەخشندەییە لە ڕەگی ڕەگەوەی وشک دەکات، وا لەناوی دەبات، وا هێرشی دەکاتە سەر کە هەرگیز نەبووبێت.

سەروەر تەسلیم بوو، تەسلیمی شەرم و تاریکستانێک بوو بەشی تەواوی شارێکی دەکرد، هەموو هێزی خۆی کۆ کردەوە تا زەردەخەنەیەک، تا سوپاسگوزارییەک بۆ دایکی بخاتە سەر ڕوخساری، بەڵام نا، نەیتوانی، زەردەخەنەش وەک بینین، وەک ڕۆیشتن و بازدان وایە، تا لە دەستی نەدەی نازانی بەهایەکی چەند قورسی هەیە. دوای ساڵێکی تەواو لە ماڵ هاتە دەر، لە ماڵ نا، لە ژوورەکەی هاتە دەر. بۆ یەکەم جار توانی دوو ددانە گڕەکانی پێشەوەی بە هەر نرخێک بێت، وەک نیشانەی خۆشەویستی بۆ دایکی دەر بخات. ئەو ددان دەرخستنەش کاتێک بوو، کە گەیشتە کۆڵان، ئاوڕی بۆ دایکی دایەوە، مریەم ڕەشی دەستی لێ وەشاندبوو، لەو ساڵەدا نەخۆشیی کوڕەکەی بە تەواوی بەسەریدا زاڵ ببوو. سەرەتا ڕازیبوون بە ڕەشی بۆ ژنێک، کە بەلەکی کچەکەی حاجی عەلی پندری دیبێت، لە ڕازیبوون بە تاعوون سەختترە.

کە سەروەر دوائاوڕی لە ماڵ دایەوە، قاییشە بڕاوەکەی خۆی دیت، بە بزمارێکی سەر دیوارەکە هەڵواسرابوو، پێستە قوپاوەکەی کە نیازی زەردەخەنەیەکی هەبوو، وەک هەزاران خەنجەری لێ درابێت، لەگەڵ ژانێکدا بۆ هەمیشە چووەوە ناویەک. دایکی لە حەوشەوە بانگی کرد، "جەرگەکەم زوو وەرەوە و ئاگاشت لە خۆت بێ."

سەروەر ویستی ئەو ماڵە بۆ هەمیشە بەنەفرەت بکات، بە قاییش و بزمار و دیوار و ژوورە نسرمەکەیەوە، وەک یەکەم جاری بێت کۆڵانەکانی قەراتێ ببینێ، هاوسێ و ڕێبوار بۆی پێدەکەنین و سڵاویان لێ دەکرد، ئەو هەموو سڵاوێکی بە جنێو و تانە دەزانی. چەند لە گەڕەکی سەرای دوور دەکەوتەوە، ئەوەندە هەستی بە قورسی و نەگبەتی ئەو گەڕەکە دەکرد لەسەر شانی. سووڕایەوە، بە قادرمەکانی ئارتلریوقش کە دەرگای حەرەمیشیان پێ دەگوت، هاتە خوارێ، تووشی چەند ژنێک بوو کە کەس نەیدەزانی چەند سەعات لەسەر بەرد و لەبەر ئاوی گەرمی حەمام ماونەتەوە وا پەمبە بوون، تا یەک پارچە بوونەتە بۆن سابوون و هەڵمی ئاوی گەرم و پێشیان ئەوەندە پڕئاو بووە وەک ئیسفنج هەستاوە.

چەند ژنێکی دیکە بە توورەکە و گونییەوە سەر دەکەوتن، ئاخر ئەو پلیکانانە تایبەت بوون بە هاتوچۆی ژنان، چەند لە قەڵات دوور دەکەوتەوە زیاتر هەستی بەو بارە قورسە دەکرد لەسەر شانیەتی. هاڵاوی ئەو ئینسانانە چەند قورس کەوتۆتە سەر یەکتر، تاکە هەناسە و بۆگەنێک لەسەر شانی مرۆڤ قورس بێت، هەناسەی ئینسانێکی دیکەیە، ڕاستی قەڵات بۆ سەروەر دورگەی کابووس و شەرم و ئەتک

بوو، هێشتا کۆڵانی ئاغالار کوچەسی مەنزڵی تاریکی بوو، ئاسمانێک تاریک، قووڵ و تاریک، لە تاریکترین بەشی، لە قووڵترین شوێنی، ئەستێرەیەک نوزەی دەهات. ئەو ئەستێرەیە مریەمەڕەش بوو، تاکە نووزەی ڕووناکی بوو هێشتا سەروەری بە پێوە ڕاگرتبوو. وەک یەکەم جار بێت شار ببینێت، هەوڵی دەدا شار بناسێتەوە، بێمەبەست تا تەکیەی شێخ مستەفا چوو، ئاسنگەر و کوورەچی، باپیرە غازی چاوی بە سەروەر کەوت گەشایەوە، "کوڕەکەم. کوڕە جوانەکەم وەرە لەسەر ئەو کورسیە دانیشە."

ئەو دانەنیشت، باپیرە غازی پارەی دایە، نیوەڕۆ بچۆ کەباب بخۆ، ئەو گەڕایەوە چووە ناو قەیسەری، گوزەری دارتاشەکان، دەنگی چەکوچ و ڕەندە و ڤرەڤرِی موشاری ئەو پیاوە دەستڕەنگینانە، تەواوی ئەو وڵاتەیان پڕ کردووە لە سندوقی دوڵدوڵی باڵدار، بوراق لەسەر شووشەی ئەو سندوقانە، کە دەستکاری ئەو دارتاشانەن نافڕێتە ئاسمان، لەشەقەی باڵ نادات بۆ بۆشایی دوور، لەشەقەی باڵیش دەدات، بەس بۆ ناو سینگی ئەو ژن و مێردانەی یەکەم جار و یەکەم شەو لەپەنا ئەو سندوقانە و لەژێر باڵی ئەو بوراقانە لەدوای چەندان ساڵ چاوەڕوانی لە شەوی بووک و زاوایدا، دەچنە باوەشی یەکتری.

لە ماڵەکەی سەروەریش سندوقێکی ئاوا هەبوو، بوراقێکی بەهەیبەت بە باڵی سوور و زەردەوە ئامادەی فڕین بوو. مریەمەڕەش، زۆر پێش ڕەشییەکەی، کە چیرۆکی بۆ سەروەر دەگێڕایەوە باسی فڕینی ئەو بوراقە و خەوی ژێر باڵی کردبوو، گوتبووی،

"ئەو بوراقە موبارەکە، ئەسپی پێغەمبەرە، ئەو شەوەی لۆ یەکەم جار بابت هێنامیە ئەو ماڵە، شەو لەشەقەی باڵی دا. من دیتم لەشەقەی باڵ دەدات، پێم وا بێت مەحموودیش دیتبێتی، فڕی و فڕی هاتە ناوسینگی ئێمە، نازانم چەند فڕی بە سینگی ئێمەدا، بەرام کە هاتەوە، نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەعات و نۆ دەقەی پێ چووبوو، کە هاتەوە پێدەکەنی، ئێمەشی دڵخۆش کرد، تۆی لەگەڵ خۆی هێنابوو، کارەساتی گەورەی ژن و مێردی ئەو قەراتەی ئەوەیە، کە ئەو بوراقە نەیەتەوە."

سەروەر سەد جار بەبێ ئاگاداری دایکی ئەو بوراقە سوور و زەرد و سەوزەی ماچ کردبوو، ماچی شیرین و پڕفڕین. ئەو چیرۆکەش تاکە یادگاری خۆش بوو لە ژیانی سەروەردا.

ئەو ڕۆژەش سەرەوەر لە گوزەری دارتاشەکان وەستا، وەستایەک نەخشی بوراقی دەکێشا، هێشتا باوەڕی وا بوو ئەو بوراقەش کە جارێ بە تەواوی نەکێشراوە، شەوێک دەداتە شەقەی باڵ منداڵێک بۆ ژنێک دەهێنێتەوە، دایکی ئەوەشی گوتبوو، "ئەو سندوقە بابە غازی وەک جیازی بووکێنی بۆی کڕیبووین، ژن چەند دڵی بە مێردەکەی خۆشە سەد ئەوەندە بەو بوراقەی."

دوای ساڵێک بۆنی کەباب ڕای کێشا، دوو کەباب و شیشێک تەماتە و پیاز و نانیان لە پێش دانا، بە ئیشتیاوە نانی خوارد، لەزەت لە دووکەڵ و ئاگر و پڕیشکەکان دایە، شاگردە چەورەکە، کە زۆریش لەو بچووکتر بوو، دەهات و دەچوو، بانگی دەکرد نەفەرێک، دوو نەفەر، بۆ ئەو پێکەنی،

"چایەکت بۆ بێنم." ئەو نەیزانی پێبکەنێ گوتی، "ئا." بەناو کوتاڵفرۆش و قوماشفرۆشاندا سووڕایەوە. ئەو ژنانەی کە تەنوورەی کورتیان لە پێدا بوو، کە دادەهاتنەوە لا ڕانیان دەبریسکایەوە.

قەیسەری هەولێر بۆنی ژنی لێ ببڕێ وێرانەیە. سەروەر نەیدەویست سەیریان بکات، بەڵام سوهێر ڕەمزیشی بیر کەوتەوە، بەو لاقە سپییانەوە ئاو دەپژێنێ، دەرپێ و مەمکدانی لە ڕەنگی هیی ئەو سەرنجیان ڕاکێشا، سووڕایەوە بۆ لای کۆڵانی پەنیر فرۆشان، بۆنی پەنیر و ژاژی بۆ کەسێک کە تێر کەباب بێت، هیچ خۆش نییە، بە خەیاڵی تێپەڕبوون بە بەردەم دوکانی حاجی عەلی پندردا ڕۆیشت، یونسی کوڕی لەگەڵ ئەو هەتیوە ئاگرە وەستابوو، سەروەر ویستی هیچ بیری خۆی نەهێنێتەوە و ئەو ڕۆژە بە مردوو دابنێ، ویستی ناوی ئەسعەد بۆ ئەبەد لە مێشکی خۆی بسڕێتەوە.

سووڕایەوە بۆ لای ئەو دوکانانەی شتی ژنان دەفرۆشن، بەدزی دەرپێیەکی سووری وەک ئەوەی سوهێر ڕەمزی لەباخەڵ نا، لەو ناوە دوور کەوتەوە. نیان هێشتا دەپرسێ سەروەر ئەو ڕۆحە بریندارەی لەکوێوە هێناوەتەوە؟

# ٧

مریەم ویستی وێنەکە لە بەڵقیس وەر گرێتەوە، تامەزرۆ بوو جارێکی دیکە سەیری چاوە ڕەش و گەورەکانی کوڕەکەی بکات، کەس ئەوەندەی دایک هەست بەجوانی کوڕەکەی خۆی ناکات، کە لە مەترسیدا بێت. سەرەوەر ئیدی لە وێنەیەک زیاتر هیچی دیکەی نەبوو، ئەو وێنەیە تایبەت بوو، هێشتا چاوەکانی، نیگا و ڕوخساری هیی خۆی بوو، بەڵقیس وێنەکەی نەدایەوە، هەر لە دوورەوە بۆی ڕاگرت، دەستی خستە سەر قژە زەردەکەی نیان، "ئەوە کچەکەی منە، لە ماڵی ئێوەیە، پێم بڵێ چیتان لێ کردووە؟"

مریەم خۆی بۆ نەگیرا و لە دڵەوە گوتی، "بووکە نازدارەکەم."

ئیدی هەموو شتێک ئاشکرا بوو، "بووکە نازدارەکەم." هەموو شتێکی دابووە دەست بەڵقیس.

قژی مریەمی گرت و گوتی، "پێم بڵێ لەکوێیە تا کارەساتێ ڕووی نەداوە؟"

مریەم هێشتا بەئازادی ناتوانێ ناوی کوڕەکەی بێنێ، بڵێ سەروەر کوڕی منە، ناتوانێ بڵێ، "بەڵقیس سەروەرە ڕەش کوڕی منە،" ناتوانێ بڵێ، "لەجیاتیی خۆی ئەو هەموو کۆترەی بۆ جێ هێشتووم." ئەو بەڵقیسە لەخۆڕازی و کەرکەدەنە کوا لە ئازاری دایکێک تێدەگات؟ کوا دەزانێ لە ناخی مریەمدا چ ئاگرێک هەڵگیرساوە؟ چ سووتانێک سەری لە جگەری کردووە؟ ئەو سلێمانییانە هەر بە توخم خۆپەرست و خۆپەسندن، پێیان وایە هەموو خەڵکی گێل و کەر و نەزانن و شایانی دۆستایەتی و خزمایەتی ئەوان نین.

مریەم دەیویست وەک دوو ژن، دوو ژنی کۆستکەوتوو سەر بە سینگی یەکتر بکەن، سەد هێندەی ئەو تاریکییە بێبنەی سەیداوا فرمێسک بەسەر سینگی یەکتردا بڕێژن، لێرە عەشق و خۆشەویستی کۆستکەوتنن. دەیزانی خەم و کۆستی هەردووکیان قورسە و هیی ئەوە نییە بە کەسێک هەڵگیرێ. دەشیزانی کۆستی نامووس، خوانەخواستە مەرگیش تەنها لە کۆڵی ژنانە. کۆستی ئەو وڵاتەش بۆیە ئەوەندە قورسە، چونکە کەس کۆستی خۆی لەگەڵ کەس بەش ناکات. دەیویست سەری خۆی بخاتە سەر ڕانی بەڵقیس و بڵێ، "خوشکەکەم، خوشکە ئابڕووتکاوەکەم، من، ئا من، نۆ مانگی تەواو سەروەرم بە پێستی سک هەڵگرت و ژانی سەد منداڵی دامێ،" پێی بڵێ، "منیش کوڕەکەی خۆم خۆش دەوێ، بەئاهی دڵ بەخێوم کردووە." هەر ئەو ئاهی دڵەیە کۆرپەکان لەگەڵ خۆیانی دەبەن، بۆیە منداڵەکان تەمەنیان سەدساڵیش بێ، لەگەڵ ناوی دایکیان لێوەلەرزێ و لچەشۆڕە دەگرن. کوا جارێکی دیکە سەروەر لێوەلەرزە ناگرێ، بەڵام نا، ئەو

ماوەیە باڵای بەرزتر ببوو، سەربڵند و چاوگەش، دنیای بە هیی خۆی دەزانی، شەرم و ملکەچی لە ڕوخساریدا نەمابوو، ئاخ سەروەر بەو شەهامەتەوە لەباوەشم کردبای.

بەڵقیس ملی مریەمەڕەشی گرت، ملە باریک و بێژیانەکەی، گرتی و هاواری کرد، "کوا کچەکەم؟ لەو سەربانە هەڵت دەدەمە خوارێ، ئەوەتا وێنەکەیم لە ماڵەکەی تۆدا دۆزیوەتەوە، پێم بڵی، ئیدی بەزەییم بەویشدا نایەتەوە، بۆ خۆم بەو دەستانەی خۆم دەیخنکێنم، چاوی پێنج برای وەک شێر و باوکێکی وەک پڵینگی شۆڕ کردووە. تۆ نازانی سەرشۆڕی و حەیاچوون مانای چییە؟ نازانی ناموسبردنی خەڵکی چەند قورسە؟"

مریەمەڕەش حەزی کرد لە بەر دەستی بخنکێ، بخنکێ و لە کۆڵ دنیا و کۆستکەوتنی ئەو ژنە بێتەوە، ئاخر منداڵ چ بوونەوەرێکی ئەوەندە نەگریسە، کە ناچار بیت ئەو هەموو سووکایەتییەی لەسەر قبووڵ بکەی! ئەویش ئاگری جگەر هەڵی گرتووە، ئەویش دوای مروارییەکەی خۆی کەوتووە، سەروەر پێی گوتبوو،

"ئەو کچە، ئەوەی لەتەنیشتم وەستاوە، قژزەردە ڕووناکەکە، ئەوەی وێنەکەیت بۆ دەنێرم، خەڵکی سلێمانییە، دایە گوڵەکەم، تەنها ئەو، تەنها ئەو سێوە ئاڵە ژیانی ڕەشی من ڕووناک دەکاتەوە، ئێستا من کوا سەروەرەکەی جارانم، من گۆڕاوم، بولبولێک لەوسەری دنیا بخوێنی دەزانم بۆ منە، هەموو شتێکی دنیا چۆتەوە شوێنی خۆی، کوا مرۆڤەکان ئەوەندە ترسناکن و کوا ئەوەندە حەیابەرن! کوا دووکەڵی سەیارە و ماتۆڕ بۆ دڵ خراپە! کوا باران ڕاوماندەنێ، ئیدی

دایە گیان هەموو شتەکان ڕەنگێکی دیکەیان هەیە، من حەز دەکەم بارانی هەموو ئەو دنیایە هەموو لە بەغدا ببارێ، لە بەغدا و ڕاست بەسەر من و نیاندا ببارێ، تا تەڕتەڕ ببین و بچینە ژێر باڵی یەکتر. دایە گیان دەزانی ئەو کچە سێوە پێنج برای هەیە، تۆ بڵێ پێنج پاڵەوان، ئەو سلێمانییە لەسەر دەستی ئەوانە. بابی پیاوە بەهەیبەت و گەورەکەی سلێمانییە، هەر لەبەر خاتری من، دەچیە دوکانی کەمالی بەزاز لەناو کوتاڵ فرۆشەکان، بگەڕێ، نا زۆر مەگەڕێ، لە هەرکەسێک بپرسی دەزانێ. کەمالی بەزاز کێیە، کوڕەکانی چەندان دوکانیان هەیە، لەبەر خاتری من بچۆ، کراسێکی زەرد و سۆر بکڕە، زەرد و سوور لەسەر زمانی نیان، یەکێکی کەسکیش، کەسک کەسک، لەوێ وەک نیان بڵێ سەوز سەوز، ئا، مەڵێ پرسەدارم، مەڵێ تازە کراسی ڕەش فڕێ نادەم، من لەجیاتیی بابم پێت دەڵێم، 'هەر لەبەر خاتری دڵی کوڕەکەم سەروەر، لەبەر خاتری پێوقەدەمی بووکە کەسکەکەمان نیان، هەر ناوەکەی پێنج بووکی سەر زین دەهێنێ.'

دایەگیان لەرزم لێ دێت کە باسی پێوقەدەمی نیان دەکەم، من بەتەنها نا، قەڵەم و کاغەزەکەم، دەستم، دڵم، چاوم دەکەونە لەرزە، بچۆ چەندی دەتوانی زوو بچۆ، دایە گیان، مریەمە تاک باڵەکەم، کۆترە غەمگینەکەم، دایکی نیان بە شاژنە بالابەرزەکەی سلێمانی ناسراوە، شاژنی تەواوی قوماشفرۆش و بەزازەکانە، ناو دڵی چراخانە، وەکی ئاوی کەسک و سۆری لای خۆمان، ئەو دەبێ فەرشی سۆری لۆ ڕاخرێ، ئاخر ئەو کیژەکی لۆ من خستیتەوە، کە لەجیاتیی هەموو کارەبا و گڵۆپ و خۆر و مانگی دنیایە، ڕووناکی بە دڵی من دەدا.

دایە گیان ئەو ژنە دوای پێنج دانە کوڕ ئەو کچەی بووە، ئەگەر بۆ خۆیان وایان نەگوتبا، هەموو دنیا دەیگوت نیان لە چاوتروکانێکی مانگ بەر بۆتەوە، ئاخ لە ولاتی ئێمە دەریا نییە، دەنا حەتمەن نیان فریشتەی دەریا دەبوو، دایە گیان ئەو شاژنەی سلێمانی، ئەو کچەی کە دوای پێنج برا هاتۆتە دنیاوە تەنها بە نوقڵ و نەبات بە خێوی کردووە. هێشتا بۆنی شیری دایکی بە زمانیەوەیەتی، ئەو ژنە هەمیشە بە کەمالی مێردی و کوڕەکانی گوتووە ئاسمان کون بووە و ئەو کچەی لێ بەر بۆتەوە، نەکەن هەرگیز دڵی بشکێنن، دڵشکانی نیان ئازاری هەر شەشتانی هەیە، سەرەڕای ئەوەی پاشەبەرەیەتی کەچی هەمووان بە دایکی نیان بانگی دەکەن، هەمووان دەزانن وای پێ خۆشە. دایە مریەم گیان ئەو کەمالی بەزازە کە پاشای بەزازەکانیشە، پیاوە بەهەیبەتەکە، کە کوڕەکانی لەدایک بوون هەر ماچیشی نەکردوون، ساڵێکیش بەسەر لەدایک بوونیاندا تێپەڕیوە هەر سەیری نەکردوون، دایە گیان ئەو کەمالە لە ماڵەکەیانڕا نیانی خستۆتە سەر قەلاندۆشکانی، تا بازاڕ دای نەناوە، خۆشترین نوکتەش ئەوەیە کە پێیان گوتووە، "کاک کەمال کچەکەت داگرە، ئەوە میزەکەی گەیشتۆتە سەر شانت." کەمال بەبێ ئەوەی دای گرێ گوتبووی، "دەزانم، دەرمانە." دایە گیان ڕۆحی ئەو دایکە بەسەر ڕۆحی نیانەوەیە..."

مریەم دەیزانی ئەو ژنە هار و شەڕانییە چ کۆستێکی کەوتووە، ژن وەک پڵینگ وایە دڕندەییەکەی کاتێک دەر دەکەوێ کە منداڵەکەی دەکەوێتە مەترسییەوە. دەیزانی جارێ هەست بە ئازاری برینەکەی ناکات، چونکە گەرماوگەرمە،

ئاخر دڵیش بەو هەموو هەستەی خۆیەوە کە گوللە دەیبڕێ بە گەرموگوڕییەوە هەستی پێ ناکات. هەر لەبەر ئەوەش بوو، کە مریەم هیچ بەرگری لە خۆی نەکرد و خۆی دایە دەست تووڕەبوونەکەی بەڵقیس، گوڵنار گریا و پەلاماری دەستەکانی بەڵقیسی دا، تا لە گەردنی دایکی بکاتەوە، بەڵقیس هێشتا دەیگوت، "پێم بڵێ کوا کچەکەم لەکوێتان شاردۆتەوە."

هەر ئەو جارە سەروەر نووسیبووی، "دایە گیان ئەو کچە هیی تۆ بێ، هەموو دنیا بێتە تکایە، سوڵتان موزەفەر زیندوو بێتەوە و داوای بکات و بۆ کوڕەکەی خۆی بوێت، جەنابی مەلا فەندی بە تایبەتی بنێرێتە لات، نایدەیەی، نەک هەر ئەوە وەڵامیشیان نادەیەوە. بۆیە پێت دەڵێم هەرگیز وەڵامیان مەدەوە، جارێک دوو جار، سەد جار، دوو هەزار جار ئەو داکە شاژنەی تووڕە ببێت و سیاناوی هەموو سەیداوام بەسەردا بکات ئەوە ناهێنێ چرکەیەک بە تەنیشت نیانەوە وێنەیەک بگری، خۆ ناشتوانم ئەو تیشک و نووره لەگەڵ خۆم بهێنمەوە، هەر چی خەڵکی سەیداوا هەیە بەسەرماندا دەڕژێن، هەر بۆ ئەوەی پێکەنینێکی نیان ببینن خۆیان دەخەنە سەر چەقۆ، دایە گیان من ئێستا لە تەواوی پارەدارەکانی دنیا دەوڵەمەندترم، من خاوەنی هەموو پێکەنینەکانی نیانم، من خاوەنی بۆنی پێستی و هەناسەی شەوانەشیم، ئەوەش سامانێکە جگە لە من ناکرێ کەسێکی دیکە هەیبێت. بەڵقیس خان، شاژنی بالابەرزەکانی سلێمانی هەر چی بکات کەمە، چونکە من گەورەترین مرواری دنیام لەوان داگیر کردووە."

مریەمەڕەش تێ مابوو، کەوتۆتە ژێر هێرشی ئەو ورچە ژنەی سلێمانی و ناسکە وشەکانی کوڕەکەی، خۆ دەشێ

شـاژنیش بووبـێ، بەزەحمـەت خنخنۆکـەی لـە دەسـتی ڕزگار کرد و گوتـی، "ئەو هەرایە مەکە، با دانیشین دوو قسە بکەین."

بەلّقیس کە هێشتا شێوە شاژنییەکەی بەئاشکرا پێوە دیار بوو، دەستەکانی شل کرد و گوتـی، "دوو قسە نا، یەک قسەم پـێ بلّـێ، کچەکـەم لەکوێیـە؟ ئەوەتـا وێنەکـەی لـە مالّەکـەی تۆدایـە."

مریـەم گوتـی، "بـۆ ئـەوەی بزانـی لەکوێیـە دەبێت گـوێ بگـری."

ئەوان چوونـە خـوارێ و سـالار کۆترەکانی بانگ کردنـەوە، بەلّقیـس گوێـی لـێ بـوو سـالار گوتـی، "ئـەو کۆتـرە ڕەشـە باریکـەم نـاو نـاوە سـەروەر."

بەلّقیس لەسـەر پلیکانەکانـەوە سـەری بـەرز کردەوە، لەسـەر لێواری سـتارەکە کۆترێکـی سـپی پەڕلەپێـی دیـت بـە تەنیشـت کۆتـرە ڕەشـەکەی سـالار بانگی دەکرد سـەروەر، گمەگمیـان بـۆ یەکتـر دەکرد، چاوە سـەوزەکانی کۆترەکـە هێشـتا دواتیشـکیان تێـدا مابـوو، لـە بـەر خۆیـەوە گوتـی، "خودایـە حیکمەتـی تـۆ لەوەدایـە کـە هەرگیـز یەکسـانی ناهێنیتـە دی."

دواتـر هێزێکـی ئەهریمەنـی لـە ناخیـدا گوتـی، "سـوور یـان سـپی لەسـەر ڕەش خـۆ ناشـیرینیش نیـن، ئـەو مالّـە هەمـوو شـتێکیان بەلایـە کۆترەکانیشـیان."

گولّنـار کترییەکـەی بـردە سـەر ئاگـر، شـەکرەکە بەلّقیسـی بـردە ئاودەسـتەکە، میزێکـی زۆر و خەسـتوخۆلّ و وەک کچـان بەهوورژمـی هەلّڕشـت. هـەر مالّێـک تێیـدا چوویـە ئاودەسـت، نـەک دیوەخـان بزانـە تێیدا ئاسـوودەتری. مریەمیش گوێـی لـە خشەخشـەکەی بوو، تاکە دەنگ بوو لەو شـاژنەی گوێ لێ بێت

و بیخاتە بزە. دوای میزەکەی، دەستی شوشت، دەموچاویشی، زیاتر چوو، باسکەکانی هەڵکردن، دەستنوێژیشی گرت. بەبێ ئەوەی داوای بەرماڵ بکات، مریەم دووگردەکەی بۆ ڕاخست، نوێژی دابەست، مریەم وای دەدی ئارامییەکی سارد بە ڕوخسارییەوە کرابوو، هەر لەسەر بەرماڵەکە دانیشت، گوڵنار چایەکی بۆ تێ کرد، مریەم چووە تەنیشتی، ئەو چایەکەی خواردەوە، مریەم ڕووی بە ئەولادا کرد و گریا، گریانێک تەواوی کۆترەکانی ئەم ولاتە بخنکێنێ، بەڵقیسیش قورگی پڕ بوو، فرمێسکیش زایە چاویەوە، بەڵام نا، ئەو دۆستایەتییەی لە گریانی هاوبەش دروست دەبێ هەرگیز ژەنگ ناهێنێ، ئەو نەیویست، ئەو دۆستایەتییە، ئەو نەیویست و حەزی لەوە نەبوو ئەو شەرەفە بداتە ئەو ژنەی کچەکەی گومڕا کردووە. مریەم گوتی، "ئا سەروەر کوڕی منە، کوڕێکە وەک ئەڵماس خاوێن، بەڵام ئەو نەدەژیا، ژیانی تاڵ تاڵ و ژەهری مار بوو، غەریب و قەلەندەر، هەتا کچەکەی تۆی ناسی، ئیدی ژیانی گۆڕا، ئێوە ژیانتان دایەوە، من بە تەلەفۆنەکان و نامەکانیرا دەمزانی، دەمزانی کوڕەکەم بۆتەوە بە بەشەر، خەم و دەردی لەبیر چۆتەوە. من دڵخۆش بووم، بەو کچەی تۆ دڵخۆش بووم، من قەرزداری ئەو کچەم، قەرزداری ئەو کچەی تۆم، ژیانی دایەوە کوڕەکەم."

بەڵقیس زیاتر بەرگەی نەگرت، "دڵخۆشی تۆ حەیاچوون و مردنی منە، پێم بڵێ چ جادوویەکت لە کچەکەم کردووە، لەکوێت شاردۆتەوە؟"

مریەم گوتی، "من تا ئێستا نەمدیوە، دەستم بەر پەنچەی نەکەوتووە، لە تەلەفۆن نەبێ قسەم لەگەڵ نەکردووە."

بەڵقیس، "بۆ قسەت لەگەڵ کرد، نازانی کچی خەڵکە و نابێ فریویی بدەی؟"

مریەم گوتی، "با دەزانم، ئەو ویستی، ئەو داوای کرد قسەی لەگەڵ بکەم، ئەو پێی گوتم بێم بۆ سلێمانی، بۆ لای کوتاڵ فرۆشەکان، ئەو ناوونیشانی دوکانی مێردەکەتی دامێ."

بەڵقیس سەرسام بوو. چاوی زەق کردەوە، گوتی، "ئێوە کچەکەی منتان لەخشتە بردووە، شێتتان کردووە."

مریەم گوتی، "من پێم گوت، بۆ خۆت قسە لەگەڵ داکت بکە، تێی گەیەنە، لەجیاتیی تۆش پێم گوت، جارێ ڕاوەستن، سەبر بگرن، هەردووکیان سوور بوون من بچم بۆ لای بابی نیانی، چووشم."

بەڵقیس پرسیی، "کەی هاتی بۆ سلێمانی؟ هاتبای بۆ لای من ئەوە کاری ژنانە."

مریەم گوتی، "ویستم، بە پرسیار دوکانەکەم دۆزییەوە، دوکانەکەی خۆی نا، هیی مستەفای کوڕت، یەکەم جار تەنها قوماشم لێ کڕین، وتیان ئەوەش دوکانی کاک کەمالی بەزازە، هیچم پێ نەگوت، هەر وا گەڕامەوە، چووشمە بەرامبەری، غیرەتم نەکرد، نەمتوانی بچمە لای، هەفتەیەک دواتر، دیسان تەلەفۆنیان کردەوە، سەروەر گریا، من بەرگەی گریانی کوڕەکەم نەگرت و چوومەوە، دیسان سلێمانی و ترس و لەرز، چاوەڕێم کرد، تا دەوری کاک کەمال چۆڵ بوو، چوومە لای، پێم گوت دێمە ماڵتان، دەمەوێ بەڵقیس خان ببینم، پرسیی، 'بەڵقیس! بۆچی؟ ئەو نایەوێ کەس ببینێ،' گوتم، 'کاری خێرە،' توندتر پرسیی، 'چ خێرێک، هیچ خێرێک

لە ڕوخساری تۆدا نابینم.' من زمانم گیرا، زمانم گیرا و گێژ بووم، لەسەر عەرزەکەی بەردەمی دانیشتم، ئەو ویستی دڵنیا بێت، پرسییەوە، 'خێری چی؟' من ڕووناکیم لە ڕوخساریدا دیت و گوتم، 'دەستم دامێنت، کوڕم کوشتووی و خۆم لە ماڵت هاویشتووە،' زۆر ترسام لە سام و هەیبەتی، گوتم، 'دەڕۆم، با بچم بە بەڵقیس خان بڵێم،' ئەو گوتی، 'پێویست ناکات، جیاوازی نییە، بە منی بڵێ،'

مریەم بەکوڵ گریا، بەڵقیس لەو هەموو گریانە سەری سووڕ ما، ئەوە بە شوێنی خۆی، ئەی ئەو ژنە حەیابەر و کەتنکەرە بۆ دەگریا، دیارە هەمووی لەبن سەری ئەوە.

مریەم گوتی، "خۆم بەسەر پێڵاوەکانیدا دا، پێڵاوەکانیم ماچ کرد، گوتم، پێت دەڵێم بەس بەڵێنم پێ بدەی یارمەتیم بدەی، من بێکەسم، تەنها ئەو کوڕەم هەیە، سەروەر بەقوربانی تۆی دەکەم."

ئەو لەگەڵ بیستنی ناوەکە هاواری کرد، "حەیامان مەبە، قسەکەت بکە، هەستە لەسەر ئەو کورسییە دانیشە."

دانیشتم لە دڵی خۆمدا گوتم، تەواو دڵی نەرم بوو، پێم گوت، "کوڕەکەم سەروەر لە بەغدا دەخوێنێ..."

هەر ئەوەندەم گوت ڕەنگی گۆڕا و گوتیەوە، "لە بەغدا دەخوێنێ..."

من گوتم، "بەڕێ، چەندی برێی کوڕێکی باش و زیرەکە. بەڕەوشت و دڵپاکە..."

ئەو وەک بریندار بێت، وەک ئەوەی گوللەیەکم ڕاست بە سینگیەوە نابێ، وەک ئەوەی خوێنی لە بەر بڕوا، دەستی بە سینگیەوە گرتبوو، سەیری دەکردم. هێزم دایە خۆم تەواوی

بکەم، "لەوێ، هەر لە بەغدا، کچەکەی ئێوەی دیوە..."

ئەو وەک بەنج بووبێت سپی سپی هەڵگەڕا، لەژێر لێوەوە، گوتی، "نیان، ئاخ نیان..."

من گوتم، "کوڕەکەم زانیویەتی کچێکی چەند بەئەدەب و سەنگینە، لێم پاڕاوەتەوە بێم بۆ لاتان و پێتان بڵێم بیکەن بە کوڕی خۆتان."

هەستا، هیچ قسەیەکی نەکرد، دوکانەکەی جێ هێشت و منی بردەوە گەراج و سواری ترومبێلێکی هەولێری کردم و گوتی، "جارێکی تر نەتبینمەوە."

لەو کاتەدا سالار لە سەربانەوە هاتە خوارێ، وەک یەکەم جار بێت بەڵقیس ببینێ، ڕووی تێ کرد و گوتی، "دایە بەخێر بێیت."

بەڵقیس وەڵامی نەدایەوە، سالار هاتە تەنیشتیەوە، گوتی، "تۆ دەکەم بە داکم، تۆ لە مریەم جوانتری، من دەمەوێ تۆ داکم بیت و وەک تۆ جوان بم، مریەم ئەو کۆترانەی لە من خۆشتر دەوێ."

گوڵنار هات دووری خاتەوە، دەستی گرت و ئەو نەچوو، "ئەوەش کچی مریەمە، هەردووکیان منیان ناوێ."

مریەم هەستا و دەستی سالاری گرت و دووری خستەوە، ڕووی لە بەڵقیس کرد و گوتی، "ئەو کوڕەم پێنج ساڵ لە سەروەر منداڵترە، هەر بەزگماک تەواو نییە، زیانی بۆ کەس نییە و کاریش دەکات."

بەڵقیس ئارامی لە دەست دابوو، بەڵام سەرەداوێکی دەست کەوتبوو، هەرچەندە گومانی لە قسەکانی دەکرد، هەستی دەکرد نیانی لە شوێنیک شاردۆتەوە و دەیەوێ

دوای بخات، دەیەوێ هێمنی بکاتەوە جا نیشانی بدات، بۆیە هێمنتر گوتی، "تۆ چۆن بۆ منداڵەکانت بەپەرۆشی منیش ئاوا و زیاتریش، هەر چی بووە بووە، کچەکەم نیشان بدە، من هەوڵدەدەم کارەکە چاک بکەمەوە، من بۆ خۆم قسە لەگەڵ کەمال دەکەم، بۆ خۆم تکایان بۆ دەکەم، لەگەڵ برایەکانی ئاشتیان دەکەمەوە، من دەیانبەمەوە لای کەمال، پێم بڵێ کوا کچەکەم؟"

مریەم وەک گوێی لە بەڵقیس نەبووبێ هەر لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو، "من بە قسەی ئەوم نەکرد، من نا، من هەر لە سەرەتاوە نەمدەویست بچم، ئەوان، بە تەلەفۆن قسەکەم بۆ گێڕانەوە، گوتم بابی ئەو کچە نایەتە ڕایە، سەری خۆتان مەهێشێنن، منیش تووشی کێشە مەکەن، خوێندنەکەتان تەواو بکەن، هەرکەستان با ڕێگای خۆی بگرێ، خوا نسیبی ئێوەی بۆ یەکتر نەنووسیوە، دنیا فراوانە و هەر کامتان لەگەڵ کەسێکی دیکە بەختی خۆی دەدۆزێتەوە."

بەڵقیس بۆ یەکەم جار دەستی خستە دەستی مریەم و بە سۆزەوە گوتی، "خوشکەکەم تۆش ئازارت چێشتووە، زۆر باشت پێ وتوون و ئەوە ئامۆژگاری دایکێکی خەمخۆرە بۆ منداڵەکانی، ئامۆژگاری دایکێکە، کە دەزانێ ناموس مانای چییە."

نیوەی مریەم بەو دەستە سپی و خرپنانەی بەڵقیس توایەوە، خۆشەویستییەک لە دەستەکانیەوە هاتە ناو پێستی، لە دڵەوە گوتی، "نا، نا، ناکرێ ژن میهرەبان نەبێت، ژن هەرچەند بیەوێ دڵڕەق بێت میهرەبانی لە شوێنێکی لەشیەوە خۆی بەدەر دەخات، تا ئەبەد ناتوانێ خۆی بشارێتەوە."

مریەم کە هەردووک دەستی بەڵقیسی گرتبوو گوتی، "بە سەعات قسەم لەگەڵ کردن، پێم گوتن زانکۆکەتان تەواو بکەن، کاری ئێوە ئەوەیە، وانەکانتان بخوێنن، قوتابی دەبێ ئەوەندە هۆشی لای وانەکانی بێت، نەپرژێتە سەر هیچ شتێکی دیکە، ڕێزی ئێوە لە خوێندنەکەتان دایە، کاری ئێوە هەر خوێندنە و بۆ ئەوەش چوونە بەغدا. پێم گوتن دوای هەواوهەوەسی خۆتان مەکەون، ئاگاتان لەوە بێت ماڵتان هەیە و کەسوکارتان هەیە و مەسرەفتان لێ دەکەن و چاوەڕێن، سەر بکەون و بڕوانامەیان بۆ بەرنەوە نەک کێشە و دەردەسەری."

بەڵقیس لۆمەی خۆی کرد، لە پشت ئەو پەیکەرە بنێس و چەرمەی مەریەمەوە، چ مرۆڤێکی ناسک و هەستپەڕەکاغەز و بلووری وەستاوە، ئەو باوەڕەی لا چەسپی، کە ئینسان ئەوە نییە کە دەیبینی، نا، ئینسان ئەوەیە کە دەیناسی، ئەوەیە کە لەژێر پێستیدا شاردویەتیەوە، ئاخر مرۆڤە باشەکانیش، میهرەبانەکانیش، ئەوەندە مەحکەم خۆیان دەشارنەوە، زەحمەتە بیاندۆزییەوە.

بەڵقیس هەستایە پێ چوو جامە ئاوێکی هێنا، دەستی تەڕ کرد و ڕوخساری مات و زەرد و تۆزاوی مریەمی سڕیەوە، بسکەکانی بۆ تەڕ کردن و هەڵی دانەوە پشتەوە، مریەم وەک لە بەر دەستی پوری بێت ئارام چاوی نووقاندن، ئەو لاوانەوەیە لەرزاندی، لە ناخەوە لەرزی گرت، چەندە؟ هیچ کەسێک بەو مهرەبانییە دەستی بە سەریدا نەهێناوە، چەندە نەک بە میهرەبانی هیچ کەس بە بەزەییشەوە دەستی نەخستۆتە سەر سەری، یان دەستێکیان بە سەریدا نەهێناوە.

ژن کە مێردی مرد ئیدی بەردێکە و ئاگری لەسەر دەکرێتەوە، لەگەڵ مێردەکەی دەبێت بۆ هەتا هەتایە هەست و سۆزی خۆی بنێژێ. لەوەتەی دایکی مردووە، دایکی چراڵۆکسیەکەی ماڵی غازی کوورەچی کوژاوەتەوە، هەموو کچان باش دەزانن لەگەڵ مردنی دایکیان، میهرەبانی بۆ ئەوان لەسەر زەمین بە یەکجاری بار دەکات. کچان کە دایکیان دەنێژرێ میهرەبانیشی لەگەڵ دەنێژن. کچان کە دایکیان دەنێژرێ ڕۆحیەتی لاوانەوەی خۆیشی دەخاتە ژێر گڵەوە. نەک هەر ئەوە دڵیان لەسەر ئەوە ڕادێنن بخرێتە ناو ئاگرەوە نەسووتێ. ئەو ژنە مێرد مردووانەی ئەو ڕاستییەیان لەبیر دەچێت و پێیان وایە میهرەبانی بۆ ئەوانیش ماوە هەمیشە نائومێدن.

مریەم ئەوەندە میهرەبانییەی دایکی دابوویەی، پێی کەم نەبوو، زۆریش بوو، دەشیزانی ئەو میهرەبانییە کۆتاییی نایەت و ناکەوێ و ناشکێ، ئەو وەک مانگێک دەشێ بیداتەوە کچەکەی. کچ گڵۆپێکە تا دەستی دایکی نەکەوێتە سەر، ڕووناک نابێتەوە. مریەم هەردوو دەستە تەڕەکانی بەڵقیسی گرتن، دوای ئەوەی سەیری کردن ماچی کردن، بەکوڵ ماچی کردن. بەڵقیس لە دەستیەوە هەستی بە هەناسەی تەنها و پڕحەسرەتی ئەو ژنە تەنهایە کرد، لێ گەڕا دەستی ماچ بکات.

ژنی ڕۆژهەڵات لە لێوێک دڵنیا نەبێت دەشێ بهێڵێ بکەوێتە سەر ڕوومەتی، بەڵام دەستی نا. مریەم سەری خستە سەر سینگی بەڵقیس، هەستی بە گەرمی مەمکە گەورەکانی کرد لەسەر ڕوخساری، سەری خڕ و بچووکی وەک سەری

منداڵێک بێت بیخاتە سەر سینگی دایکی. بەڵقیسیش سەری ژنێک هاتبووە سەر سینگی، ژنێک لە شەو تەنهاتر، تاریکی بەناو دنیادا ڕۆدەچێ، لەو سەر زەمینە دڵڕەق و خوێناوییە، دوو ژن، دوو ژنی وەک گورگ برینــدار، وەک سەگ بەوەفا، وەک بەراز دڵڕەق، برینی یەکتر دەلێسنەوە، چوونە ناو ڕووناکیی یەکترەوە، چوونە ناو باوەشی یەکترەوە. ژن بۆ ئەوەی بمێنێ دەبێ دەوری خۆی بکاتە درک، بیکاتە دەرزی و سوژن، بەڵام لەناو ئاگریشدا ژن دەتوانێ بەرە دەستێک ئاگر بۆ ژنەی ڕۆ چووی ناو تاریکی پەیدا بکات، بەرە دەستێکی میهرەبان بخاتە سەر سەری.

لەوەتەی سەیداوا هەیە، لەوەتەی ماڵەکانی دەوری ئەو تانکییە خەڵکی تێدا دەژی، کەس نەیدیوە جگە لە کۆتر هیچ مەخلوقێکی دیکە، ئاوا میهرەبانانە چووبنە ناو باوەشی یەکتری.

بەڵقیس مایەوە، لەوێ هەر لە باوەشی یەکتریدا مانەوە، خۆیان نا، جەستەیان دەدوا، جەستەی ژن دەزانێ چ کۆستێکی دەکەوێ. خۆیان قورسایی کارەساتەکەیان نەدەزانی جەستەیان با، شل و ماندوو لە هەیوانەکە ڕاکشان، لە بەتاڵی ناخیاندا خەوتن، لە ناخی بەتاڵیاندا خەوتن، بەبێ ئەوەی مێرد یان منداڵ جێگایان لێ تەسک کاتەوە، خەوتن، شل و شەکەت خەوتن.

بۆنی نان بەئاگای هێنان، سالار نانی هێنابوو، گوڵنار چای لێ نابوو، ئەو ڕۆژە ئەو ماڵە دەتگوت لاپەڕەیەکە لە ئەلفوبێیەکەی باڵدار، دوو ژن وەک دوو تورەکە خوێنی خەست و بێجووڵە لەوێ ڕاکشابوون. دواتر نان و ماستیان

خـوارد ماسـتی ئـەو هەولێـرە ڕێـک تامـی گوڵـە حاجیلـەی لـێ دێ، گوڵێـک لەنـاو شـیری مـەڕدا توابێتـەوە.

مریـەم گوتـی، "ژەهـری دنیا بـە قوڕگـی خەڵکی ئـەو شـارەدا کراوە، ئـەو ماسـتە نەبێ کـەس نـاژێ، ژەهـر و تاعوونـی لـەش ڕادەماڵێ."

بەڵقیس گوتـی، "هەولێـر بـە ماسـت بەناوبانگە، ئەوەنییـە لای ئێمـە دەڵێن هەولێرە ماسـت."

هەردووکیـان پێکەنیـن، پێکەنینێکـی ژنانـە و لـە دڵـەوە، سـادەش. مریـەم ویسـتی پێکەنینەکەیـان بەبـێ خشـە تێپـەڕێ، چونکە خشـەی هاتبوو، نـەک هـەر ئـەوە، دەبـوو هیچـی نەگوتبا، قسـە دڵکونکەرەکانـی شـاردبۆوە، ئێسـتا کـە ژنـە بـاوەڕی کـردووە و ئاسـوودە دیـارە، ئـەو دڵـی نەهـات ئاسـوودەییی درۆزنانـەی بەڵقیس تێک بـدات، هیـچ نەبـێ ئەوەنـدەی دەزانـی، ئاسـوودەییی ئینسـان درۆزنانەیـە چ بـۆ چرکەیـەک بێـت و چ بـۆ سـاڵێک جیـاوازی نییـە. بەڵقیسـیش خـۆی لـە پرسـیارکردن دەدزێتـەوە، دەشـێ ئەویـش بترسـێ، لـەو قسـانە بترسـێ لـە سـینگی مریەمـدا مـاون.

دەنگـی دەرگا هـات، مریـەم لـە دەرگای کـراوەی ڕوانـی، کوڕێکـی گەنـج و تـەڕ، شـیک و نـازدار، بـە فەرموویـەک هاتـە ژووری، قـژە زەردەکـەی بەسـەر ڕوخسـاریدا پـەرش ببـوو، فینکایەتییـەک کەوتـەوە دڵـی بەڵقیس، گوتـی، "ئازاد چۆن پەیدا بـووی؟"

ئـازاد کـوڕە هـەرە بچووکەکـەی بەڵقیـس، بیسـتودوو سـاڵ و شـتێک، جمکەکـەی نیـان، ئـەو کاتـە بەڵقیس شاگەشـکە بـوو، کـە هەردووکیـان کـوڕ نەبـوون، حـەزی دەکـرد هەردووکیـان

کچ بان، ئەو کات ئێستا نا، کە هێشتا نیان ماڵی کچی وێران نەکردبوو. کچێکیش بەرەکەتە، ئەو نیان بوو، ئەویش ئازاد، نیان نزیکەی چارەکێک لە ئازاد گەورەتر بوو، کە پێیان دەگوت گەورەتری، ئەو هەمیشە دەیگوت، "من بەو چارەکە پیر بووم، هەموو ساڵەکانی تەمەنم بە لایەک و ئەو چارەکە بە لایەک." ئەوەش هەستێکی وای دابوویە، کە نیان گەورەیە یان گەورەترە وەک ئەوەی هاوزای فیرعەون بێت. هەردووکیان لە ڕۆژێکی زستانی هەزار و نۆسەد و شەستوپێنج لەدایک بوون، ڕۆژێکی هەتاو بەڵام سارد، ڕاستە هێشتا بەفر گەمارۆی شاری دابوو، بەڵام خوڕەی جۆگەلە و ئاو نیشانەی توانەوە و شکاندنی بەستەڵەک بوو، لەگەڵ سپێدە کچە بەگریانێکی تیژ سڵاوی لێ کردن، نیان بوو، هەتاوی ئاڵتونی سەری گڵە زەردەی ئەنگاوتبوو، دوای چارەکێک کەمتریش کوڕەکەش بە هەناسەتەنگی و زریکەوە لەدایک بوو، کەمال ئاسوودە لەوەی ژنەکەی بەبێ نەخۆشخانە ڕزگاری بووە، گوتی، "ئەوەش ئازاد، هەم ئازادیێک بۆ خوشکی و هەم ئازاد بوونێک لە ئازار بۆ بەڵقیس و هەم ئازادییەکیش بۆ کورد."

کەمتر لە دوو ساڵ بەسەر شەهیدانی حامییەدا تێپەڕیبوو، کەمال وێنەی خوێناویی ئەو ڕۆژە و قوربانییەکانی خێزانەکەی هەرگیز لەبیر ناچێتەوە.

مامە غالی کە بەشێکی گەورەی هەیبەتی خێزانەکەیانە، پەیوەندیی بەو پیاوەوە هەیە، مامە غالی ئەو ڕۆژە دوای کوڕەکەی کەوتبوو، ئەویش نەهاتەوە، نەهاتنەوەی کوڕەکەیان واتا ئامۆزاکەی کەمالیان بیر چووبۆوە، هەمووان لە خەیاڵی

مامە غالیدا بوون. نەجمی حەسەنی شووشە، هاوسێ کۆن و دۆستە نزیکەکەی ئامۆزا گیراوەکەی، ئەو کاتە لە حامییە سەرباز بوو، ماڵی ئەو شووشەیە ماوەیەک پێش کوشتارەکەی حامییە کەوتبوونە بەغدا، هەر لە سەروبەندی ئەو ڕۆژنەدا، کە هەمووان بەدوای سۆراغی مامە غالی و کوڕەکەیدا وێڵ بوون، چووبووە لای کەمال، نەجم وەک شکانی شووشەیەک گریابوو، دەمانچەکەی دابووە دەستی کەمال و گوتبووی، "بمکوژە، من خیانەتم کردووە، من سەربازی ئەو دڕندانەم."

کەمال هەستابووە پێ، سوورسوور ببوەوە، هاواری کردبوو، "بۆ تۆ چیت کردووە، تەقەت لێ کردوون؟ هەی زۆڵی حەرامزادە. هەواڵی مامم نازانی؟"

نەجم لەو قسە دەترسا، لە لێپرسینەوە و خیانەت دەترسا، "من تەقەم لێ کردبن؟ من چەکم پێ بوو، لە بەغداوە لەگەڵیان هاتبووم، بەڵام..."

کەمال پرسیی، "بەڵام چی، هەی..."

نەجم بە تکای هەڵەکارێکەوە، گوتی، "من، هەموو سەربازەکان ئەوانەی لەناو حامییە مابووینەوە دیتمان، من دیتم خەڵکەکەیان هێنا، پێشتر لای دەروازەکە ڕایان گرتبوون، دەمویست بیانناسمەوە، هێنایاننە ناو گۆڕەپانەکەی نزیک ئەو ژوورەی ئێمە پشوومان تێدا دەدا، من ئەژنۆم شکابوو، بەڵام ئەوان نا، گیراوەکان نا. هەرکەسیان دەست کەوتبوو گرتبوویان، میوەفرۆش و نانەوا و قەساب، قوتابیشیان لەگەڵ دابوو. گڕ لە چاوی هەموو ئەفسەرەکانمان دەباری، جنێویان بە کورد و دار و بەرد دەدا، لای تۆ ددان بەوە دادەنێم..."بە چی؟ بە پیاو کوشتنت؟ بە تەقەکردنت لە قەومی خۆت؟ هەی

دوژمن، هاتوویە بەردەمیشم!"

"نا، ئا من دان بەوەدا دەنێم کە بۆ یەکەم جار، هەستم کرد کوردبوون چ بارێکی قورسە بەسەر شانمەوە، چ بەلاوموسیبەتێکە، ئەوان جنێویان دەدا، من بیرم لەوە دەکردەوە لەو گرباران و ڕق و تووڕەییەدا چاویان نەکەوێتە سەر من، گەورەترین نزام ئەوە بوو لەبیریان بچێتەوە کوردم. وام دەزانی هەموو گیراوەکانیش سەیری من دەکەن، خودایە کەسیان نەناسمەوە، خودایە کەسیان من نەناسێتەوە."

کەمال قسەکەی پێ بڕی، "عوسمان، عوسمانی مامە غالیمت دی، ئەی مامە غالیم؟"

نەجم کە هیچ ئەسەرێکی شووشە بە دەنگیەوە نەمابوو جگە لە هاڕەکەی، گوتی"من دەمویست هەڵەیەک نەکەم، دەمویست خۆم بشارمەوە، نازانم چاوم ڕاست کەوتە سەر چاوی، پەشۆکام. ئەفسەرێکی ڕەشتاڵەی خوێنشیرینمان هەبوو، پێشتر خوێنشیرین، خەڵکەکەی وەک نیشانە ریز کردن، یەکەم کەس منی لە ریزی سەربازەکان دەر هێنا و من هێشتا چاوم لەسەر چاوی بوو، چوومە بەردەمی، لوولەی تەفەنگەکەم لە عوسمان کرد، ڕاست لەسەر دڵیم دانا..."

عوسمان هاوزای نەجم بوو، ئەو نەجمە شووشە خیانەتکارە، هاوپۆلیش بوون، دۆست و نزیکی یەکتر، بەڵام کەمال دەزانێ خیانەتی گەورە هاوڕێکان دەیکەن. نەجم دڵی هاتبووە سەر لێوی، "کەمال ها ئەو دەمانچەم لێ وە ربگرە و بمکوژە. من هیچ و سپڵە و بێدەماغم، بەکەڵکی ئەوە نایەم یەک چرکەی دیکە بژیم. من هەرگیز نەمدەویست ئەوە ڕوو

بدات، مردبام و ئەوەم نەدیبایە."

کەمال بڕیاری دابوو بیکوژێ، بەڵام کە هەموو شتێکی زانی، کەوتبووە گومانێکی قووڵەوە، دەبێ ئەو نەجمە خیانەتکارە عوسمانی ئامۆزای کوشتبێ، لەدەستی دێ، خیانەتە گەورەکان دۆستە هەر نزیکەکان دەیکەن، ئەوەتا خۆی دەڵێ ڕاست لەسەر دڵی.

نەجم گوتی، "تفەنگەکەم ڕاست لەسەر سینگی دانا، لە چاوی عوسمان ترسام، ترسیشم تێدا دیت، بە ئەفسەرە ڕەشتاڵە خوێنشیرینەکەم گوت، "ئەو کوڕە ئامۆزای منە، هیچ خیانەتێکی نەکردووە، پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە، من دەبمە کەفیلی، بەهەڵە گرتووتانە، تکایە ڕێگای بدە بڕوات. ئەفسەرەکە پێی گوتم تۆ سەربازیت پەیوەندیت بە خزمایەتی و هاوخوێنییەوە نییە، تۆ پەیوەندییت بە فەرمان و جێبەجێکردنەوە هەیە. تۆش سەربازیت بۆ ئەوەی بیسەلمێنی بەڕاستی دڵسۆزیت و سەربازی ڕاستەقینەی، ئەو کوڕە زەردە گوللەباران بکە."

کەمال چیدی نەیتوانی بەرگەی ئەو چیرۆکە مەرگەساتەی نەجم بگرێ، سینگی گرت و بەوەی باش بوو ئەسەری شووشە بە لەشیەوە نەمابوو دەنا هەموو دەستی دەبڕی، "دەبوو زوو بمزانیبایە، ئێوەن دوژمنەکانمان، لەوەتەی هەن ڕیسوا و خزمەتکار و پیاوکوژن."

نەجم کەوتە سەر زەویەکە، بەگریانەوە گوتی، "تۆ ڕاست دەکەی من شایانی کوشتنم، ئەوەتا دەمانچەکە بمکوژە..."

شتێک کەمالی هان دا زیاتر دەربارەی مام و ئامۆزاکەی بزانێ، وەستا، نەجم بەردەوام بوو، "ئامرەکەم فەرمانی پێ

کردم، دەمانچەکەی خستە سەر سەرم، هاواری کرد و لێم تووڕە بوو، لە بەرچاوی هەموویان تفی لێ کردم، خستمیە سەر ئەرزەکە و بە پێ هاتە سەر سەرم، سوێندی خوارد ئەگەر تەقە نەکەم و نەیکوژم، بمکوژێ، ویستم تەقە بکەم، ویستم خۆم و ئەویش بکوژم، من پیاوێکی ئازا نیم، بەڵام نەمتوانی، ڕاست چاوم دەچووە سەر چاوەکانی عوسمان. من تەقەم نەکرد، من دەستی خۆم دەبڕم تەقە لە هاوڕێکەم ناکەم، عوسمان برام بوو، هەموو نهێنی یەکترمان دەزانی، چی نامەی نهێنیم هەیە ئەو بۆی نوسیوم، ئەو، ئەو ئەفسەرە عەرەبە ڕشتاڵە خوێنشیرینە، پێشتر خوێنشیرین بوو، ئەو عوسمانی هێنایە دەرێ، یەخەی چاکەتەکەی گرت و تا ناوەندی مەیدانەکەی هێنا، لە بەردەم هەمووانی ڕاگرت، پێی گوت، 'کوڕی گەنج لەبەر ئەوەی خزمی ئەو پیاوە بەڕێزەی ئازادت دەکەم، بۆ ئەوەی بیسەلمێنی بەهەڵە گیراوی تفێک لەو خەڵکە سووک وڕیسوایە بکە کە دوژمنایەتی ئێمە دەکەن، تفێک لە کورد بکە،' عوسمان هیچی نەگوت، ئەو گوتی، 'دەی تف لە سەرۆک و چەکدار و پیاوکوژەکانتان بکە، کە لەپێناو دوژمنانی وڵاتەکەمان ئێوە دەخەنە دۆزەخەوە،' عوسمان دیسانەوە هیچی نەگوت، ئەو دەمانچەکەی ڕاکێشا و لەسەر سەری ڕاگرت، گوتی، 'جنێو بدە.' پێش ئەوەی دەست بێنێتەوە هاوارم کرد گوتم، 'گەورەم لاڵە، ناتوانێ قسە بکات.' ئەو نەیبیست و بەسەریدا هاواری کرد، زیاتر لێی توند کرد، لوولەی دەمانچەکە چووبووە ناو پێستی لاجانگیەوە. لەو کاتەدا مامت غالییە زەرد-هەر وایان پێ دەگوت، لە منداڵی قژی زەرد، دەموچاویشی زەرد، مووزەرد

بوو، سەردەمی شۆڕش نەبێ ماوەیەک پێیان دەگوت غالیە چەپڵە ئەویش هەر وەک شۆڕش زوو لەبیر چۆوە- لەناو خەڵکەکە هاتە دەرێ و گوتی، 'جەناب دەست لەو منداڵە بێزمانە هەڵگرە من سەرکردەیانم جنێوەکان بە من بدەن.' ئەو ئەفسەرە خوێڕییە لە مامە غالی ترسا، کە بێپرس لە ڕیزەکە هاتبووە دەرێ و بەهەیبەتێکی سەیرەوە بەرەو ڕووی هات، هەر لەو ترسەش بوو، خێرا دەستی سووڕاند، ڕاست گوللەیەکی لێ دا، گوللەکە بەر شانی ڕاستی مامت کەوت و ئەو نەکەوت، عوسمان شێت بوو، زمانیشی کرایەوە، هاواری کرد، 'باوکە،' ئەفسەرەکە چەند گوللەیەکی دیکەی تەقاند، عوسمان پەلاماری دا، گرتیان، مامت هەر ئەو گوللەیەی شانی پێکابووی، زەعیم سدیق ئەو پیاوە بوغزن و گرگنە، بۆ خۆی لەو سەرەوە هاواری کرد، 'دەست ڕاگرە مولازم دەست ڕاگرە،' دیار بوو لە پەنجەرەوە چاوی لێیە، ئەمری کرد، 'هەموو سەربازە کوردەکان چەک بکەن.'

لە ژووری پشوودانەکەمان بەندیان کردین، مامە غالی هێشتا بەپێوە بوو، زەعیم سدیق ڕووی لە هەمووان کرد، 'هەرکەس جنێوێک بە شۆڕش و سەرکردە خائینەکەتان بدات، با بێتە دەرێ و بڕواتەوە ماڵی خۆی.' کەس نەبوو، دووبارەی کردەوە، کوڕە پاقلەفرۆشە پشتکووڕەکەی بەهیە سوور هاتە دەرێ، نەیتوانی بڕوات، کەوتە سەر چۆک و گوتی، 'هەموویان گەوادن.' زەعیم سدیق پێکەنی و گوتی، 'عافەرم، چۆغ مەردی.' عوسمان خۆی ڕاپسکاند، بەرەو باوکی ڕای کرد، هێشتا مامە غالی بەپێوە بوو، زەعیم سدیق بە ماناوە، بە هێمای ئەمرکردنەوە، سەیری سەربازەکەی

تەنیشتی کرد، ئەو دەستی لەسەر پەلەپیتکە بوو، دەستی توند کرد، عوسمان نەگەیشتبووە لای باوکی وەک چۆلەکە لە هەوادا پێکرابێت، چەند تەقلەیەکی لێ دا و کەوت، مامە غالیە زەرد تەکانی دا هەڵی گرێتەوە، بەورەی ڕۆژانی چەپڵەوە وەستا و نەچووە پێش، دەموچاوی ڕەش ببوو، سەد ئەوەندەی ئەو گوللەیە تەزاندی کە بەر شانی ڕاستی کەوتبوو. زەعیم عەلی چووە تەنیشتی و پێی گوت، 'تۆ هەر سەرۆک بە، پیاوی ئازا، ئێستا دەتوانی هەر فەرماندە بیت، ئەگەر بتوانی خیانەتکاری سەرەکی ناو ئەو گروپەم بۆ دەستنیشان بکەی،' دەستی بۆ ریزی خەڵکە بەدیلگیراوەکە ڕاکێشا، 'دەتوانی لەو سەگە سوورەوە دەست پێ بکەی،' دەستی بۆ عوسمان ڕاداشت، کە لەتاو ئازاری برینەکەی توند زمانی خۆی گەستبوو، غالییە زەرد بەئازارەوە ڕووی خۆی وەر گێڕا، زەعیم سدیق لە بەر خۆیەوە بەڵام بە دەنگەوە گوتی، 'فەرماندەی چی، ترسنۆکی ژن حیز.' غالی دەیڕوانییە ڕوخساری کوڕەکەی، شەرمی لەو جنێوە کرد و چاوی نووقاند، هەرچی تفی ناودەمی هەیە کۆ کردەوە و لە ڕووی زەعیم سدیقی کرد، ئەو دەمانچەکەی کەمەری خۆی ڕاکێشا و لەسەر سینگی دانا و گوتی،

'من دەزانم ئەو دڵەت چۆن ئاگردەم.'

سووڕایەوە و گوللەیەکی لە پشتەسەری عوسمان دا، سەری عوسمان وەک مەرکانەیەکی شکاو بێت، خوێن بە هەموو لایەکیدا فیچقەی کرد. مامە غالی وەک پڵینگێکی بریندار هاواری کرد،

'پیاو کوژی خائین.'

خۆی فڕی دایە سەر زەعیم سدیق، کە هێشتا لێی نزیک بوو، ئەو لەناکاو کشایەوە و غالی کەوت، هەم بە ئازاری عوسمانەوە، هەم بە گوللەی سەر شانی و هەم بە خۆلادانی ئەو زەعیمە فێڵبازە، ئازارێکی سەخت، من تفەنگم پێ با نەمدەهێشت لەوە زیاتر ئازار بچێژێت، لەو کاتەدا ئەفسەرە عەرەبە ڕەشتاڵەکە دەستڕێژێکی لێ کرد، هەندێ لە گوللەکان بەر کورە ناتەواوەکەی بەهیە سوور و نیوە زیاتریشی بەر ئەو کەوتن، مامە غالی کەوت، کەوت و تلایەوە، لەسەر سک و سینگ تلایەوە، هێزی لێ بڕاو خامۆش بوو."

نەجم وەک ئەوەی هەر ئێستا مامە غالی و عوسمان کوژرابن، فرمێسکی دەباراند، دەیویست خۆی بخاتە سەر پێڵاوەکانی کەمالی بەزاز، کەمال لە لاشەی بێگیانی مام و ئامۆزاکەی خامۆشتر دانیشت، نەجم گوتی، "یەکەیەکە ئەوانی دیکەشیان گوللەباران کردن، دەرگای ئێمەیان کردەوە تا مەیتەکان کۆ بکەینەوە، من بەرەو عوسمان چووم و ڕام کێشا تا بەرزی کەمەوە، وەک داکوترابێت نەدەجوولا، کە سەیرم کرد مامە غالییە توند دەستی چەپی گرتووە، بەو گرتنەوە هەردووکیان ڕەق ببوون. من تاسام و کەوتم، بەسەر خوێنی عوسماندا کەوتم."

***

جمکەکەی نیان، ئازاد دەبوو ناوی عوسمان بێت، بەڵام کەمال ئەوەندەی پێویست بێت، بە دەست یادەوەری عوسمانی ئامۆزایەوە تلابۆوە. کەمال بەو ناوگۆڕینەش ڕزگاری نەبوو،

چونکە ئازاد وێنەی دووەمی عوسمانی غالییە زەردی مامی بوو، هەر بەیادی ئەوانیشەوە ناوی نابوو ئازاد. مریەمە ڕەش کە دیتی زانی، کوڕی بەڵقیسە، زانی برای نیانە، ترسا و مەحموودی بیر کەوتەوە، هەڕەشە و دەمانچەکەی لەسەر سەریان ڕاگرتبوو. بەڵقیس هەستی بەو ترسەی مریەم کرد، بەرەو ڕووی ئازاد چوو، بردیە لاوە، بەڵام مریەم گوێی لێ بوو پێی گوت، "ئەو ژنە تەنهایە، کوڕەکەشی ناتەواوە، جگە لەوە ئەوانە هیچ خەتایەکیان نییە، شتەکەش وانییە وەک بۆ ئێمەیان باس کردووە، تەنها هەوڵێکیان داوە و وەک کچی خەڵک داوایان کردووە و تەواو، ئەو ژنە بۆ خۆیشی ئامۆژگاریی کردوون، پێی وتوون، ڕێزی خۆتان و خێزانەکانتان بگرن و خوێندنەکەتان تەواو بکەن. لای ئێمەوە هەڵە تێگەیشتنێک هەیە. تۆش هەڵەکە گەورەتر مەکە."

مریەم ویستی بڵێ ڕاست دەکات، ویستی بڵێ کوڕەکەم دایکت ڕاست دەکات من وام گوت بەڵام ئەوان بەقسەیان نەکردم، ئەوان بەقسەیان نەکردم و گوێیان بۆ نەگرتم، سەد جاری دیکە پێم گوتن ئەوان بەقسەیان نەکردم، چەندان جاری دیکە ناردیانمەوە سلێمانی، ناردیانمەوە بازاڕی بەزازەکان، بۆ لای کاک کەمالی توورە و ئاگر، من بێئومێد و شەرمەزار، ئەوان بەکوڵ و پڕخۆشەویستی، من ترساو و لەرزۆک ئەوان دڵنیا و کەللەڕەق، من مردوو و ئەوان زیندوو.

ئازاد هەر لەسەر بەڵقیسەوە ڕوانییە چاوەکانی مریەم، پرسیی، "جا بەقسەیان کردووە، جا تۆ باوەڕت بە قسەکانی هەیە؟"

بەڵقیس دەستی بە بەرۆکیدا کرد، وێنەکەی نیان و

سەروەر و برادەرە قژبژەکەیانی دەر هێنا، گوتی، "دەزانم تەنها تۆ، تەنها تۆ لە نیان دەگەی، تەنها تۆ دڵت بۆی دەسوتێ، من باوەڕم بەو ژنە هەیە، سادە و سەر ڕاستە، بەڵام دەبێ ئەو کوڕە، ئەو کوڕەی لە وێنەکەدا لەگەڵیانە بدۆزینەوە، ئەو ئاگای لە هەموو شتێکە."

ئازاد سەیری وێنەکەی کرد، سەیری چاوەکانی نیانی کرد، هێشتا بەرائەت و خۆشەویستی، هێشتا وێنەی خۆی، ڕوومەتە پانەکەی، لووتە باریکەکەی هەر دەتگوت بۆ خۆی لەناو وێنەکەدایە، وێنەیەکی زۆر ئاسایی و دۆستانە. باخچەی کۆلێژێک، ڕوانییە سەروەر هەر وا بۆ چرکەیەک لە دڵی خۆیدا گوتی، "خوشکەکەم نازانم تۆ دڵت بە کوێی ئەو نەگریسەدا چووە؟" ڕوانییە سەردار، سەرداری وەک ئاشنا هاتە بەرچاو، بە تایبەتی زەردە خەنەکەی. پرسیی، "جا ئێمە ئەو کوڕە چۆن بدۆزینەوە؟ ئەو ژنە ناوونیشانەکەی نازانێ؟"

نا مریەم ناوونیشانی ئەو کوڕەی نەدەزانی، خوێندکارانی زانکۆ بەڕەوە وێنەی کوڕەکان دێننەوە ماڵێ، بێناوونیشان و زانیاری، بەڵقیس بەرەو مریەم سووڕا و بە شێوەیەک مریەمیش گوێی لێ بێ، بە ئازادی، گوت، "لێی دەپرسم."

ئەو پرسیارەی نەکرد، تەنها گوتی، "جا ئەوان بەقسەیان کردی، ئێستا من کچەکەم چۆن بدۆزمەوە؟"

مریەم گوتی، "هەموو شتێکم پێ گوتن، گوتم هێشتا منداڵن، کەسوکارتان هەیە، بەبێ قسەی ئەوان نابێ هیچ بکەن، دوای خەیاڵی ڕۆژانەتان مەکەون، ئێوە تەنها موڵکی خۆتان نین، چەند ڕۆژێک ئارام بگرن و هەموو شتێکتان بیر دەچێتەوە، بەو خەونە ناخۆشەی خۆتان ئێمە وێران مەکەن."

کە زانی بەڵقیس هەر چاوەڕێیە ئەوەشی بۆ زیاد کرد، "لەکوێن، هەر لە بەغدا لە شوێنی خۆیانن."

هێشتا ئازاد وەستابوو لە وەڵامی ئەو قسانەی دایکیدا، سەروەر بۆی نووسیبوو،

"مریەمە گوڵەکەم، من دوای خەیاڵ نەکەوتووم، دەشێ نیان خەون ببینێ، بەڵام من دەبێ هەموو شتێک تەواو بکەم پێش ئەوەی بەخەبەر بێت، بۆ منیش خەوە، بەڵام هەریەکەمان بە شێوەی خۆی. یەکەم جارە من هەست بە جووڵانی خوێنی ناو دەمارەکانم بکەم، خوێنم ڕۆژە ڕێیەک فڕکەی دەڕوا، ئێمە تازە بڕیاری خۆمان داوە، من جگە لە تۆ، خانومانە جوانەکەم، هیچ دەروازەیەکی دیکەم نییە پێیدا بچمە ناو دنیا، پێیدا بچمە ناو ژیانی ڕاستەقینە. تۆ دەزانی من کوڕی گەورە بازرگان و سەرخێڵ نیم، تا بیاننێرمە خزمەت بەزازە بەناوبانگەکەی شار، بۆیە بەردێکی لەسەر دابنێ و خۆت مەکە خاوەنمان، با کەس شوێنیشت نەزانێ، بڵێ هەر نایانناسم."

مریەم وای کردبوو، بەردێکی لەسەر دڵی دانابوو، هەموو ئەوانەی بەردیان لەسەر دڵیان داناوە، دەزانن فیچقەی خوێن لەبن قورساییی بەردەوە چەند بەئازارە. بەردی ناو دڵ ئاسانترە، دەشێ ڕەنگ بگرێ یان بتوێتەوە، بەردی ناو دڵ دەچێتە ناو دڵی دڵدارەوە و لەگەڵی دەبێتە دۆست، ئازار لە بەردی سەر دڵدایە. دوو بەرد کەوتبوونە سەر دڵی مریەم بەردی سەروەر و بەردی نیان. خەڵکیش تامی ئەو بەردانە دەزانێ، خەڵکیش فیچقەی خوێنی دڵی ژێر بەرد دەناسێتەوە.

بەردی لەسەر دڵی خۆی دانابوو، خۆی گوتی ئەو

سەروەر ناناسێ، سالاریشی وا فێر کردبوو، ئەوەشی بە خیانەت دەزانی خۆ لە مندالّی خۆت نەناس بکەی، یەکەم جار نییە مریەم خیانەت دەکات. لەگەڵ مەحموود بەڵەکی مێردیشی خیانەتی کرد، خیانەتی گەورەی لەگەڵ ئەو کرد، ئەو جۆرە خیانەتانەی مایەی لێبوردن نین و هەرگیز دڵی ژن جێ ناهێڵن، جا ژنی کورد کامیان خیانەت کارنین، لەو جۆرە خیانەتانەش، ئەو شەوەی بردیان، دواشەو، تەنها دڵی مریەم دەیزانی دواشەوە، دەنا چەندین شەوی دیکە بردبوویان، مەحموودیان بۆ لێدان و ئەشکەنجە و مردن برد، ئاخر مەحموود شیوعی بوو، نەگبەتی ئەو شیوعیانەش لەوەدا بوو، لە کەلاوەکانی خۆیانەوە دەیانویست دنیا ئاوەدان بکەنەوە، بۆ چی شیوعییەت جگە لە مردن و وێرانکردن، هیچی دیکەی پێ بوو بیداتە ئەندامەکانی. جگە لە ئەشکەنجە و دابڕان دیارییەکی دیکەی پێ بوو بۆ خۆشەویستەکانی، شیوعییەت تەنها بۆ نینۆک هەڵکەندن و هەڵواسین و هەتا خستنە حەوزی تێزابەوەی ئازیزانی هاتبوو. سەر دەستەکەیان لە یەکەم ڕۆژەوە پێی گوتبوو، "دەتگرن، دەتکوژن، دەتبڕن."

مەحموودیش لەناو خەڵک بە دەنگە گەورەکەی دەیگوت،

"من سەرشۆڕ ناکەم، مەڕیش بم، تف لە قەسابەکەم دەکەم."

بەگاڵتەشەوە دەیگوت،

"قەسابەکانی هەولێر وا نین، ئەوان لە جوانی خوێنی مەڕەکانیانەوە هەموویان بوونە شیوعی."

مریەم خیانەتکار بوو، ئەو شەوە، دواشەو کە مەحموودیان برد، ئەوانەی بردیان مەفرەزەیەکی تەواو

بوون، دوو پیکابی پڕسەرباز و ئەمن، تۆزێک دوور لە ماڵی مەحموود وەستابوون، ئەوەش دواجار بوو ماڵی مەحموود بێت، لەو شەوەوە بووە ماڵی مریەمەڕەش، مەحموودیان ڕاکێشایە دەرێ و توند دەرگایان لەسەر مریەم داخست. ئەو لەودیو دەرگاوە گوێی لێ بوو، گوێی لە دەنگی زللە و شەق و قۆنداغەتفەنگەکانیان بوو، مەحموود نەیگوت ئاخ، نا نەیگوت ئۆف، تەنها گوتی، "هەی پیاوکوژینە، هەی چەتەینە." ئەوان عەرەب بوون، کورد و تورکومانیشان وەگەڵ کەوتبوو، ئەوەش سەیر نییە، چونکە ئەگەر ئینسانیش دایە دڕندەیی سێبەری خۆشی دەسوتێنێ. یەکێکیان پێی گوت،

"هەی ژن حیزی بێ کەرامەت."

دیار بوو مەحموود دەستی لێ وەشاندووە، توندتر لێیان دا، مریەمی خیانەتکار دەرگای نەکردەوە، هاوارێکی نەکرد، بسکی خۆی نەڕنیەوە، نەک لەبەر ئەوەی ئازا بوو، مەحموود پێی گوتبوو،

"ژنی پاڵەوانەکان خۆڕاگرن، چاونەترسن."

ئەو وا نەبوو، نە خۆڕاگر بوو، نە چاونەترس، بەلام ویستی مەحموود لەو دواشەوەیدا بێئومێد نەبێت و وەک پاڵەوان بڕوات. نا قریشکەیەکی لێ نەدا، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی تازە مەحموود بە دارەمەیتیش نایەتەوە بەر ئەو دەرگایە، دەرگاکەی نەکردەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت،

"با منداڵەکانمان زراویان نەچێ، با بەهاوارەوە لە خەو ڕانەپەڕن."

ئیدی لەو شەوەوە یەکەم بەردی بەکێشی ئەو قەراتەی لەسەر دڵی خۆی دانا، هەر لەو کاتەوە دەیزانی فیچقەی خوێن لەبن

بەردیدا چەند بە ئازارە. چووە ژووری بۆ لای منداڵەکانی، ڕاکشا بە جۆرێک دەستی بگاتە هەموویان، دەستێکی خستە ناو قژی گوڵنار و سالاری بە خۆیەوە نوساند و بەسەر ئەویشدا دەستی گەیاندە دەستی سەروەر، نەیزانی خەونە یان ڕاستی تا بەیانی گوێی لە دەنگی گەلەگورگێک بوو، هەر لە بەردەرگایەکەیان پیاوێکیان شەقوپەق دەکرد، هاوسێکانیش ئەو شەوە گوێیان لە سزادان و هاواری ئەشکەنجەدان ببوو، تا نوزەی تێدا مابوو.

مەحموود نەهاتەوە، خیانەتی هەرە گەورەی مریەمیش ئەوە بوو ژیا و نەمرد. جارێکی دیکە ئاگری کردەوە، چای لێنا و چێشتی لێنا و هەڵمەکەی بە ئاسماندا چوو، خیانەتی هەرە بچووکیشی ئەوە بوو بە منداڵەکانی نەگوت چاوەڕێ مەکەن، چونک ئەوان تەنها بابیان نەمرد، هێزی چاوەڕێکردنیان مرد و کۆتایی هات. ئەوان لە بەردەرگا چاوەڕێیان دەکرد، هەر پیاوێک بە زەرف و عەلاگەوە لە دورەوە دەر دەکەوت، سەرەتا بە دەنگەوە، دەیانگوت،

"ئەوە بابمان هاتەوە."

غاریان دەدا و تا نیوەی ڕێش دەڕۆیشتن، لە بەر خۆیانەوە دەیانگوت، "هەو نەبوو."

مریەم ئەوەندە ڕەش ببوو ئیدی ڕەشی تازەی لەسەر نەدەناسرایەوە، ئەو نەیدەزانی شیوعی چییە، مەحموودیش زۆر نا، مەحموود تەنها ئەوەندەی دەزانی کە لێیان دەپرسیی،

"بۆچی خۆت بەکوشت دەدەی." ئەو دەیگوت، "من تازە هیچ، منداڵەکانم دەبێ بەئازادی بژین."

پێیان دەگوت، "تۆ دەچی و کۆیلایەتی بۆ منداڵەکانت جێ دەهێڵی."

مریەم نە ئازادەکەی بەڵقیس و نە ئازادییەکەی مێردەکەی، هیچیانی نەدەناسی، لە دڵەوە جەرگی بۆ مێردەکەی سووتابوو، کە دەیگوت تازە من چووم، لێی دەپرسی، "ئەوە چ ئازادییەکە بۆ منداڵەکانت، کە تۆ نەمێنی؟"

مەحموود دەیگوت، "دەیەوێ، ئازادی خوێنی دەوێ، من ڕووشکاوی بەر دەستی کوڕە ئاغا و دەرەبەگم. ئەو وڵاتە بەشی هەموومانە، ئەوان کەیف و سەفای پێ دەکەن، ئێمە نانی شەومان زەحمەتە. دەبێ بڕووخێ..."

ئیدی مریەم هیچ تێنەدەگەیی، بەڵام هەستی بە ترسێک دەکرد وەک ئەژدیها سەری کێشاوەتە ناو ماڵەکەی. زەحمەتی پاڵەوانیەتی مەحموود تەنها گرتن و لێدان و بێکارکردن نەبوو، ڕۆحی مریەمیشیان ئەشکەنجە دەدا، ئەو جارەش لە گەرماوی ئیسکان، کە ژنەکان باسی گرتنی شیوعییەکانیان کرد، ژنە زل و قەبەکەی خدری بەقاڵ لە کاتێکدا مەمکە گەورەکانی لەبن ژێرکراسەی گیر نەدەبوون، چاوی لە چاوی مریەم بڕی و گوتی، "با بیانگرن، دەڵێن ئەو شیوعییانە دەچنە زگ خوشک و دایکی خۆشیان."

مریەم جارێ لە قسەکە نەگەیشتبوو، هەر لەبەر ئەوەش نەمردبوو، بێگەردی ئەڵماسە شروب، بەتوندی بەرەو ڕووی چوو، گوتی، "چییە خۆ نەهاتوونە زگ تۆ، جا تا تۆ لەوێ وەستابیت بۆ دەچنە لای خوشکی خۆیان؟"

هێواشتر گوتی، "نازانم خدرە سیسی مێردت چۆن بە تۆ ڕادەگات، (تۆزێک پێکەنی) نا پێشت ڕاناگا، بۆیە هەموو ڕۆژێ فەوجێک ئەمن دێنێتەوە."

ژنە پەشۆکاوەکەی خدری بەقاڵ گوتی، "کەس قسەی

لەگەڵ تۆ نەکردووە بێچاوەڕوو."

خوشکەکەی خدری بەقاڵ گوتی، "براژن دەم مەخە دەمی ئەو قەحبەیە."

بێگەرد پێکەنی و گوتی، "ڕاست دەکات کوڕانی گەڕەک لەسەر من لاقی ئەبو سامریان شکاند، دیڵە بەبا، خۆت تێکەڵ مەکە، ئەو سستەرە مەسیحییەی جیرانتان نەبا، هەتا ئێستا گەڕەکێک منداڵت فڕێ دابوو."

بێگەردی ئەڵماسیش کەمی نەکردبوو، تەنها ئەوە بوو ئەو بۆ خۆی کوڕەکانی هەڵدەبژاد، ئازا و مەرد بوو، کەس نەیدەتوانی پەنجە لە پەنجەی بدات، ئەگەر حەزیشی لە کوڕێک با، پارەی خۆشووشتنیشی بۆ دەدا. ئەویش گیرا، نازانرێ لەسەر شەڕەکەی گەرماوی ئیسکان گیرا، یان لەسەر ئەو بەیانانەی بە دینگەکانی تانکی سەیداوایانەوە هەڵواسیبوو، ژنەکەی خدری بەقاڵ لای خەڵکی گوتبووی، "لە زیندان حەقی منیان لەمستی ناوە، ئێستا سکی پڕە."

بەردەکانی سەر دڵی مریەم ڕۆژبەڕۆژ زۆرتر دەبن، ئەو دڵە بێهێزە و ئەو بەردە قورسانە.

ئازادیی مەحموود چوو، بەڵام ئازادی بەڵقیس هێشتا وەستاوە، بەڵقیس نەیدەویست ئەو خۆشەویستییە تێک بدا کە بە فرمێسک لەگەڵی دروست کردووە، بەرامبەری دانیشت و گوتی، "خوشکە مریەم دڵم بە بەریەوە نەماوە، پێڵاوەکانت دەخەمە سەر سەرم، تەنها پێم بڵێ، نیان ئێستا لەکوێیە، لە شوێنی خۆیان مەبەستت چییە؟"

مریەمەڕەش هەردوو دەستی بەڵقیسی گرت و ماچی کردن گوتی، "من هەموو شتێکم پێ گوتن، ئەوان گوتیان

باش، ڕازی بوون، ئیدی ئاگام لێیان نەماوە."

ئازاد وێنەکەی لێ نزیک کردەوە و دەستی لەسەر سەردار دانا و پرسیی، "بەڕاستی پێم بڵێ ئەو کوڕە دەناسی، ناوونیشانی؟"

لەو کاتەدا مەحموودی کوڕی بەڵقیس گەیشتبووەوە بەردەرگا، بانگی ئازاد و دایکی کرد، "وەرنە دەرێ، من ئەو ماڵە دەسووتێنم."

بەڵقیس بەرەو مەحموود چوو، هاواری کرد، "کوڕەکەم لەو ڕۆژەوەی لەدایک بووی ئاگرت بە دەستەوەیە، ئەو ژنە بەستەزمانە چی بکات، هەموو شتێکی بە من گوتووە."

مەحموود لە کاتێدا بیری لە قسەکەی دایکی دەکردەوە، گوتی، "کوڕەکەی، کوڕە بێشەرەفەکەی حەیای ئێمەی بردووە، جارێ با خۆی بەقوربانی تۆ بێ."

بەڵقیس لەوپەڕی شەرمەزاریدا گوتی، "ئەو بڵێ چی؟ کوا دایکی کوڕ هەرگیز ئاسوودەیی بە خۆیەوە بینیوە."

# ٨

سەروەر لەگەڵ فەڕاش و بەردەستەکان هاتبووە زانکۆ، لەناو باخچە بچووکەکەی بەشی ئینگلیزی چاوەڕێی نیانی دەکرد، چاوەڕێکردنەکەی درێژەی کێشا. یەکەیەکە سەیری مامۆستا و قوتابی و هاموشۆکەرانی کرد، چاوی ئەو کەسێکی دەدی، کەسێک هەر لە دوورەوە با قژە زەردەکەی بەرێ، هات، بەڵام درەنگ هات، کە هات سەروەر چوار کاتژمێر و نیوی ڕێک بوو چاوەڕێی دەکرد، کاتژمێر یازدە و نیو هات، نیگەران بوو، هیچ نیگەرانییەک ناتوانێ جوانیی ئەو بشارێتەوە، ڕاست چاوی چووە سەر چاوە ڕەشەکانی سەروەر، چاوە ڕەش و برۆ باریک و درێژەکانی، جا سەروەر هەر ئەوەی هەبوو، نیان لە بەر خۆیەوە گوتی، "هیچ شتێک لە چاوێکی ڕەش جوانتر نییە بە دڵی کچەوە بنووسێ." مووروە ڕەش و سەوزەکانی منداڵی هاتەوە یاد کە تێکەڵی دەکردن. سەروەر بە خۆی گوت، "چ دڵێکی سۆزانیم هەیە." ویستی دەری بهێنێت و فڕێی دا، وەک گۆشتێکی ڕزیو فڕێی بدات تا بە

پێڵاوە شینەکانی نیانەوە بنووسێ.

ئەو هەموو چاوەڕوانییە چییە لە ڕوخسارە پندرپندر و چاڵوچۆڵەکەی سەروەر دەڕژا، دووبارە لە دڵی خۆیدا گوتی، "دەبێ ئەو دڵەی تۆ پان بکرێتەوە." نیان بەبێ ئەوەی بتوانێ چاو لەسەر چاوە ڕەشەکانی هەڵگرێ، گوتی، "دەمەوێ نامەکەی سەردارت بدەمەوە."

لەگەڵ ناوی سەردار، سەروەر سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و گوتی، "لێرە نا."

نیان گوتی، "نایەمەوە گۆڕستانی ئەو پادشا بەرز و ڕزیوانە."

سەروەر گوتی، "باشە، دەچینە چێشتخانەی قوتابییان، بەو مەرجەی من خواردنت بۆ بهێنم."

نیان حەزی کرد، هەستی کرد لە چاوە گەورەکانیدا جگە لە جوانی شتێکی دیکەش هەیە، وەک وەفا گوتی، "باشە، بەڵام جگەری لەگەڵ نەهێنی."

سەروەر بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت، گوتی، "بەشی هەرە زۆری میکرۆبەکان لەسەر جگەر کۆ دەبنەوە."

نیان ئەوەی بە توانج زانی بۆ سەردار، بۆیە گوتی، "کەس وەک هاوڕێکان ناتوانن ئێسقانی یەکتر بشێکێنن."

چوونە چێشخانەی قوتابییان لەنێوان کۆلێژی ئاداب و بەشی ناوخۆیی هەموو کچە خوێندکارەکانی بەغدا. کوڕ کە دەگاتە ئاستی ئەو بەشە ئەژنۆی دەلەرزێ، سەدان کچ بە ژوورە جیاجیا و ڕاڕەو و نهۆمەکانی ئەو ئاپارتمانەدا بڵاو بوونەوە، لە هەر کاتێکدا بەلایدا تێبپەڕی دەزانی لەو کاتەدا سەدیان لەناو نوێنە لۆکە و ڕەنگاوڕەنگەکانیاندا خەوتوون،

فریشتەیەک دەمووچاوی بۆ ئارایشت کردوون، دووسەدی تەواویان خەریکی میکیاژن، هەر ڕەنگێک بەکار دەهێنن ناگاتە ڕەونەقی خۆیان، سەدی تریان بەدیار پێگەیشتنی خواردنەکانیانەوە ڕاوەستاون، یان فیتوو بۆ دەمکێشانی چاکەیان لێ دەدەن.

خەیاڵی کوڕ وایە کە دەگەیشتە حەمام هەر هەموویان خەریکی خۆشووشتنن و کەف و شەمپۆ سەروچاوی داپۆشیون، ئەژنۆی کوڕ لێرەش نالەرزێ، کە دەبینن لاسکی ستیانێک یان پەرچەمی دەرپێیەک بەسەر دەرگای گەرماوێکدا شۆڕ بۆتەوە، نا، ئەژنۆ نالەرزێ ڕاست دەشکێ.

کوڕی پادشا بای، کوڕی ئەو مەلیک غازییە بای، ئیرەییت بە کرێکارێک دەبرد کە دەچووە ناو بەشەناوخۆییەکە تا شووشەی پەنجەرەیەک یان بۆرییەکی شکاو چاک بکاتەوە. ئێستا کە هەزاران ڕۆژ بەسەر بۆنی گەرماو و شامپۆی کچاندا تێپەڕیوە، ئەو ئاپارتمانە بۆتە وێرانە، ئەگەر هەر کوڕێکی ئەو ساڵانە ڕێی بکەوێتەوە ناویان هەناسەی سوار دەبێ و وا دەزانێ ڕەوە کچێک تەماشای دەکەن.

کوڕەکان هەمیشە خۆشی و لەزەت و ئاسوودەییان لە ڕوخساری سادەی کچەکاندا دەخوێندەوە، بەبێ ئەوەی ڕۆژێک، تاکە ڕۆژێک هەستیان بە قورسی ژیان و خەمی دڵیان کردبێ.

بۆ یەکەم جار سەروەر لەگەڵ نیان لە دەرگا میلمیلەکەی ئاداب هاتنە دەرێ، بەلای چەپدا سووڕانەوە، سەروەر بۆ یەکەم جار دنیای بە هەموو ڕەنگەکانی خۆیەوە دی، درەختی بەژنوباڵابەرز و سەوز و بەڕەونەق، باڵندە هەر ئەوەندەیە

لەسەر شانی نانیشنەوە، ئەو هەموو ڕوخسارە شیرین و بەخەندە و فریشتەئاسایەی بەلایاندا تێدەپەڕن، دڵی سەروەر بۆ دەبێ لەو قەفەزە تەنگەدا بێت، کە ناوی قەفەزەی سینگە، وەک توتکەسەگێکی خڕ و بچووک و تووکن و سوور و سپی لە بەردەمیان هەڵدەبەزیەوە، کە نیان هەستی بە ختوکەیەک دەکرد لەسەر گۆرەوییە سپییەکانی قاچێکی ڕادەوەشاند، دڵە سەگە تووکن و سوور و سپیەکەی سەروەر لەوپەڕی خۆشبەختیدا وەک تۆپە زەردە تووکنەکانی تێنسی سەرزەوی هەر بەهەڵبەزینەوە و سەماوە تا ئەوسەر دوور دەکەوتەوە بەر دیواری بەشە ناوخۆییەکە دەکەوت و دەگەڕایەوە بەردەمیان.

لەسەری ئەوسەر، لە قوڕنەی لای ڕاست، تەریکترین شوێنیان هەڵبژارد، لیفێکسەکانیان دانان، سەروەر چوو دوو سینی هەڵگرت، برینجی زەرد و سپی، بۆ هەردووکیان قەڕنابیت، پارچەیەک ماسی ئەستوور و سوورەوەکراو، پارچەیەک ڕۆست، ئەوانەی دانا، دیسان چوو شەربەت و سەوزە و لیمۆ، چێشتلێنەرەکان هەرگیز قوتابییەکیان بەو دڵە فراوانەوە نەدیوە، نەیاندیوە قوتابییەک لە کاتی پارەدان کسپە لە دڵیەوە نەیەت، نا سەروەر هەر چەند پارەی دابا پێی کەم بوو، لەگەڵ ماسییەکە دەچووە ناو دەمە سوور نا، بەڵکو پەمەییەکەی نیانەوە. حەزی لێ بوو ببێتە ئەو دڕکە باریکەی، نیان بەوپەڕی ناسکی بە نێوان ددانە شاشەکانیدا، بە نێوان لێوەکانیدا دەیمژی و دەری دەهێنایەوە، خودایە بوونە ماسی چەند خۆشە.

ئەو کاتەی سەروەر بەوپەڕی شەوقەوە سینییەکانی

دانا، نەک نیان هەر هیچ کەسێک جگە لە کوڕێکی باریکی میهرەبان، عاشقیش لەبن پێستی سەروەر کەسێکی دیکەی نەدەدی. سەروەر وەک کوڕە سەرژنانییەکەی بەشی خوێندنی زمان و ئەدەبی ڕوسی. کە هەر جارەی دوو دەنکە برینجی دەخستە سەر کەوچکەکەی و بەوپەڕی هێواشی بۆ دەمی دەبرد، گوایە زۆر ناسک و بەئەتەکێتە، سەروەریش ئاوا، دەستی بە نان خواردن کرد، لەو کاتەدا بیری لەوە نەکردبۆوە، کە برادەرەکانی خوێندکارەکەی بەشی ڕوسی لە ژوورەکەی خۆیان لە بەشی ناوخۆیی چۆن سزایان دابوو، بە کەوگیری گەورە ساوەریان بە دەمدا کردبوو، پێشیان گوتبوو، "دەبخۆ سەگباب، لای ئێمە دەڵێی حووتی و لای کچەکانیش خۆت دەکەی بە شازادە."

نیان هەستا، سەروەر وای زانی دەڕوات، ئاوڕێکی بۆ دایەوە و گوتی، "تۆ دانیشە من دەچم دوو چا دێنم."

نیان دوو چای خەستوخۆڵ و شیرینی بەغدایانەی هێنا، لە کاتی چاخواردنەوەدا هێواش جانتاکەی کردەوە و لە باخەڵی ناوێدا، نامەکەی سەرداری دەر هێنا و گوتی، "با هەر لای خۆت بێ."

سەرەوەر گوتی، "ئاخر نامەکە بۆ تۆ هاتووە."

نیان گوتی، "تەنها بۆ من نەهاتووە، خەڵکی دیکەش لەو نامەیەیان بەدەست گەیشتووە."

سەروەر گوتی، "لەو نامە نا، نامەی دیکەی سەرداریان بەدەست گەیشتووە، کە دەشێ بابەتی دیکەی تێدا باس کردبێت، کە پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە."

نیان بەنیگەرانییەوە گوتی، "نا هەمووی عوزرخواهی

ئەوەیە کە خۆشی نەویستوون، شتی دیکەش، دەشێ بۆ نیوەی کچانی ئادابی نوسیبێت، من نازانم چیی دیکەی بۆ ئەوان نوسیوە، ناشزانم کە ئەو سەردارە خۆی بە چ دەزانێ؟"

سەروەر گوتی، "هەر چۆنێک بێت ئەوە نامەی تایبەت بە خۆتە."

نیان دۆستانە گوتی، "با لای تۆ بێت، خۆ تۆش دوژمنی ئەمانەت نیت. ئەو کوڕە ئەمانەتی نەدەزانی، چیرۆکەکانی وەک یەک دابەش کردووە، باوەڕ ناکەم نامەی تایبەتی هەبێت."

سەروەر دەستی تۆزێک جوولاند، ویستی بیخاتە سەر پەنجە باریک و پەڕەسیغاریەکانی نیان، ویستی دڵ بخاتە دڵیەوە، ویستی چاو بخاتە چاوەکانیەوە، چاوی سووڕاند و گوتی، "من کوشتەی ئەمانەتم، دەمەوێ لەو دنیایەدا کارێکم هەبێت، کارێک ئەوە بهێنێت ژیانمی لەسەر دابنێم. هیچ کارێک لەو جیهانەدا بۆ من لە پاراستنی ئەمانەتێکی تۆ گرینگتر نییە."

نیان بۆ لەحزەیەک سەیری چاوە ڕەش و گەورە و بەبریقەکانی کرد، ئەو چاوە مات و ماندوانە، ئەو هەموو شادییەیان لەکوێ هێناوە. هەستیشی کرد سێبەرێکی ڕەش خەریکە بەسەریدا دەڕژێ، دەشترسا لە سێبەری شەوی ئەو زەریایە بچێت، کە لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا تەواوی جووڵەی ئاوەکە بخاتە ژێر زەبری خۆیەوە. لەگەڵ ئەوەشدا نیان گوتی، "با نامەکە لای تۆ بێت، هەرچەند ئەو ئەمانەتە گرینگییەکی زۆری لە ژیانی مندا نییە."

سـەروەر گوتـی، "حـەز دەکـەم ئەمانەتێکـی تـۆم لا بێت، ئەمانەتێک کە بۆ ژیانی تۆ گرینگ بێ، جا بزانە بە خەنجەر لـەت لەتـم بکـەن کـەس دەتوانێ لێم بستێنێ."

بەفیڵێکی کچانـەوە، نیـان گوتـی، "جـا کوا چیم هەیە! هەتا ئەوەنـدە گرینـگ بێت تـۆ بیشـاریتەوە."

سـەروەر گوتـی، "کە تۆ هیچت نەبێ دیارە شتێکی بەنرخ لـەو دنیایەدا نییە، مەرجیش نییـە ئەمانـەت هـەر بشـاردرێتەوە، تۆ زۆر شتت هەیە، زۆر..."

سـەروەر دەیویسـت بڵێ، وشـەیەکم بدەیە، ژیانـی مـن هـەر نرخـی وشـەیەکی تـۆی هەیـە، قسـەیەک، ئـەو دڵەتـم بدەیـە، تـا لـە سـندوقی ڕەشـی دڵمـدا بـۆ هەتاهەتایـە بیپارێـزم. لـەو ڕۆژەوە نیـان گۆڕا سـەروەری وەک دەموچاوێکی کونـج کونـج و کرمێکـی ڕەش و چـەور نـەدەدی، وەک بالایـەک لـە وەفـا و جوانـی، دڵنیایی و متمانـە دەدی، کە دەشێ ژیانتی پێ ببەستی. بێدەنـگ دانیشـتن، نیـان خەریکـی پاککردنـی ئـەو پرتەقاڵـە بـوو کـە سـەروەر هێنابـووی، سـەروەر هەسـتی بـە پژانـی بۆنـی پرتەقاڵەکـە کـرد، کـە لەگـەڵ لـێ کردنـەوەی هـەر پارچەیـەک لـە توێکڵەکـەی بـە نێـوان پەنجەکانـی نیانـدا بـەو نـاوەدا بـڵاو دەبۆوە. یەکـەم جـار سـەروەر پرتەقاڵی لـە هەولێر لـە گەڕەکـی قەسـران لـێ کـردەوە، هێنـدە منداڵ بـوو دەسـتی نەدەگەیشـتێ، زیرەکانـە تەلێکـی کردبـووە قوڵفـە، هـەر ئـەو تەڵـە بـوو کـە ویلـی تایـەی پاسـکیلی پـێ لـێ دەخـوڕی، هـەر لـە کۆڵانـەوە تەلەکـەی درێـژ دەکـرد و لـە پرتەقاڵەکـەی گیـر دەکـرد و ڕای دەکێشـا، بەوەشـیان دەگـوت، "پاتـار" لەبن دیواری ماڵێک یـان لـە بـەردەرگای باخچەیـەک دادەنیشـت و بەوپـەڕی سـەلیقەوە

پرتەقاڵەکەی پاک دەکرد، دەمارە سپییەکانی نێوان قاشەکانی دەر دێنا، سێبەری ئەو ماڵانە زۆر لە هیی ماڵی خۆیان خەستتر و خۆشتر بوو، هەتا (با)ش زیاتر سەری لەوان دەدا و قژی منداڵ و کچەکانیانی دەلاواندەوە.

هەر ئەو سەردەمە بوو عەقڵی دابووە سینەما و سوهێر ڕەمزی، هەر ئەو سەردەمەش حەزی چووبووە ناو قەسران، وای هەست دەکرد سوهێر ڕەمزییەک لە کۆلانێک دەر دەکەوێت، زۆر جار هەر لە ساحەی عەنتەرەوە بەدوای کچ و ژنەکان دەکەوت، دوور و نزیک، ئەویش کوڕێکی وردی ڕەش، هیچ گرینگییان پێ نەدەدا، وەک نەبێت. ئەویش ئەو گرینگی پێ نەدانەی پێ خۆش بوو، دوایان دەکەوت چاوی لەسەر لاقی کچە تەنوورە کورتەکان هەڵنەدەگرت، ئەو کاتە تەنوورەی کچەکان لەسەر چۆک بوو، ژنەکان هێندە لە مەترسیدا نەبوون، تەنها ئاواتی ئەوە بوو کە ماڵی ئەو ژنە یان کچە تەنوورە کورتانە چەند پلیکانەیەکی هەبێ، تا لە هەر سەرکەوتنێکدا ئەو بەئاسوودەیی سەیری شلکەی ڕانیان بکات.

هەر لە پرتەقاڵدزینیشەوە بوو فێری دەرپێ دزین بوو، هەر چەند گەورە ببوو، بەڵام هەر بەو تەڵە قوڵفدارە، لەودیو دیوارەکەوە، لە دەرپێی ژنانەی گیر دەکرد، گەورەترین سەرکەوتنی ئەوە بوو کە بیزانیبایە ئەو دەرپێیە ڕۆژێک پێشتر لە پێی کێدا بووە، بۆنێکی قووڵ قووڵ تا بنی سییەکانی دەکرد، لە دەموچاوی خۆی هەڵدەسوو، تێر ماچی دەکرد، جا وەک دەسرە قەدی دەکرد، تاکە یەک جار ئەوەی بۆ هەڵکەوت، کە دەرپێیەکە نیشانی خاوەنەکەی بداتەوە، ئەویش

کچێکی سوورەی خاڵخاڵ، بەڵام بەلەک سپی سپی بوو، کچە تۆپەڵە تفێکی لێ کرد، ئەویش دەرپێکەی لە بەرچاوی ئەو لە ناوگەڵی خۆی وەر دا، بە قسەی خۆی، ئەوەش تاکە کاری نامەردانە بوو لە ژیانیدا کردبێتی.

بۆنی پرتەقاڵەکەی نیان جیاواز بوو، بۆنێک پڕ لە خۆشەویستی و ژن، شتێکیش لە هەست و سۆز. بۆ یەکەم جار بیری کردەوە، کە دەبێ ڕەنگی دەرپێکەی نیان چۆن بێت، کە دیتی نیان پرتەقاڵەکەی کردە دوو بەش و بەشێکی بۆ ئەو لە بەردەمی دانا، شاگەشکە بوو، ئیدی لای ئەو، ئەوە بەشکردنی ژیانی دەگەیاند لەنێوانیاندا، هەناسەیەکی قووڵی دا و گوتی، "ژیان بە ئینسانەکانەوە خۆشە، ژیان ئەو کاتە مانای هەیە کە کەسێک چاوەڕێتە، شارەکانیش ئەو کاتە هەن، کە کەسێکت تێدا خۆش بووێت، بمبوورە، سەد جار بمبوورە پێش ئەوەی تۆ بناسم، پێش ئەوەی ئەو لەتەپرتەقاڵەم بۆ بخەیتە سەر مێزەکە من نەبووم، لەتەپرتەقاڵێک مانای دایە بوونی من، لەتەپرقەقاڵێک سلێمانیی لای من کردە شار، پێشتر نەمدەزانی هەیە، کە هەیە چییە، ئێستا دەزانم سلێمانی لەتەپرتەقاڵێکی پرتام و بۆنی ژیانە."

نیان زۆر نەچووە ناو وتارەکەیەوە، هەمیشە وشە گرینگەکانی لای خۆی تۆمار دەکرد، دواتر بەتەنها بیری لێ دەکردنەوە، ئەم جار گوتی، "ئێستا زانیم سلێمانی لەتەپرتەقاڵێکی سەر مێزەکەیە، بەڵام لای من ژیان متمانەیە، خۆشی و هێزی ژیان لە متمانەدایە، متمانە لە هەموو شتێک گرینگترە."

سەروەر سەرەداوێکی دەست کەوتبوو، بە کوێدا ئەو

کچە دەگێڕێ، "ئەوەش سەلیقە و زیرەکییە، دەبێ متمانەی خۆت بخەیتە سەر شانی کەسێک لە شاخ بەهێزتر." نیان قسەی نەکرد، سەروەر دیسانەوە گوتی، "ناکرێ متمانەت بە کەسێک بکەی، کە بۆ خۆی وەک دارێکی بۆش بێت، پێی بخەیتە سەر و بشکێ."

بەوپەڕی متمانەوە، قووڵ ڕوانییە ناو چاوە سەوزەکانی نیان و گوتی، "دەتوانی متمانەت پێم هەبێ. متمانەت دەخەیتە سەر شانی من؟"

نیان دلڕەقانە گوتی، "کوڕەکان وان، لە دڵەوە متمانەت دەدەنێ، لە دڵەوە هێزت دەدەنێ، دڵسۆزن، ئاگرن، تا دڵیان دەخەیتە سەر، تا شانیان پێوە دەدەی، تا خۆتیان تەسلیم دەکەی، جا دەکشێنەوە، جا دەشکێن، کە زانیان هەموو متمانە و بڕوا و هێزی خۆت خستۆتە سەریان، جا دەکشێنەوە بۆ ئەوەی هەرگیز خۆت پێ نەگیرێتەوە، کوڕەکان وان، لەکوێدا زۆر پێویستن لەوێدا ونن، لەوێدا سەرگەردانت دەکەن، لەوێدا دەتخەنە بیرەوە."

سەرەوەر لەوە ئەهریمەنتر بوو بچێتە ناو بەرگریکردن لە کوڕان، لەکوێش لە بەردەم کچێکی شکستەباڵدا، گوتی، "دڵخۆشم بەو قسە بەنرخانەت، بەو تێگەیشتنە جوانەت لە کوڕان، کوڕان هەموویان وان، بەرگری لە خۆم ناکەم، چونکە کوڕ نیم، من سۆفییەکەم لە ئەشکەوتدا ژیاوم، نازانم، ئاگام لەوە نییە ئێستا زەمەنی دۆڕانی متمانەیە. دەبێ کەسێک هەبێ شایانی متمانەی تۆ بێت؟ من هەست ناکەم ژیانم بەهای متمانەی تۆی هەبێت، دەبێ کەرامەت و ئازایەتی باپیرانیشم قەرز بکەم. ئەوانەی متمانەی تۆیان دۆڕاندووە، هەر شایانی

نەبوون، کچ نابێ بەرخێک هەڵبژێرێ تەنها ملکەچی بێت، دەبێت بەرخێک هەڵبژێرێت کە ملی خۆی درێژ کردووە بۆ چەقۆ، بۆ قوربانیدان و سەربڕین."

دڵی نیان هەم ترس، هەم خۆشییەکی تێ گەڕابوو، بۆ ئەوەی درێژەی پێ بدات، پرسیی، "چەقۆ، چەقۆی چی؟"

"چەقۆی خۆشەویستی، هەڵەی کچان ئەوەیە، دەبێ بە چەقۆی خۆشەویستی دڵی کوڕان دەر بهێنی، یەک کوڕ نا، سەد کوڕ و سەد دڵ هەر کامیان گوتی ئاخ دەبێ دڵەکەی دوور فڕێدەی."

دوای ئەو دانیشتنە، سەروەر زانی کە دەبێت بەتەواوی خۆی ڕوون بکاتەوە، دڵی خۆی بخاتە سەر چەقۆی نیان، ڕۆژی دواتر نەهاتەوە زانکۆ، هەر خەریکی نووسینی نامەیەک بوو، کە تنۆک تنۆک خوێنی دەخستە سەر، نیان چاوی بۆ گێڕا نەیدیت، ڕۆژی دواتر سەروەر کتێبێکی هاملێتی لە سیمێکی سوور پێچا و قردێلەیەکی لە شێوەی دڵ بۆ کرد، کە نیانی دۆزییەوە، خۆشییەک لە ڕوخساری نیان گەڕا، خۆشی و کرانەوەیەک سەروەری گەشاندەوە، بەڵام ڕاڕایی لە ناوەندەوە کردبوویە دوو لەت. نیان پرسیی، "دوێنێ دیار نەبووی؟"

خۆشبەختترین کوڕ ئەوەیانە کچان لە نەهاتنی دەپرسن. ئەو کتێبەکەی پێشکەش کرد و گوتی، "خەریکی ئەوە بووم."

نیان کتێبەکەی وەر گرت و پرسیی، "ئەوە؟"

"بۆ تۆم پێچاوەتەوە لە کاتی ڕۆیشتندا بەتەنها بیکەوە."

نیان ئاوڕێکی بۆ دایەوە، "دیسانەوە نامەیەکی سەردار نەبێت!"

سەروەر بەوپەڕی کەساسییەوە، "تۆ بیبینە، ئەو کات."

پێشتریش دڵی نیان لێی دەدا، بەلام ئێستا بەڕیتمێکی جیاواز، ڕیتمێک نەچێتەوە سەر یەک، وەک گۆرانی سەرخۆشان، لە دڵی خۆیدا گوتی، "ناچمەوە ژوورەکەم، لەناو ئەو هەموو ئەژدیهایەدا کوا نامە دەخوێندرێتەوە،" کە بچێتە ئاودەستەکان، "بۆ کچی میزن لێ دەگەڕێ،" بیری لە یانەی قوتابییان کردەوە، "ئەو کوڕە کوردانەش وەک زەردەواڵە دەورت دەدەن، زۆریشیان بەئەدەبن و هیچ ناڵێن، بە چاویانەوە دیارە چەند بەحەسرەتن، دەیانەوێ هەموو شتێک بزانن، بەس وانەکانیان نەبێ،" زۆریش حەزیان لە کچی عەرەبە، ئەو جارەش کە هەدیل خۆی شۆڕ کردەوە، بۆ ئەوەی بەسرتە قسەیەکی پێ بڵێ، دیتنی، هەر هاوڕێ کوردەکەی ئەولاولای خۆی دیت، بە چاوی دڵ نا، هەر بەو دوو چاوە سەوزانەیەوە، دیتی هەردووکیان، چوونە ناو دەرپێکەیەوە، ئەو هەدیلە مردوومراوەش مردووی سەر قەبران بەئاگا دێنێ. نیان حەزی دەکرد لەگەڵ هەموو قوتابییە کوردەکان دۆست بێت، دەشیگوت، "ماڵیانم بەقوڕ نەگرت، هێندە باسی شەهید و کورد و چوار پارچە دەکەن خەریکە زراوم بچێ،" سەردار نەبێت، هەموو جارێ پێی دەگوت، "نیان گیان کورد و ماڵکاولکردن و قوربانی لەو لا، لە دیوی حەمرین دابنێ، خەریکی ئەو دڵە گەڕەی خۆت بە، لەجیاتیی ئەو هەموو غەمبارییە، حەیف نییە ئەو لێوانەت سوور نەبێ بە..."

نیان نەیدەهێشت تەواوی بکات، دەیگوت، "ئەی تۆ، ئەی دڵە حیزەکەی تۆ..."

سـەردار بەگاڵتـەوە دەیگـوت، "عاشـقی کێـو و تـەلان و بەندەنـی بـەرزم ئەمـن... عاشـقی دڵێکـی وەک بـەردم ئەمـن..."

دیسـانەوە، سـەردار دیسـانەوە قسـەی هیچ و دڵە حیزەکەی. لـە بـەر خۆیـەوە گوتـی، "پیـاوی خوێـڕی،" دەشـیزانی ئـەو دڵـە سەرشـێتەی خۆیشـی دابایـە، خۆشـی دەویسـت، جـا کـە دەگیرا وەک داخێک بـە دڵیدا دەچوو، گوتیشـی، "جا بۆ ئێسـتا نەچـووە!"

ئێسـتا بچێتـە کوێ ئـەم نامەیـە بخوێنێتـەوە، کـە کـوڕ بایـە دەچووە چایخانـەی پەرلەمان، کـە یەک-دوو کتێبی خوێندبایەوە یـان ئەکتـەر بایـە، دەچووە قاوەخانـەی بەڕازیلی. چایخانەکانـی ئـەو وڵاتـە هەرگیـز گوڵێکیـان تێدا ناپشـکوێ، سـوپایەک لـە پیـاو بەرامبـەر یەکتـر دادەنیشـن، ئەوەنـدەی دەتوانـن بەسـەر یەکتـردا دەڕشێنەوە.

باشـترین جێگا کتێبخانەیـە، گەڕایـەوە، بەبێ ئـەوەی سـەیری کـەس بـکات، چـووە کتێبخانـەی مەرکـەزی، پشـت ئـاداب، چەنـد مامۆسـتایەکی شـیک و سەرسـپی لێرەولـەوێ خەریکـی خوێندنـەوە بوون، چـووە ڕاڕەوە بچووکەکـە چەنـد کوسـییەکی کەمـی لـێ بـوو، دانیشـت، قردێلـە سـوورە دڵییەکـەی کـردەوە، خـۆی بـە کتێبەکـەوە خەریـک نەکـرد، نامەکـەی کـردەوە، کـە هیچـی وای لـە کتێبەکـە کەمتـر نەبـوو، هەسـتێکی ئاشـنا گوتـی،

"مەیخوێنەوە تەنها نامە سەری کچانی کردووە بە قوڕدا."

هەستەکە بە دەنگێکی بەرزتر گوتی،

"ئـەوەی لـە نامـەدا دەنووسـرێ ئـەو وشـانەن لـە ژیانـدا جێیـان نابێتـەوە."

فەرامۆشـی کرد، ئەو هەسـتە نەفرەتییەش لە خۆشـەویستیدا

جێی نابێتەوە. هەستەکە توندتر گوتی ،

"مەیخوێنەوە، ئەو نامەیە دەتباتە سەرێگایەک، هەرگیز ناگەڕێیتەوە سەر ڕێگاکەی خۆت."

دەستی ڕاگرت و چاوی نووقاند،

"خودایە ڕێگای ئێستای من چییە؟"

نیانیش نەیدەویست بگەڕێتەوە سەر ئەو ڕێگایە، حەزی دەکرد بچێتە سەر ڕێگایەک بفڕێت، بفڕێت و تەنوورەکەی بــا بیبات، دەنگێکی دیکە لە ناوەوە دەیگوت،

"هەستە ئاڵتونەکانن دەبنە وشە، هەستە ئاوریشمییەکانن دەبنە پیت، بیخوێنەوە."

عەشق مردنە بەتەنها...

من تۆ وەک ڕووبارێک دەبینم، ڕووبارێک من دەبەی، بێدەسەڵاتانە کەوتوومەتە ناوت، ئەوەش دڵخۆشییەکی گەورەیە بۆ من، کە فڕێشم بدەیتە دەریێ شادمانم، چونکە ئاوی تۆم لێ دەتکێ.

من ڕەشم، لە شەو و گریان و مردن ڕەشترم، من لەو گەنجە ناسک و سەرسووکانە نیم، وەک شەماڵ بەلاتدا تێدەپەڕن. من ڕێژنە ئاوێکم سەیارەیەک فڕێی داوەتە سەر کراسە سپییەکەت، دڕکێکم بە دامێنتەوە نووساوم. من ڕەشم، ڕەمز و ناخی ڕەشم، لە شەو ڕەشترم، هەموو ئەو ئارامییەی شەو هەیەتی دەیخەمە دڵی تۆوە، من نازانم عاشقانە بدوێم، بەڵام دەزانم ژیانی من ئەگەر بایەخێکی هەبێت بۆ هەستانەوەی تویە لەناو چڵپاو، ئەگەر بایەخێکم مابێت تەنها بۆ ئەوەیە تۆ لەناو گەردەلوول بگرمەوە، ئەو

چەند دێڕەم بۆ تۆ نەنووسیوە. ئەوانەم بۆ خۆم بۆ شەرحی حاڵی دڵ نووسیوە. دەنا بە تۆ دەڵێم، ئیدی من بەبێ تۆ نیم، من داری زەقنەبووت بووم، بە لقێک لە بالاّی تۆ متوربە بووم، من ئێستا پرتەقاڵی سەوز دەگرم، ئەگەر لەگەڵم بیت وەک ئەو تۆوەی لە بیابان خەریکە ببێتە خۆڵ چاوەڕێی دڵۆپە ئاوێکە، تا بڕوێ، منیش چاوەڕێی وشەیەکی تۆم تا بژێمەوە و سەوز ببمەوە. تۆ ئازادیت، ئازادیت باران، دەکرێ لێم گەڕێی بڕژێم و ببمە خۆڵ، دەکرێ پێم پێدا بنێیت و ونم بکەی، چەند شیرینە لەژێر پێیەکانی تۆدا ون ببم، دوامەنزڵی ئەم دنیایەم ژێر پێکانی تۆ بێت، خەم مەخۆ من دەبێ ون ببم، خوێندن، وانە، مامۆستا، زانکۆ و ژیان بۆ من کۆتاییبیان هاتووە، پێش ئەوەی تۆ بناسم، چونکە زەمەنی من، زەمەنی پێش تۆ و دوای ناسینی تۆیە، خەم مەخۆ هەموو ئەوانە لە ژیانی مندا مردوون تەنها تۆ دەتوانی بە فوویەک هەموو ئەوانە زیندوو بکەیەوە، تۆ مەسیحی منی، کە من زیندوو دەکەیەوە دەبێ هەموو دنیا سوجدەت بۆ بەرن. تەنها تۆ دەتوانی مانای ژیانم فێر بکەیتەوە، من ژیان بەو شێوەیە حونجە دەکەم، کە تۆ پێم دەڵێی.

من تووشی مووسیبەت بووم، من تووشی عەشقێک بووم لە مردن و ژیاندا، لە بوون و لە نەبووندا دڵشادم دەکات، دڵشادی بۆ دۆزەخ چ موسیبەتێکە. تەنها ئەوەندەیە تۆ بەرپرس نیت لە مردنی من، تەنها هۆی ژیانەوەمیت. خەم مەخۆ تۆ لە بێڕەنگکردنی ژیانی مندا دەستت نییە، ژیانی من بۆ خۆی لەوپەڕی باشیدا خۆڵەمێشە، تۆ ڕەنگ بە ژیانم دەبەخشی.

تۆ تاقە پێغەمبەری کە پەیامی بەهەشتت نەهێناوە، بەڵکو بەهەشتت بە حۆری و هەنگوین و دارستانەوە بۆ من هێناوە. تۆ پێغەمبەرێکی تاقانەی، بەڵێن نادەی، بەبێ ئەوەی نوێژ و ڕۆژووم بەسەردا فەرز بکەی شەڕابەن تەهورت بەسەردا ڕشتووم، تەنها بەسەر مندا نا، بەسەر هەموو ئەوانەی چاویان دەکەوێتە سەرت.

تۆ نابینی، بەیانییان کە تێدەپەڕی کەناسەکان شەڕیانە کامیان کلینیکسە بە عارەقەکەی تۆ هەڵگرێتەوە، هەرگیز ئەوەندە کەناسە لەسەر پاکردنەوەی دوکانی زێڕنگەرەکان نەبۆتە شەڕیان، کە پڕن لە خۆڵی زێڕ. تۆ سەرنجت داوە لە هەر شەقامێک تێپەڕی سەیارەکان سەریان لێ تێک دەچێت، تۆ بیرت لەوە نەکردۆتەوە بۆچی هەموو مامۆستاکان لە پۆلەکەی تۆدا دەبنە فەیلەسووف. هەرگیز بیرت لەوە نەکردۆتەوە بۆچی هەموو هاوپۆلەکانت، هەموو هاوڕێکانت بە کورد و عەرەب و تورکومان و ئەفریقییەوە بوونە شاعیر. ناپرسیت ئەو کوڕە بەستەزمانە یابانییەی لە پۆلەکەتان بوو، کاتسوو مۆری بۆ نایەتەوە؟ ئەو ئێستا تەنها خەریکی نووسینی شیعرە لەسەر تۆ، ناوی ناویت کەفی شەپۆل. ئەگەر شیعر لەسەر خەیار و تەماتەش بنووسن هەر مەبەستیان تۆیە. من تازە گەیشتوومە بەهەشتی خۆم چ لەژێر پێت بێت، چ لەناو دڵتدا.

ببورە ناوی دڵی تۆم بە زاردا هاتبێ، جارێ ئەوە بۆ من زۆرە، ئەگەر سەد ساڵ دوای من بمری، ببورە گوتم بمری، ئەگەر سەد ساڵ دوای من بمری، لە سووچێکی دڵتدا چاوەڕێ دەکەم و لەگەڵ تۆدا دێمە گۆڕەوە. مردن لە دڵی

تۆدا چەند شیرینترە لە ژیان لەناو ئاوریشمدا.

شەو و ڕۆژ، هاوین و زستان هەرگیز لای من گرینگییەکیان نەبووە، ژیان بۆ من تێپەڕین بووە بەناو بیابانێک لە تۆز و دڕک و داڵ، تێپەڕینێکی ئیجبارییە بۆ من بەناو تونێلێکدا، کە ناتوانم سەرمی تێدا بەرز بکەمەوە.

ژیان لای من وا بوو، ژیان بۆ من ژوورە نسرم و تاریک و قووڵەکانی قەڵاتی هەولێرییە، نە ڕووناکی و نە خۆشیت دەداتێ، کەچی ناتوانی دەستی لێ هەڵگری. من توانیم، من دەمێکە دەستم لە ژیان هەڵگرتووە، لاقێکم نا، هەردووک لاقم لە دنیاکەی دیکەن، تەنها چاوەکانم، تەنها نیگاکانم ماون لەسەر تۆ، قسەیەکی تۆ من لە مردن ناگێڕێتەوە، قسەیەکی تۆ لەناو شەو دەرم ناهێنێ، نا، بەڵکو قسەیەکی تۆ ژیان دەداتەوە مردن، شەو دەکاتە چراخان. من چاوەڕێم، چاوەڕێی ئەو ڕوونـاک بوونەوەیەم.

هەموو ئەوەی شاعیرەکان وتوویانە درۆیە، خەیاڵە، تەنها ئەوەی من دەیڵێم ڕاستییە، من مەڕێک بووم بە دەستی ژیانەوە، لە دەست ڕەزالەتی *بوون* هەڵاتووم و تۆ سەرم ببڕە و ببە جەللادم، تا من ببمە خاوەنی جوانترین جەللاد لە سەرانسەری بووندا، مەڕێک هاتۆتە بەر دەستت بەملی درێژ و بێتووکەوە، تۆ تەنها بە پەنجە باریکەکانت، وەک نیشانەی سەربڕین پەنجەیەک، نینۆکێک بە ملیدا بێنە سەری گلۆر دەبێتەوە. ئەوە قسەی شاعیرەکان نییە، تۆ بە قسەیەک موعجیزەیەک دەخولقێنی، موعجیزەیەک زۆر لەوانەی پێغەمبەرەکان بالاتر. تۆ بە قسەیەک مەڕێکی سەربڕاو، مەڕێکی تاریک و شەکەت و پەککەوتە، بە تاکە قسەیەک دەکەیتە کۆتر.

تۆ هەرگیز خەمی ئەوەت نەبێت چ وەڵامێکم دەدەیتەوە، دڵشکانی من ئەزەلییە، ئەگەر نەشمکەیتە کۆتر، کۆترێک ببێتە گوڵی سەر کراسەکات، کۆترێک ئەو وردەنانە کۆبکاتەوە لە کاتی نانخواردندا دەکەونە کۆشت، نا کە نەشمکەیتە کۆتر تا بدەمە شەقەی باڵ، دڵنیا بە بە ڕۆحی کۆترەوە دەمرم، ئەوەش باشترین ڕێکەوتە بێتە سەر ڕێی لەدنیادەرچوویەک.

تۆ دڵشادی هەموو دنیا لە بەردەمتە، دەست بە هەر ئاڕاستەیەکدا هەڵبڕی، ئەو شوێنە دەبێتە باخچە و گوڵ، دەبێتە مێرگ و کانی. چاو لە هەر گەنجێک کەی، بۆ ئەبەد بەختەوەر دەبێت، نیازی دڵی خۆت بدەیتە ئەو ئیمام موسای کازمە لە گۆڕەکەی دێتە دەرێ، چاوێک بدەیتە ئەو دەروێش و تۆبەکارە هیندی و پاکستانی و ئەفغانیانەی، خزمەتی تەکیەی شێخ عەبدولقادر دەکەن، بە سڕینەوەی پەنجەرە و دەرگا وماڵینی حەوشەکەیەوە پیر بوون، ڕیشە تیسکنەکانیان ڕەش دەبێتەوە، تەنها نیگایەکیان بدەیە گەنج گەنج دەبنەوە و ئەو کات دەزانن کێ خاوەنی چاوونفووس و کەرامەتە و دوات دەکەون.

تۆ بەختەوەریت نامەیەک بۆ جەللادەکانی ئەبوو غرێب بنێرە، ئەو شەو کەس بەدارەوە ناکەن. ئەو شەوە کەس دارکاری ناکەن و نینۆک و پەنجەی کەس هەڵناکێشن. تۆ بەختەوەریت بۆ هەموو دنیا، ئەگەر شەوێک، هەر شەوێک پیاسەیەک بکەی بە جادە و کۆڵانەکانی بەغدادا، هەر چی شێت و مەست و کچی سەرگەردان و پیرەپیاوی دەرکراو هەیە بە زەردە خەنەیەکی تۆ دەگەشێنەوە و هەست دەکەن هێشتا لە دنیادا دادپەروەری ماوە.

تۆ بەختەوەریت لەو زانکۆیە، لە تەواوی زانکۆکانی بەغدا چاو لە هەر کوڕێک ، مامۆستایەک دابگری، بۆ هەتاهەتایە دەبێتە خزمەتکارت، دنیات بۆ پڕ دەکات لە باڵندە، تۆ گوێ مەدە ئەوەی کوڕێک ئەوەی نەزانیوە و ئێستا لە قوڕاودا دەژی. تۆ ئەوەندەی خۆر ئازادیت، ئەو شەوە سەختەی من ڕووناک بکەیتەوە، یان شەقامەکانی ئەوان پڕ بکەی لە ئومێد. تۆ ئازادی موعجیزەیەک بنوێنی و ژیان بە بەر کەلاکی مەڕێکی پیردا بکەیەوە یان بچیە باخچەی ئەوان.

هەر بڕیارێک بدەی ئەو ڕۆژانەی من بەسەریان دەبەم هیی تۆن، تۆ قەڵەمت لێ داون بژیم. ئەو ڕۆژەی من و تۆ و سەردار وێنەکەمان گرت، ئەو ڕۆژە بە هەموو حیسابێک دواڕۆژی ژیانم بوو، لەوەتەی هەم ویستوومە خۆم دواڕۆژی ژیانی خۆم دیاری بکەم، چارەنووس و شێرپەنجە و گوللە چین تا دواڕۆژی ژیانی من بنووسن. نا ژیان ئەوە ناهێنێ بە زۆر جێی بهێڵی، من بڕیارم دابوو ئەو ڕۆژە دواڕۆژی ژیانم بێت، مووسێکم لە باخەڵدا بوو، لە گیرفانی چەپم، لەسەر دڵم دانابوو، خوێنی ڕەش و سستی من تەنها بە دەمی مووسێک دەکەوێتە هەڵپە و جووڵە و سەما، ئەویش ڕاست لە دەمارە شینەکەی مەچەکم، ئەو ڕۆژە بۆنێک لە جلەکانتەوە، ڕەنگێک لە وێنەکەوە، مووسەکەی باخەڵمی تواندەوە، بەبێ بڕین جوڵەی خستەوە دەمارە شینەکەی مەچەکم.

ئیدی ئەو ڕۆژانە هیی تۆن، تۆ بە پەنجەکانی خۆت نووسیتنەوە، لەو وێنەیەوە هەموو چرکە و ڕۆژەکانی من بە مارکەی تۆوە لەدایک دەبن. لە گۆڕستانی مەلیکەکان، من چۆن بەتەنها لە گۆڕستانی مەلیکەکان جێت دەهێڵم،

چاوم لەودیو گردەکەوە بەدواتەوە بوو، تەنها من دەمدی مەلیک غازی چۆن سەری لە گۆڕەکەی هێناوەتە دەرێ، تا تۆ ببینێ. تاکە کەسێک شایانی مردن و زیندانی و ڕیسواییە ئەو سەرداره گەمژەیەی هاوڕێمانە، تەنها ئەو بە سینگی پڕهەناسەی تۆوە بەرەو مەرگ ڕۆیشت.

من نامەوێ ئەو بڕیارە بدەی. نامەوێ پێم بلێی بەڵێ. نامەوێ موعجیزە بۆ من بنوێنی، نا، هاتنت بۆ لای من، ئەگەر ژیانت بۆ بخەمە سەر سەمای بولبول ژان و مردنە. تاڵی ژیانی من بەشی لەناوبردنی تەواوی مشک و ماری سەر زەوی دەکات، ژەهری ژیانی من بەشی کوشتنی تەواوی زیندەوەرە خۆشبەختەکانی سەرزەوی دەکات. تۆ لە من گەڕێ، تۆ لە من گەڕێ مووسێک دەتوانێ ئارامی بۆ من بکڕێتەوە. چرقەیەکی کارەبا جەستەی خامۆشم، ڕۆحم هێمن دەکاتەوە، بەڵام تۆ تکایە لەو هەموو خۆشەویستییەی من نزیک مەبەوە، لەو هەموو عەشقەی من نزیک مەبەوە، وشەیەکیشم بۆ مەنووسە، با بەحسرەتەوە بمرم، نەک بەژەهرەوە.

ئەگەر جورئەتم هەبێ، ئاخر عاشقبوون بەشی زۆری جورئەتت دەبا، ئەگەر جورئەتم هەبێت، تا تۆ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە، تا تۆ هەناسەیەکی بەزەییم بۆ هەڵدەکێشی، من چوومەتە دۆخێکی دیکەوە، دۆخێک کە پێویستی بە ترپەترپی دڵ و فیچقەی خوێن نییە. بە خەیاڵی ئەوەی کە تۆ، تەنها لە ڕووی خەمخۆری و ئینسانییەتەوە بەدوامدا دەگەڕێی، بەو خەیاڵەوە چاو لێک دەنێم، نا دەمە شەقەی باڵ، باڵ بۆ کۆترەکان جێ دەهێڵم. ئەگەر کرا بچۆ سەیداوا،

ببینە کۆترەکانم چۆن تۆڵە لە سەرزەوی دەکەنەوە، فڕینیان دەدەنە ئاسمان و جیقنەیان بە زەوی. خەم بۆ من مەخۆ. من وردەوردە شی دەبمەوە، دەبمەوە خۆڵ و هەڵم و کانزا و دەگەڕێمەوە سروشتی خۆم، ئەگەر بوێری ئەوەم هەبێ.

***

نیان کە سەری بەرز کردەوە زانیی هێشتا لە کتێبخانەکەیە، ڕووناکیی ناو دەرگا و پەنجەرەکە بەتەواوی چاویان پێ داخست، ئەو زۆر قووڵ و نزیک چووبووە ناو نامەکەوە، هیچی نەدەدی، تارماییەکی باریکی دیت، کە سەری بەرز کردەوە ئەو ڕۆیشت، نیان هەستا، چەند کورسییەکی وە تەقەوڕەقە خست، مامۆستا و کتێب خوێنەرەکانی دیکە سەریان بەرز کردەوە، ویستی هاوار بکات و بڵێ، "سەروەر نەڕۆی،" چاوەکان بێدەنگیان کرد، بۆ ئەوەی ژیانی کەسێک ڕزگار بکەی دەبێ شەرمەزاریش بیت.

چووە دەرێ، دوای تارماییەکە کەوت، تارماییەکە خێراتر، پێڵاوەکانی یارمەتی نادەن، خێراتر، تارماییەکە دەیەوێ خۆی دەرباز بکات، دەیەوێ خۆی لێ بشارێتەوە، نیان خێراتر، لە شەقامی گشتی، پەڕییەوە، دەنگی ئۆتۆمبێل و خەڵک، تارماییەکە پێچ دەکاتەوە، نیانیش، دەنگی ئیستۆپ و خشانی پاس، هاواری ژنان، نیان ناوەستێ، تارماییەکەش خێرایە، نیان ڕادەکات، دەنگی پێڵاوە شینەکانی تارماییەکە دەوەستێنێ، نیان توند دەستی دەگرێت، تارمەییەکە ئاوڕ دەداتەوە، نیان ڕادەچڵەکێ، جا زەرد و سوور دەبێتەوە، چی؟

لە دڵی خۆیدا چی؟ ئەی هەواڵی مردنەکەت چی؟ بەشەوقەوە، بەتاسانەوە گوتی، "زانیم تۆی، زانیم خۆت لە من گرتووە، سەردار ئەوە تۆ لەکوێی؟ بۆ خۆت ون کردووە؟"

بەخۆشییەوە، بەڵام دیسانەوە بەوپەڕی بێباکییەوە گوتی، "من خۆم ون نەکردووە، ئێوە ونتان کردووەم."

نیان حەوسەڵەی ئەو قسە بەتوێکڵانەی نەبوو، بەپەلە گوتی، "فریا بکەوە، سەروەر خەریکە خۆی دەکوژێ."

دیسانەوە سەردار فەرامۆشکارانە گوتی، "مردن و ژیان بۆ ئەو جیاوازییەکی زۆری نییە. باوەڕ ناکەم مردنیش ئەوی بوێ، مردنیش دڵی بەوەوە نییە."

نیان خێرا گوتی، "نامەیەکی درێژی بۆ من نووسیوە، ئەو نووسەرێکی گەورەیە، عاشقێکی شێتە، من دڵم پێوەیەتی."

سەردار گەشایەوە و توند نیانی لەسەر ئەو شەقامە لەباوەش کرد، گوتی، "چەند خۆشە، تۆش دڵت چووە سەر کەسێک، تۆش دڵت بە کەسێکەوە نووسا، با ژەهر و تاعوونیش بێت، خۆشەویستی دەیکاتە هەنگوین."

نیان دەستی سەرداری ڕاکێشا و چووە ناو کتێبخانەکە تا کتێب و نامەکە بێنێ، سەرسام بوو کە دیتی لە شوێنی خۆیان نەماون، نەیپرسی، خێرا گوتی، "با بچین، با بچین سەروەر بدۆزینەوە، با فریای کەوین، زۆر تەنهایە."

سەردار کە دەیزانی سەروەر لە کونێکەوە چاودێریی نیانی کردووە، هەر بۆیەش نامە و کتێبەکەی دزیوەتەوە تا دەست کەس نەکەون، گوتی، "سەغڵەت مەبە، من دڵی سەروەر دەناسم، ئێستا بێ ئەوەی هەواڵیشی بدەیتێ، بەو هەستەی تۆ مەست بووە، ئەو لە کونێکی ئاسمانەوە هەموو

شتێک دەبینی، تازە نەک مووس، هەزار گولله له دڵی بدەن نامری."

نیان به ترس و نیگەرانی و تەوسەوە ڕوانییه سەردار، ئەو گوتی، "بەڕاستمه، مۆڵەت له ئیزڕائیل وەر دەگرێت و چاوەڕێی تۆ دەکات، تا تۆ نەبینێتەوە هەناسەش نادات، ئەگەر بەو هەناسەڕاگرتنه بمری. ببووره من ناتوانم جاری خۆم دەر بخەم، وەزعم باش نییه، هەندێ کتێبی ئەمانەتم بۆ کتیبخانەکه هێنابۆوە، دەمێک بوو سەیرم دەکردی. (بەگاڵتەوە) له ڕوخسارتەوە زانیم تۆش لەدەست چووی. تۆش چوویته جیهانەکەی سەروەر، تۆش مووسێک دەخەیته بەرباخەڵت."

نیان به جددیتر گوتی، "یەکجاریش وا نا، خۆی نا، نامەکەی ئەنگاوتوومی."

سەردار گوتی، "ئاگایەکت لەو دڵه لەتلەتانه بێ چەقۆکێش."

ڕۆیشت، نیان هێشتا وەستابوو، سەردار دەستی به نیشانەی دوعاخوازی بۆ هەڵبڕی، نیان گوتی، "خوات لەگەڵ سەرسەری."

***

خۆشەویستی ئاوایه، که له شوێنێک دەر دەکەوێ، دەتەقێتەوە، له سەد شوێن چەقۆ هەڵدەکێشرێت و بانگی شەڕ دەدرێ. بەغدا شارێکه بۆ خۆشەویستی، بۆ خۆی نا که هەمیشه چاویان لەسەر یەکتره، بۆ خەڵکی ئەو شارانەی ڕاو نراون و پەراگەندە بوون. خۆشەویستیی سەروەر و نیان وەک

نامەی نهێنی، بەناو قوتابییانی زانکۆکانی بەغدادا بڵاو بۆوە. سەروەر دیوە ڕەشەکەی، دیوە پڕ مردن و بێزارکەرەکەی، نیان دیوە بەڕەونەقەکەی، "ئەو دووانە چۆن پێک هاتن، هیچیان لە یەکتر ناچن؟"

"ئەو ئاڵۆز و تاریک و پڕمەینەت."

"ئەو سادە و ڕووناک و ئاسوودە."

"وەک ئەوەیە تیشکی خۆر بکەوێتە سەر شارێکی وێران."

"شارێکی سووتاو و بۆگەن."

"جۆگەیەک ڕێی بکەوێتە بیابان وشک دەکات."

خۆشەویستی ئاوایە و هاوڕێکانی نادۆزێتەوە، دەکەوێتە سەر شارێکی وێران و مشکێک لە کونێک دێتە دەرێ، بەرخێک لە وێرانەیەکدا چاوەڕێی ڕووناکی دەکات، ژنێک، منداڵێک لە پەنایەک ماوە و ڕزگاریان دەبێ. ئەوان پێیان وا بوو شار کە سووتا ئیدی نابێ خۆریشی لێ هەڵبێ، پێیان وا بوو هەڵیش بێ جگە لە بەرزبوونەوەی دووکەڵ هیچی دی نابینێ. ئەوان نازانن کە هێشتا ئاو دەڕوات و خونچەیەک چاوەڕێی کرانەوە دەکات.

خۆشەویستی ئاوایە، سەروەر ڕووی کرایەوە، ڕەونەقێک پێستە ڕەشە جیرەکەی داپۆشیبوو، ددانە سپی و درێژەکانی سەروەر دەر کەوتبوون. نیانیش باوەشێک گوڵ بوو بە ڕێگادا دەڕۆیشت. ڕۆژانە پێکەوە بوون، باخچەکانی ئاداب، یانەی قوتابییان، پیاسە و عەشقبازی، وەزیرییە و مەعهەد بەریتانی، هەموویان دەیانناسین. شەوانە سەروەر نامەی دەنووسی، نامەی بۆ خۆی دەنووسی، بۆ نیان، بۆ بابی بێگۆڕی، بۆ دایکی:

دایە گیان...

من بەختەوەرم، هەموو شتێکم هەیە، خۆر بە ئارەزووی من هەڵدێ، بەغدا، شەقام و خەڵکەکەی، پرد و ڕووبار و باخچەکانی، هەموویان، هەتا سەربازە مۆنەکانیشی بۆ من پێدەکەنن. بەهەڵە ئەو شارە بە هیی ئەبو جەعفەری مەنسوور ناوزەد کراوە، یان دەڵێن شاری هارۆونە ڕەشیدە، ئەم شارە بۆ من، سەروەری مریەمە ڕەش، دروست کراوە. قوربانی نەعلەکانی گوڵناری خوشکم بم، چاوی سالار ماچ دەکەم.

سەروەر لە نامەیەکدا بۆ خۆی نووسیبوو:

بەختەوەری کە دێت دەرگاشی لێ نەکەیتەوە بە شەق دەیشکێنێ.

لە نامەیەکدا بۆ نیان ئاوا دەست پێ دەکات:

ئەو گوڵەی لە بیابان ڕەگی دەگاتە ئاو، هەرگیز نامرێ، بیابان هەرگیز ئەو گوڵەی نییە، ئەوە ئەفسانەیە، ئەو گوڵە لێرە لە دڵی شەقشەقی مندا هەیە. ڕەگی بە تەواوی دەمارەکانی خوێنمدا بڵاو بۆتەوە، هەرگیز وشک ناکات، لەجیاتیی دەمار، ڕەگی ئەو گوڵەیە ئێستا خوێن بۆ مێشکم، بۆ تەواوی خانەکانی جەستەم دەگوازێتەوە.

هەموو ڕۆژێ بەیانییان لەسەر کورسییەکانی پشت

یاریگاکە، یان باخچە تەریکەکانی پشت بەشی فارسی دادەنیشتن، دواتر دەچوونە دەرێ، دەچوونە کۆڕنیش، لە پشت باڵەخانە گەورەکەی مەدینە توب، لە هەر شوێنێ چۆڵ با، نیان سەری بە سینگی سەروەر دەکرد، سەری بەسەر دڵی دەکرد، ئەویش نامە و شیعرە بێکۆتاییەکانی بۆ دەخوێندەوە:

هەموو شتێک هاتۆتەوە جێی خۆی، باڵندە سەرلێشێواوەکان، خاڵەکان بۆ شوێنی خۆیان، نیان بۆ سەر سینگم، هەموو شتێک گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی دەیگوت، "پێشتر خاڵی سەر وشەکان بێمەبەست بەسەر لاپەڕەکاندا بڵاو ببونەوە، نامەکان وەک ژیان هیچ مانایەکیان نەبوو، ئێستا نا، هەر خاڵە و لە شوێنی خۆیەتی." نیان هەستی بە ڕەگی گوڵەکەی ناو دڵی سەروەر دەکرد، بە سەد زمان خۆی دەکرد بە گوێچکەی نیاندا.

سەروەر شاگەشکە ببوو، کچێکی سلێمانی، بەو هەموو جوانییەوە عاشقی بووە، کچێکی خەڵکی سلێمانی کەم نییە، لە مەڵکەندییش لەدایک بووبێ، نەوەی برایم پاشا، کچێک بە تاجێکی زێڕینەوە، کچێک بە هەموو ڕەنگەکانی شاخی گۆیژەوە، کە هەمووی باعیسی کەیف و سرور بوو، عاشقی ببوو، سەر بە سینگی دەکات و لەسەر گۆی مەمکە بچووکەکانی هەست بە هەناسەی دەکات.

خۆشەویستی ئاوایە، سەروەر کراسی سوور و پانتۆڵی سپیی لەبەر دەکرد، هەر مێرووولەیەکی دیبا، هەر پەڕەسێلکەیەکی دیبایە پووشی بە دەنووکەوەیە و دڵی پێ

خۆش بوو. وای دەزانی هێلانە بۆ ئەو هەڵدەچنن، کە دارێک گوڵی دەکرد، ئەو سوپاسی دەکرد، چونکە دەیزانی بۆ ئەو دەپشکوێ. سەروەر تا دنیا دنیایە لە مەمنوونیی ئەو سەدان دارپرتەقاڵەی وەزیرییە دەر ناچێ، بە وەرز و بێ وەرز سەرتاپایان لە کوڵووک هەڵدەکێشا، ئەو دارانە دڵی خۆیان بۆ عەشقەکەی سەروەر بە درێژیی شەقامەکان ڕاخستبوو.

ڕۆژێک لە باخچە تەریکەکەی بەشی زمانی فارسی، نیان دیسان سەری خستبووە سەر دڵی سەروەر، هەناسەی بەئاستەم بەر سینگی سەروەر دەکەوت، سەروەر دەستی خستە ناو قژیەوە، وەک پەرێزی هەموو دنیا ئاگر بگرێ، دڵی کڵپەی کرد. سەری نیانی سووڕاند. بە لێوە ڕەش و هەڵبزرکاوەکان توند لێوە ئاڵ و گۆشتنەکەی نیانی ماچ کرد، عاشقەکان پێش ئەوەی خوێنیان تێکەڵ بێ، پێویستە لیکیان تێکەڵ بێ. دنیا تەواو ئارام بوو، گوڵێکی سپی تەواوی دنیای داپۆشی، گوڵێک وەک فەرشی پاشا ئەوان لەسەری پاڵ کەوتبوون.

دەنگێک وەک چڵکاوێکی ڕەش بەر گوڵەکە کەوت، "ئێوە شەرم ناکەن، بێئەدەبینە."

کابرای عەرەبی چایچی بوو، گوتی، "بەڕاستی کوردیش بێناموسن."

خۆشەویستی ئاوایە، لە دڵێکەوە سەر دەر دێنێ، لە سەد سینەوە ڕق و ژەهر دەرێژێ. با هەر هاوار بکات خۆ ئەوان گوێیان لێ نییە. ئەوان، سەروەر و نیان دوو گۆماو بوون، دوو گۆماوی لیتەیی، دوو گۆماوی چڵپاو و سیاناویش، هێواش هێواش تێکەڵ دەبوون. لە هەڵچووندا

وەختێک مانگی خۆشەویستی دەگەیشتە سەر سەریان، ئەوەندە نەبوو بکەویتە ناویان، هەڵدەچوون و دەکەوتنە ناو یەکتری، کەوتنێک کە ئاو بە هەڵچوونی مانگ دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، ئەوان نەدەگەڕانەوە شوێنی خۆیان، سەروەر مەحموود بەڵەک، مریەمە ڕەش و ژووره نسرمەکانی قەلاتێی لە نیاندا جێ دەهێشت و نیانیش کەمالی بەزاز و پێنج برای وەک گوڵ و ئاگر و دایکێکی شاژنی سەبەئیی لای سەروەر جێ دەهێشت.

ئەوان هەر شتێک لەناو یەکتردا جێ بهێڵن کابرای چایچی واز ناهێنێ، دووبارە گوتی، "ئێوە شەرم ناکەن، گوێتان نییە؟"

بە سەرۆکی بەشەکەی خۆیان دەڵێت، ئەویش هەر لە ژوورەکەی خۆیەوە تەماشایان دەکات، مامۆستاکان و دوو فەرمانبەریش کە لای ئەوانن لێیان دەڕوانن. هەریەکە و شتێکی بیر دەکەوێتەوە، هەریەکە و کچێکی دێتەوە خەیاڵ، زۆربەیان بۆیان هەڵنەکەوتبوو لەو تەمەنەدا، لە تەمەنی ئەواندا، ئاوا ماچی کچێک بکەن، قووڵ بچنە لێوی کچێکەوە، بۆیان هەڵنەکەوتبوو لە پەنایەک دەست بخەنە ناو سینگی کچێک. ئەوان ڕۆژە شیرینەکانی خۆیان، ڕۆژانە تەمەن و حەسرەتی خۆیان لەگەڵ گۆرانییە هەرە مردن و پڕحوزنەکانی عەرەبیدا بەسەر بردبوو.

هیچ ئومێدێکیان نەهاتبووە دی، زۆر بەزەحمەت پەنایەکیان دیبۆوە دەستپەڕی لێ بکەن، ئەگەر ئەو هەموو خەڵکەی لە ژوورەکەی نەبا، ئەو سەرۆک بەشە خۆی لە بەر ئەو دانیشتن و ماچەی ئەوان بەتاڵ دەکردەوە. هێزێکی بێناوونیشان لە سینگی ئەو سەرۆک بەشەوە هاواری کرد،

"ئـەو خوێڕییانـەم بـۆ بانـگ بکـەن."

نیـان و سـەروەر لـەو دەنگە ڕاپەڕیـن، زانییـان هەمـوو دنیـا ئەوانـی دیتـووە، خۆشەویسـتی ئاوایـە، کـە دەڕژێ هەمـوو پـێ دەخەنـە نـاوی. وەک دوو تاوانبـار وەک دوو سـەربازی هەڵاتـووی بەرەکانـی شـەڕ هێنایاننـە بەردەمـی، ئەویـش بـێ پرسـیار گوتـی، "ئێوە هەردووکتـان فەسڵن. بۆتـان نییە جارێکی دیکـە بێنـەوە زانکـۆ."

سـزای پیاوکوژ پێویسـتی بە لێکۆڵینـەوە و دادگا و پۆلیس هەیـە، بـەڵام سـزای خۆشـەویستی نـا تەنها تفکردنێکی دەوێت.

خوێنـە گەشـەکەی تۆزێـک پێشـتر کاڵ کاڵ ببـۆوە، بـەرەو مـۆری دواتـر بـەرەو ڕەشـی چـوو. یەکێـک لـە فەرمانبـەرەکان گوتـی، "ئەوانـە قوتابیی بەشـەکەی ئێمـە نیـن."

سـەرۆکی بـەش لـە شـوێنەکەی خـۆی دانیشـت، دەشـێ تەلیسـمی ئـەوە لێـی دابـێ، ئـەو کچـە ناسـکە، لـەو تەمەنـەدا کتێبەکانـی لە بەر پێـی دانـاوە و عەقڵی بە دڵی سـپاردووە. نیان و سـەروەریش تاسـابوون، لـەو کاتـەدا یەکێک لـە مامۆسـتاکان لێـی پرسـین، "ئێـوە چیـی یەکتـرن؟"

سـەروەر ڕوانییە نیـان، نیان چاوە بەتاڵە سـەوزەکانی مـات بـوون، وەک ماتـی ئـەو گۆمـەی ڕۆژانـە پـەڕ و باڵـی باڵنـدە پێکـراوەکان دەکەونـە نـاوی، "ژنمـە، ئێمـە ڕاسـتە قوتابییـن، بـەڵام مارەکـراوی یەکترین، ئێمـە ژن و مێردیـن."

نیـان وەک ئێسـتا لـە خەوەکـە بەئـاگا هاتبـێ، وشـەکانی سـەروەری لەنـاو هەواکـەدا دیـت، ویسـتی بیانگرێتـەوە پێش ئـەوەی بگەنـە گوێـی ئەوانـی دیکە،نـا، دەنـگ ناگەڕێتـەوە، ئـەوەی لـە وانـەی فیزیـا خوێندبـوو، شـەپۆلی دەنـگ جگـە

لەوەی ناگەڕێتەوە، وەک یەک بە هەموو ئاڕاستەکانیشدا بڵاو دەبێتەوە.

سەرۆکی بەشەکە چەند پرسیارێکی لێ کرد، سەروەر گوتی، "بەڵێ، بەڕەزامەندی باب و داکمان، لای مەلا مارەم کردووە، تەنیا مەحکەمەمان ماوە."

سەرۆکی بەشەکە حەوسەڵەی نەما، "بڕۆنە دەرێ، ناویان بنووسن، خۆم بەدوای قسەکانیاندا دەچم، لەو بەشە نەتانبینمەوە."

چوونە دەرێ، چایچییەکە گوتی، "کەس ژنی خۆی لە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە و لە باخچەی زانکۆ ماچ ناکات."

ئەوان قسەیان نەکرد، وردەوردە، وەک سوپایەکی تێکشکاو، بەبن دیوارەکاندا پاشەکشەیان کرد، پێش ئەوەی بە تەواوی دوور بکەونەوە، چایچییەکە گوتی، "کەس ژنی خۆی ناباتە ئەو پەناوپەسیوە."

نیانی لەگەڵ نەبا دەیگوت، "ئەی ژنی خەڵکی دەبا؟"

ئەوان خێراتر دوور کەوتنەوە، سەروەر لە دڵی خۆیدا گوتی، "با، مەحموود بەڵەک، مریەمە ڕەشی دەبردە پەناوپەسیوان، ئەوان ژووری تایبەتیان نەبوو، هەموویان لە ژوورێک دەخەوتن، ئەوەش سەردەمێک بوو، مەحموود لەوسەر و مریەم لەوسەر، نیوەشەو، یان وەختی بانگی بەیانی، کە سەرەوەر سەری بڵند دەکرد، باب و داکی لەوێ نەماون، دەیزانی چوونە سەرشۆرکەکە دەستنوێژ هەڵگرن، بەڵام ئەوان دەچوونە ژوورە نسرمەکەی خوارێ، ئەو ژوورەی تاریکترین ڕۆژەکانی ژیانی تێدا بەسەر بردن، ئەو ژوورە نسرمانەی قەڵاتێ ماڵی ئەهریمەنەکان بوون، سەروەر

پێی وا بوو هەموو ئەهریمەنەکانی دنیا بۆ پشووودان دێنەوە ئەو ژوورانە، باب و دایکیشی لەوێ لەگەڵ ئەهریمەنێک ژوانیان هەبوو، ئەهریمەنێک لە دڵی ئەو خەڵکەدایە لە هەر شوێنێک تەنها بن، ئەوا ئەهریمەن حکومیان دەکات. هەستی کرد غەدر لە مەحموود بەڵەک دەکات، لە دڵەوە گوتی،

"بێ تۆ چەند تەنهام نە خۆت و نە گۆڕت."

باوکێکی بێگۆڕ سەبوری منداڵەکانی بۆ ئەبەد لەگەڵ خۆی دەبات.

نیان تاسابوو، کچ لە منداڵییەوە دەزانێ شەرەف هیی ژنە و پیاو شەرەفی نییە، تا بیپارێزێ.

خۆشەویستی ئاوایە، لە کۆلێژی ئاداب تەقیەوە، لە هەموو بەش و پۆلەکانی، لای قوتابی و مامۆستا و کارمەندەکان تەقیەوە، "کوڕ و کچێک گیران." وەک ئەوانە ئەو وڵاتەیان کوشتبێ تا بۆگەنکا. خۆشەویستی ئاوایە، "کوڕ و کچێک بەسەر یەکەوە گیران،" دۆست و دەزگیرانەکانیش وایان دەگوت، "حەیایان چوون." برادەرە هەرە نزیکەکانیان دەیان گوت، "شەرەف گرانە." فرێیان دان و بە چرپە و نیگای نهێنی تەوسیان پێ کردن.

"ئەو دووانە خراپ شوڵیان لێ هەڵکێشاوە، هەمیشە دەستیان لەناو دەستی یەکتردایە."

"حەیای کوردیان بردووە."

"ئەی خێزانەکانیان؟"

***

هەر ئەو شەوە سەروەر نامەیەکی بۆ نیان نووسیی:

"من ئەو زەلکاوە بووم تۆ کەوتیتە ناوی، من کێڵگەی مینم، دوێنێ تەنها یەکێکیان لەژێر پێی تۆدا تەقییەوە، ئیدی مەیە پێش، یەکیەک مینەکان پێتدا دەتەقنەوە، هیچ شتێک لەو وڵاتەدا لە مینی خۆشەویستی مەترسیدارتر نییە. مینی ڤاڵمار، مینی دەبابە، مینی پەڕدار ئەوانە هیچیان ناتوانن نیوئەوەندەی مینی ئەڤین وێرانکەر بن.

مینەکانی ناخی من زۆرن. تۆ زۆر لەوە پاکتری پێ لە لیتاوی ژیانی من بنێی. تاریکیی من لەوە خەستترە ئومێدی ڕووناکبوونەوەی هەبێ. ئەوڕۆ نییە، مینەکان لە ناخی مندا چێنراون، لەوەتەی هەم هەموو ڕۆژێ مینێک لە ناخی مندا دەتەقێتەوە. تۆ لەوە جوانتری بە ژەهری ژیانی منەوە بمری، یان بتکوژن. زەلکاوی ژیانی من ڕۆژبەڕۆژ، دڵۆپ دڵۆپ دروست بووە، تۆ لەناو ئاوریشم و حەریر پەروەردە کراوی، ناسکیی تۆ، خۆت و باڵا و داهاتووت، ناسکیی تۆ بەرگەی ئەو ڕقە قورسە ناگری، کە ژیان بەرەو ڕووی منی کردۆتەوە. ئەوڕۆ من دژی ئەو ژەهر و توڕەیییە ناجەنگم، کە تەواوی ژیانمی تاڵ کردووە، من دژی تۆ، نیانەکەی ڕۆحم دژی تۆ دەجەنگم، دژی جوانی و خۆشەویستی و گەورەییی تۆ دەجەنگم، تا ئەوەندەی دەکرێ لە خۆمت دوور بخەمەوە و بتپارێزم.

من شێرپەنجەم، من شێرپەنجەی تەمەنی تۆم، لە ڕەگەوە بمبڕەوە و فڕێم بدە. هەرگیز بۆ لەدەستدانم دڵتەنگ مەبە، چونکە هەموو تەمەنی من دڵتەنگیەکی تۆ ناهێنێ. کەسیش بۆ ڕزگاربوونی لە شێرپەنجە خەم ناخوات. تۆ من وەک

شێرپەنجە فڕێ بدە، لە خەمم مەبە، چونکە شێرپەنجە نامرێ و لەناو خۆیدا گەشە دەکات. ئەمشەو سەد جار بۆ تۆ گریاوم، من تاکە زەلکاوم لە هەموو مێژوودا بۆ قوربانییەکەم هۆنهۆن بگریەم. چەندی دەتوانی ژیانی شیرینت لە من دوور بخەوە، من تاڵم، تاڵیی من سەمەرەیە، دڵۆپێک لە تاڵیی من سەرانسەری دنیا دەکاتە ژەقنەبووت. با هەموو دنیا وێران بێت، بەس لە تۆ دوور بێت، من بەتەنها ڕووبەڕووی هەمووان دەبمەوە گەر بزانم تۆ ئارامی...“

سەروەر نەیدەزانی بە چ دڵێکەوە ئەو نامەیەی بۆ نووسیوە، ئەم نامە دڵی نیان ئەگەر لە ئاسن و بەردیش بێت، ورد دەکات. جارێک کە دەزگیرانەکەی زەلکاو و ژەهر و شێرپەنجەیە، جارێک، کە داوای دوورکەوتنەوە و وازهێنانی لێ دەکات، بەڵام ئەهریمەنێکی بچووک، ئەهریمەنێکی پڕ فێڵودەهۆ، ئەهریمەنێ لەناو دڵی سەروەر، تەواو لەسەر دەمارە شینەکەی بەندی دڵی، بەوپەڕی زۆڵیەتی و حەرامزادەییەوە، دانیشتووە، لاقی سوور و باریک و خەنجەری شۆڕ کردۆتەوە و لاق لە لافاوی خوێنی جووڵاوی دەکوتێ، بزەی سەگیەتی دەهاتێ، ئەو ئەهریمەنە بەردێکی بۆ دڵی نیان هاویشتووە، بەردی هەڵبژارد، چونکە دەزانێ دڵی ئەو خونچەیە، شووشەیە، بەردێک یان لەتلەتی دەکات، یان لەناویدا بۆ ئەبەد بە بەردی خۆیەوە دەمێنێتەوە. سەروەر لەگەڵ هەموو وشەیەکدا ڕۆحی ئەو ئەهریمەنەی ناردبوو.

سەروەر دەیزانی عەشقیش وەک بەرد و سندان وایە لەسەر دڵی کچان، تەنها گوڵە سوورەکەی و خەندەکەی

سەرەتای، شیرین و مەستکەرە، دەنا کچ هەتا ماوە دەبێ، دەبێ عەشقەکەی وەک بەردێکی لەشکاننەهاتوو لەناو دڵیدا هەڵگرێ.

نیان کە نامەکەی خوێندەوە هەستی بەو ڕاستییە کرد، کە زەلکاوێک، سیاناوێک داگیریان کردووە، قاچەکانی پێوە بووە، زەلکاوەکەش وردەوردە بۆ قولایی ڕای دەکێشێ، هەتا لیتاوەکە خەستتر بێت قوربانییەکە توندتر بۆ قووڵایی ڕادەکێشرێ.

خۆشەویستی وەک لیتاو وایە، با لیتاوی هەنگوین بێ، تا قووڵاییی خۆی ڕاپێچت دەکات، تا ئەو شوێنەی ئیدی ناتوانی هەناسە بدەی، بەڵام نا، ناکرێ نامەیەک کە لەوپەڕی پەرۆشی و عەشقەوە نووسراوە هەڵی خەڵەتێنێ، نا هەمووی بۆ ئەوەیە خۆی بەتەنها ڕووبەڕووی گوللەی خیانەتکاران بێتەوە. ئەو سەروەرە چ کوڕێکی پاک و سەرڕاست و فیداکارە، دەیەوێ تەنها خۆی، بەتەنها بەرگەی تاڵیی میحنەتەکە بگرێت و ئەو ئازاد بێ. دەیەوێ خۆی بەتەنها شەڕی هەمووان بکات، ئەو بەپاکی و بێکێشە بمێنێتەوە، بە خۆی گوت، "تایبەتە، بیرکردنەوەکانی تایبەتن،" ئەو سەروەرە لەناو پیاواندا تایبەتە، من ناکاتە قەڵغان و خۆی بێبەری.

هەموو شوێنێک بەدوای سەروەردا گەڕا، پۆل و کافیتریا و یاریگا و باخچەکان، مەعهەد بەریتانی، کۆڕنیش و هەموو شوێنێ، بەڵام کوا، سەروەر دیار نییە، لە هەموو کاتێک زیاتر ئێستا مووسەکەی سەر دڵی سەروەر ئازاری نیانی دەدا، وەک ئەوە وا بوو مووسەکە بەڕووتی بەناو دەمارەکانی دڵی ئەودا بچێ، لە کەسی نەپرسی، ئەو دەبوو سەروەر

بە بۆن، بە بۆنی لیتاو و زەلکاو نا، ئەو سەروەر بە بۆنی موحیبەت و خەمخۆری ببینێتەوە.

سەروەر لە ئاداب چووبووە دەرێ، چووبووە بەریدی ناوەندی شار، لەوێ بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ دایکی قسە دەکات، بەوە باش بوو، لە هەولێر جیرانەکەیان تەلەفۆنیان هەبوو، کابرا فەرمانبەری دائیرەی بەرید بوو. سەروەر وەک خەون بۆ ئاو بگێڕێتەوە، هەموو شتێکی بۆ دایکی گێڕایەوە، جنێوەکانی کابرای چایچی، هەڕەشەکانی سەرۆکی بەشەکە، گاڵتە و توانجەکانی قوتابییە کوردەکان، هەموو شتێک. گوتی، "دایە لەدوای تۆ نیان تاکە کچە لەباوەشم بکات و بێز لە سەروچاوی قوپاو و ڕوومەتی پڕ زیبکە و لووم نەکات. یەکەم کچە سەر بخاتە سەر سینەم و بۆنم بکات، بێز لە سینەی وەک تەختەم نەکات و بەسەرمدا نەڕشێتەوە. ببوورە دایە گیان منیش لەباوەشم کرد، بۆنم بە قژە ئاوریشمینەکەیەوە کرد، کە زانیان بۆنی نیانم هەڵگرتووە، ئاخر دایە گیان کوڕ دەتوانێ هەموو شتێک بشارێتەوە، تەنها ناتوانێ بۆنی ئەو کچە بشارێتەوە، کە دێتە باوەشی. ئێستا تەواوی ئاداب دژی منن، وا دەزانن گەوهەرەکەی باخەڵی ئەوانم دزیوە، وا دەزانن سیحری ئەوانم بەتاڵ کردۆتەوە.

هەر هەمویان، برادەرە کوردەکانیشم، سووک سووک وەک بەراز تەماشام دەکەن و بە شایانی ئەو کچەم نازانن. ئەوەندە نییە بمدەنە بەر شەق، بە چاوە حیز و نیگا تاڵەکانیان نەفرەتم لێ دەکەن، بە دەستیان بێت دەمخەنە مەنهۆڵێکەوە. دایە گیان من باکم نییە، من باکم بە نەفرەتی ئەوان نییە، ئەو کوڕێک ببێتە شای کوڕەکان باکی بە پیلان

و دڕکی سەر ڕێگا نییە. من باکم بە نەفرەتی ئەوان نییە، لەگەڵ نەفرەتی هەمووان ڕاهاتووم، خەمی قورسم دڵی ئەو پەپوولەیەیە، ئەو دڵی خۆی بۆ من کردۆتەوە، لەسەر ئەو دڵکردنەوەیە هەموو دنیا بۆتە دوژمنی.

کە عەرەبە چایچییەکە گوتی ئێوە بێناموسن، جەرگم بۆ کەرامەتی ئەو کچە داغ بوو، ئاخر کچ پەڕەیەکی ئایەتە و نابێ قسەی پێ بگوترێ، هەر کە وای گوت من گوێم لێ بوو، گوتم بەشکم نەیڵێتەوە، گوتیەوە، خەریک بوو لە بەرچاوی ئەو کچە بمدەنە بەر شەق، من ناچار بووم بڵێم ژن و مێردین، ئەوان واز ناهێنن، دەڵێن بەدوای کارەکەتاندا دەچین، یەخەی نیان دەگرن، لەسەر من یەخەی ئەو دەگرن، دەشێ هەواڵ بۆ باب و براکانیشی بنێرن، پرسیار لەوان بکەن. دایە گیان تەنها تۆم هەیە، دەبێ بچیە سلێمانی، بچی بۆ ناو بەزازەکان، لە خوار بازاڕی عەسری، لە هەرکەس بپرسی دوکانەکەی کەمالی بەزاز لەکوێیە، پێت دەڵێ، بچۆ دایە گیان شەرم مەکە و بچۆ، ئەوانیش سینگێکیان هەیە دڵێک تێیدا لێ بدات، بەسەر پێڵاوەکانیدا بکەوە، وا بزانە بەسەر سەفین کەوتووی، پێی بڵێ، ئەو کچەتان فریشتەیەکە و خوا بۆ ئێمەی خەلق کردووە، بڵێ کوڕەکەم فیدای تۆزی کەوشەکانت دەکەم. تەنها ڕازی بە بیکە خزمەتکاری خۆت، ئەو کچە لە نوور پاکترەمان بدەیە."

کەمالی بەزاز گوتبووی نووری چی؟ ئێوە کچەکەتان پیس کردووە، ئێوە بۆگەن و شێرپەنجەن، ئەو کوڕەی تۆ ژەهر و تاعوونە، دڵۆپێکی بەر داوێنی کچەکەم کەوتبێ، هەرگیز خاوێن نابێتەوە.

مریەم گریابوو، هەم لەسەر تەلەفۆنەکە لەگەڵ سەروەر، هەم لە بەردەم کەمالی بەزاز، ئەو پیاوە بەدەسەڵاتانە چۆن بە پێڵاوەوە بەسەر دڵی ئەو ژنە کەوتوون. ئاخر ژن کە مێردی نەما لەو وڵاتەدا وەک زبڵ تەماشا دەکرێ، کە ناشکێت و ئازار ناچێژێ، هەر شتێکی بەسەر بێت لە نرخی کەم نابێتەوە.

ئەوانەی لە دەوری کابینەکەی سەروەر، کە تەلەفۆنی لێ دەکرد، سەرەیان گرتبوو، هەموویان ڕۆیشتن، خۆ ئەوان لە کوردی نەدەگەیشتن، بەڵام هەر لەو لیتاوە ڕەش و گریان و پاڕانەوەیەی لەژێر دەرگای کابینەکەوە دەهاتە دەرێ زانییان ئەو کوڕە ڕەش و چرچ و جرجە، تا بەتەواوی نەتوێتەوە لە کابینەکە نایەتە دەرێ.

سەروەر نەیدەزانی کەنگێ هێڵەکە پچڕاوە، نەیدەزانی دایکی گوێی لە کام لە قسەکانی نەبووە، بەپێ بە شەقامی ڕەشیدا هاتەوە، لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد، بەناو هەزاران ڕێبواردا تێپەڕی، هەر بیری دەکردەوە و قسەی دەکرد، هەر کچ و کوڕێکی دەدی دەستی یەکتریان گرتبوو ئاگر لە جەرگی بەر دەبوو، هەموو دنیا دڵی خۆیان بۆ یەکتر دەکەنەوە تەنها کورد، تەنها کورد بەرد و ئاسن و پۆڵایە، دڵی نییە، دڵی بۆ خۆی، بۆ ژنەکەی، بۆ کچەکەی ناکاتەوە، سەروەر لەو بڕوایەدا بوو ئەگەر کورد دڵی خۆی بکاتەوە، ئەگەر کورد خۆشەویستی بناسێ، دنیا بەرگێکی کە لە بەر دەکات و تەمەنی مرۆڤیش سەد ساڵێکی دیکە درێژ دەبێتەوە.

ئەگەر نیان نامەکەی خوێندبێتەوە، ئەگەر ڕازی بێت خۆی لەو زەلکاوەی سەروەر ڕزگار بکات، جا ڕزگاری

دەبێ؟ چا هەر بە تانەوتەشەر دڵی ناکرۆژن؟ نا، ئەوەندەی سەروەر نیانی دەناسی واز ناهێنێ، ئەو ئەهریمەنێکی لەگەڵ هەر وشەیەکدا ناردبوو، چرکەبەچرکە هەواڵی دەدایە. ئەو کەوتبووە ناو لیتاوی دڵی، لیتاوی زێرابێک نا، لیتاوی دڵی سەروەریش ئەوەندەی قورسی خەمەکانی خەست و ڕەش و قورس بوو، نەک تا ناوک، تەنها پەنجەیەکت پێیدا بچێ تازە بەرت نادات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئازادیی دابوویە، سەرپشکی کردبوو، خۆ کچی کوردیش هێندەی سێ پیاو غیرەتی هەیە، هەر هێندەی بەڵێنی دا، ئەگەر دۆستەکەی هیچ و ئایاغ و شەلاتیش بێت ، غیرەتی ناهێنێ لەسەر قسەی خۆی پەشیمان بێتەوە، نەک هەر ئەوە خۆشی لەسەر بەکوشت دەدات، بەشی هەرە زۆری ژنی کورد بەو غیرەتەوە لەگەڵ پیاوە پاتاڵەکانیان ماون، دەنا نە لەزەتی سێکسیان لێ دەکەن، نە قسەیەکی خۆشیان لێ دەبیستن، هەر وا وەک بنێشتوزفت پێیانەوە نووساون.

سەروەر ڕاستی دەکرد، ئەو نامە هەر ژەهرە، دڵی نیانی بەتەواوی ئاگردا و تاعوون و شێرپەنجە تەواوی دەمارەکانیان داپۆشی، زیاتر سەروەریان بردە ناو موولولەکانی خوێنیەوە، لە دڵەوە گوتی، "نا، ئەو کوڕە مەردە لەبەر من خۆی داوەتە بەر نەفرەتی هەمووان، هەر بۆ ئەوەی قسەیەکی سارد بە من نەگوترێ خۆی بەکوشت دەدات."

سەروەر پێش ئەوەی بگاتە حەیدەرخانە، شتێکی بیر کەوتەوە، ڕووناکییەکی لە دڵدا هەڵکرا،

"دەچم بۆ لای ئەبوو سەلام، بەڵکو لەوێ بێ."

ئەبوو سەلام جگەرچییەکەی قەمبەر عەلی، ئەو پیاوە

کۆمۆنیستەی، بێگومان زووتر کۆمۆنیست، پێش ئەوەی نینۆکەکانی دەر بهێنن، ئەبوو سەلام لەو بیروباوەڕە پۆلایینە، تەنها سمێڵێکی ستالینیانەی بۆ مابۆوە، کە گەیشتە بەر دوکانەکەی کاریان تەواو ببوو، ئەبوو سەلام لە بەردەم دوکانەکەی دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشا، کۆڵی بە هەر دەپەنجەی دەستیەوە دیار بوو، ئەبوو سەلام گوتی، "دەزانم بۆ لای من نەهاتووی."

سەروەر پرسیی، "دەر نەکەوتۆتەوە؟"

ئەو بەپێکەنینەوە گوتی، "دیارە ئاگاداری..."

لەو قسانەدا یەکێک لە دواوە گوتی، "ئێستا تەنها ئاگاداری دڵیەتی... عاشق بووە."

سەروەر ئاوڕی دایەوە، باوەشیان بەیەکدا کرد، توند و توندتر، سەروەر بەسەر شانیدا گریا، کە هەستی بە تەڕایەتی فرمێسکە گەرمەکانی کرد لەسەر شانی، سەردار گوتی، "ئەو فرمێسکانە خەسار مەکە، پیاوی عاشق زۆر پێویستی بە فرمێسکە..."

سەردار لای ئەو پیاوە کۆمۆنیستە گیرسابۆوە، هەر ئەویش لە زیندان ڕزگاری کردبوو، پەنای دابوو...

سەروەر گوتی، "خۆزگە منیش شیوعی بام، ئەگەر گیرابام و زیندانی کرابام و هەر دە پەنجەیان دەر هێنابام هێشتا ئەوەندەی ئازاری دڵ، پەرێشانی نەدەکردم. کاکە سەردار بەتەواوی لە پەلوپۆ کەوتووم."

سەردار بە دڵگەرمی و زەوقەوە گوتی، "من پێم وا بوو گەیشتوویە هەوای خۆت، من گوتم سەردەمی خۆشەویستیتە. من پێم وا بوو تۆ ئێستا سەرداری دڵمەستەکانی بەغدای،

من لە ئاسمان بۆت دەگەڕام، دەمزانی لە شەقەی باڵدەدەی."

سەروەر گوتی، "نا براکەم نا، وەرزی ئەڤین فریای گوڵکردن ناکەوێ، بارانی ئەڤین ناگاتە سەر زەوی، خۆشەویستی لە هەوادا دەبێتە هەڵم... ئێرە بیابانە، کوا نێرگز تێیدا گەشە دەکات."

سەروەر بە سێ قسە هەموو شتێکی باس کردبوو.

"نیان ژیانە ڕەشەکەی منی ڕەنگ کرد، ڕەنگی کرد و مانای پێ بەخشی، ڕەنگی کرد و خستیە سەر پێ، بەڵام خۆی، خۆی ژیانی ڕەش داگەڕا، یەکترمان خۆش ویست، ئێستا نیشانەی تیری دوژمنین."

سەردار ئەو کوڕەی کێشەی هەمووانی چارەسەر دەکرد تەنها هیی خۆی نەبێ، گوتی، "عەشق دوژمنی نییە، عەشق نائەنگێورێ..."

سەروەر گوتی، لە باخچەکەی بەشی فارسی ئێمەیان گرت، ڕیسوایان کردین، پێیان گوتین بێشەرەفینە، من گوتم ئێمە ژن و مێردین."

"بەوە ڕزگارتان بوو لە دەستیان."

"نا سۆراغمان دەکەن، دەیانەوێ دڵنیا بن."

سەروەر باسی نامەکەشی کرد،

"تەنها دەمەوێ ئەو دەرباز بێ، با من سزاکە بچێژم."

سەردار گوتی، "ئەوان بەردیان لە دڵی تۆ داوە، تۆش بەرد لە دڵی نیان دەدەی، پیاوی دانا؟"

سەردار هەستی کرد نیگەرانیی ئەڤین ڕووی لە سەروەر کردووە، بەڵام ئەو ئەڤینە هیچ ژیانی لای ئەو نەسرپیوەتەوە، ئەو لە سەرەتاوە دەترسا لە تێکەڵبوونی ئەو ڕووناکی و

تاریکییە، ئەو شەو و ڕۆژە، چەند یەکتر تاریک دەکەن و چەند یەکتر ڕووناک دەکەنەوە. سەروەر لە گومانەکەی گەیشت، بۆخۆیشی لەو هەموو تاڵییە دەترسا سەرتاپای ژیانی داگیر کردووە، وتیشی، "من دوای تاڵی ناکەوم، من دوای مردن ناکەوم، ئەو بەرەو ڕووم دێت. دەمەوێت کە دەمگرێت و لە ئەرزم دەدات تەنها بم."

سەردار پرسیی، "ئەوە لە دڵتەوەیە، مەبەستم تەنهاییە؟"

نا سەروەر لە دڵیەوە نەبوو، بۆیە گوتی، "سەردارەکەم، برای غەریبم، من یەکەم جارە ڕووناکی دەمگرێتەوە، دەمەوێ ڕووناک ببمەوە."

سەردار گوتی، "چرا هیچ نابینێ، چرا تەنها هۆکارێکە بۆ بینین، نیان هەم چرا و هەم چاوە بۆ تۆ، دنیا ڕووناک دەکاتەوە، تۆ دەبێ چاوت هەبێ تا هەم چراکە و هەم ژیانت خۆش بوێ."

سەروەر گوتی، "تۆ باسی عیرفانم بۆ دەکەی؟ من مەولانای ڕۆمی نیم، من زبڵ و خاشاکم، من دەروێش و خەلیفەم ناوێ، من سەرگەردانم، وێڵ و وێڵگەردم."

"کاکە سەروەر درەنگە بۆ سەرگەردانیت، درەنگە، تۆ ئێستا تەنها نیت، هەرکەس تەنها نەبێ ناتوانێ سەرگەردان بێ."

یەکەم ماف کە خۆشەویستی لێت دەستێنێتەوە، ئەوەیە ناتوانی سەرگەردان بی. سەردار گوتی، "بە دوو باڵی خۆتەوە دەتتوانی بەئاسانی بفڕی، نزم بفڕی، بەرز بفڕی، دوور یان نزیک بفڕی، ئێستا تۆ چوار باڵت هەیە دووی خۆت و دووی نیان، هیچ زیندەوەرێکت دیوە بە چوار باڵ

بفڕێ. تەنها ئەگەر یەکێکیان بمرێ."

"ئەوە بۆ دەروێش و شێخ ڕاستە برای کۆمۆنیست، نەک بۆ دوو ئەڤیندار، بۆ مەولانا و شەمس ڕاستە، دەبوو یەکێکیان بمرێ، تا ئەوی دیکە بە باڵە متمانەپێکراوەکانی خۆی ئەویش هەڵگرێ، بەڵام بۆ عەشق نا..."

سەردار گوتی، "منیش ویستم بگەیتە ئەو ڕاستییە، عەشق و فڕین درۆیە، شێخ مەبەستی تەسلیمبوونە و قسەیەکی مەجازییە، وەک مەجاز زۆر جوانە، بەڵام من باوەڕم بە واقیع هەیە، عەشق نافڕێ، هەر لەسەر زەوییە بۆیە دەبێ کێشەکانی خۆی قبووڵ بکات، تەنها ئەوەیە سێبەری عاشقان لەسەر زەوی سووکترە."

سەروەر گوتی، "سووکترە، بەو مەرجەی لەسەر زەوی کەسی دیکەی لێ نەبێ، هەر ئەو جووتە بن."

سەروەر باسی تەلەفۆنەکەی دایکیشی گێڕایەوە، "هاوڕێم من سەرم لێ شێواوە، لە کاتێکدا نیان بێئومێد دەکەم، تەلفۆنێکی ئاواش بۆ دایکم دەکەم."

"ئاسانە ویستووتە هەردووکیان بکوژی، ئازاری خۆتیان لێ بار بکەی، بڕۆ بۆ لای نیان تۆ دەبێ ئێستا لای ئەوە بیت."

***

کە یەکتریان دۆزییەوە تەواو شەکەت ببوون، سەروەر کە نیانی دیتەوە ئیدی نەیتوانی هیچی دیکە بڕوات و لەپەنا شۆستەکە دانیشت، نیان هات دەستی خستە سەر شانی

و ئەویش لایەوە دانیشت، بۆ ئەوەی سەیری یەکتر بکەن دەستی یەکتریان گوشی، سەیری دوور، دووریان کرد و دەستی یەکتریان توند گوشی، ئەوەش پەیمانتازەکردنەوە بوو، بە پێنووسی هەوا. خۆر وەک سینییەکی نارنجی خەریک بوو ون دەبوو، سەروەر ئاورێکی بۆ لای نیان دایەوە، چاوە ڕەشەکانی ئەوەندەی دیکە کرابوونەوە، بەس لە بەر تیشکی خۆرەکە هیچیان نەدەدی. لەو خۆرکوێریەدا سەروەر گوتی، "دەبێ مارەت بکەم، هەرچی زووە دەبێ پێکەوە بچینە دادگا."

# ١٠

کە خۆر هەڵدێت دنیا لەگەڵی نوێ دەبێتەوە، پەپوولە بە باڵێکی تازەوە دەفڕێت، بولبول بە ئاوازێکی تازەوە، ژیانیش بە نەفەسێکی تازەترەوە، ئەوە تەواو ئەو ڕۆژە بوو کە نیان و سەروەر بڕیارە گرینگەکەیان دا.

سەروەر دەیان جار لەسەر تەلەفۆن گریابوو، ئێستا هیچ کابینەیەکی تەلەفۆن نییە لەو بەغدایە گریانی سەروەری لەناودا جێ نەمابێ، کەس نییە لەو بەغدایە پەڵەیەکی ڕەشی لە کراسەکەی سەروەر نەچووبێتە دڵیەوە. ئەو هێڵە باریک و نایلۆن و بێگیانانە ژانێکیان بۆ دڵی مریەمە ڕەش دەگواستەوە، ژانێک بتخستایەتە سەر شاخ لەتلەتی دەکرد. لای مریەمە ڕەش قورسترین ژان ئەو ژانەیە، کە تەلەفۆنێکی نایلۆن دڵۆپ دڵۆپ دەیخاتە دڵیەوە.

چوو، لەسەر قسەی سەروەر چەندان جار چوو بۆ سلێمانی، سلێمانی کە جارێک تارای زیوین و جارێک نێرگز و جارێک زەرد و سووری پۆشیبوو، بەلام هیچ کام لەو جارانە

بە ڕووی مریەمــە ڕەشــەوە پێنەکەنــی. گــوزەری بــەزازەکان هەرگیز وەک قوماشــەکانیان ڕەنگاوڕەنگ و ئاوریشــمی ســاف و بەباقوبریق نەبوو، هەرگیز ڕوویەکی خۆشیان پیشانی مریـەم نــەدا. ژنێکــی هەولێری جلــڕەش، کــە ســەری کوڵمــی چەپــی کوترابــوو، بــە شــەقامە بەناوبانگەکانــی ئــەو شــارەدا دەهــات و دەچــوو، بــەڵام جارێــک تەنهــا جارێــک شــەقامێک، ڕێگایــەک، توولەڕێیــەک دڵــی پێــی نەســووتا و جامــە ئاوێکیــان نەدایــە. گەورەتریــن موعجیــزەش تــا ئێســتا ڕووی دابێــت شــارێک بــەو هەمــوو موحیبەتــەوە، چۆن لەگــەڵ ئــەو ژنــە هێنــدە دڵڕەق بــووە. نیانیــش شــەرمی دەکــرد ، شــەرمی دەکــرد باســێکی وا ناســک، پڕ شــەوق و کێشــەش بــە تەلەفۆن بــاس بکات، باسیشــی کــرد، دایکیشــی تێگەیانــد، ســەروەر کوڕێکــە دڵــی داوە بــە مــن، تاکــە کــوڕە دڵــی بــە هــۆی منــەوە لــێ دەدات. پێشــی گــوت، "دایکــە منیــش دڵــم یــاوە بــەو کــوڕە."

پێشی گوت، "خۆشم ئەوێ و خۆشی ئەوێم."

پێشی گوت، "

دایکە تەنها ئومێدم تۆی."

پێشی گوت، "دایکە حەز ئەکەی کچەکەت بمرێ."

پێشی گوت، "دایکە ئەوە تاکە داواکاری کچە تاقانەکەتە."

دایکێــک بــا بەڵقیســی شــاژنی بەزازەکانــی سلێمانییش بێــت، کــە شــەش دەم بــە جارێــک هــاوار بکــەن و گیــڤ ببنــەوە، کــە شــەش کەڵــەگا، کەمــال و پێنــج کــوڕی ملئەســتووری، چووبنــە خوێنــی بەڵقیســەوە، دەســت لــە دەمــارە ســەرەکیەکانی خوێنــی دڵــی گیــر بکــەن، کــوا دەتوانــێ دەنگــی کچێکــی ســەرگەردان و بێهێــز ببیســتێ. ئــەو نەیدەزانــی ئــەو دەنگــەی لــە دەمــەوە دێــت،

کە نەبیسترێت، کە گوێی لێ نەگیرێ، دواتر دەتەقێتەوە و ژیان وێران دەکات.

ئەوان سەروەر و نیان ژیانیان وێران نەکرد، جا بۆ وێرانی بکەن؟ عاشق پێویستی بە هیچ نییە، جگە لە خۆی، ژینیش بۆ هەناسە، ئەوان ژیان، بە ئاشکرا و دڵخۆشییەوە دەستیان خستە ناو دەستی یەکتری، هاواریان کرد و پێکەنین، "ئێمە خۆشەویستی یەکترین." "ئێمە ئەڤینداری یەکترین." "بووینە دەزگیرانی یەکتری."

قوتابییەکان سەریان سوورِ ما، ئەوە ئەو دووانە شێت بوون؟ چۆن سەربەخۆ بڕیاری وا دەدەن؟ میدیا بە نیانی گوت، "تۆ دەزانیت چی دەکەی؟ باوک و براکانت بزانن دەزانیت چی ڕوو دەدات؟ ئەو کاتە چی دەکەی؟ کێ دەتانپارێزێ؟ خۆتان لەکوێ دەشارنەوە؟ خوێندنەکەشت دەچێت."

نیان کە چاوەڕێی خەمخۆری و دڵنەوایی بوو لە میدیا، بێباکانە گوتی، "بچۆ پێیان بڵێ، کێ دەستی گرتووی؟"

"من بەرژەوەندیی تۆم دەوێت، بەرگە بگرە هەر ئەو ساڵت ماوە، دەتوانی لە پشوودا بچییەوە ماڵ و ڕازییان بکەی، ئەو کاتە بەبێ کێشە، بەبێ حەیاچوون."

"حەیا چوونەکە بۆ ئێوە. من شتێکی هەڵە ناکەم، من گەورەم و دەتوانم بڕیار بدەم."

"تۆ گەورەنیت، تۆ نەزان و نەشارەزا و گەمژەی، مێشکت شۆراوەتەوە، عەقڵیان بردووی، دڵت بە کوێیدا چووە؟ ژەهرە ژەهر، من ئاگادارم کردیەوە، ئێستاش کات ماوە فریای خۆت بکەوی؟"

"من فریای خۆم کەوتووم. خۆشەویستی فریای من

کەوتـووە، سـەروەر فریـای مـن کەوتـووە، تـۆ هـەر ڕۆژە و لەگەڵ کەسێکی، تۆ هەوڵی خۆشەویستی دەدەی و بە منیش دەڵێی شێت بووی!"

میدیا لەو گۆڕانە خێرایەی تۆن و وتەی نیان سەرسام ببوو، ئەو هەرگیز بەو گەرمییەوە بەرگری لە کوڕێک نەکردووە، هەمیشە وتوویەتی خۆشەویستی لە ئەزموونەوە دروست دەبێ، چ خێرا گیرۆدە بوو، ڕاستە ئەو کوڕە لە دۆزەخەوە هاتۆتەوە، دەیەوێ هاوڕێیەک بۆ گەڕانەوە پەیدا بکات. هێمنتر گوتی، "ڕاستە خۆشەویستی کوێرە؟ بەڵام ئەوەی تیرەکەی لە دڵی تۆ داوە کیوپید نییە، ئەو تیری خۆی لەو کوڕە خەسار ناکات، خۆشەویستی تۆ شێتییە، بڕۆ بپرسە، بزانە هەموو ئەو ژن و پیاوە چڵکن و پیسانەی سەر شەقامەکان، بزانە خۆشەویستی شێتی نەکردوون، هەموویان سەرەتا وەک تۆ دوای خۆشەویستی درۆزنانە کەوتن، عەقڵیان بەکار نەهێنا، دواتر شێت بوون، خۆشەویستی بە تەنها شێت بوونە."

"مەبەستت چییە خۆشەویستی بە تەنها؟"

"خۆشەویستی دەبێ عاقڵانە بێ، بەتەنها بڕیار نادەی، کەسوکارت هاوڕێکانت دەبێ ئاگادار بن، هیچ نەبێ براکانت کە خۆشیان دەوێی، ئەو کوڕە بۆخۆی یەک پارچە تاعوونە. بەڵا و سەرگەردانییە."

"وا باسی کەسێک مەکە کە نایناسی، تۆ تەنها ڕوخسار دەبینی."

"هەموو کەس دەزانێ کوڕێک لەو غەریبییە کچێک بخاتە سەر کەڵکەڵەی شووکردن، بێڕەزامەندی باوک و دایکی،

بەنهێنیی، ئەو کورە نەک تاعوون، دۆزەخ و شێرپەنجەشە، تۆ خۆت دیوە، ڕەنگ بە ڕووتەوە نەماوە، وەک ئەهریمەنێک هاتبێتە ناو خوێنتەوە. ئەوەی داویەتی بە تۆ، سیمای خۆشەویستی نییە، ڕەنگی مردنە."

"هەمووتان تەنها ڕواڵەتن، لە ڕواڵەتدا دوای خۆشەویستی و ئازادی و کەرامەت کەوتوون، ئامۆژگاریەکانت بۆ خۆت هەڵبگرە، من گەورەم و دەتوانم بڕیار بدەم، یاساش لەگەڵ منە."

"با هەموو دنیا لەگەڵت بێت، کە یاسای ئەخلاق لەگەڵت نەبوو هیچە."

"با کەس ئامۆژگاریی ئەخلاقم نەکات، یاسای ڕەوشت لە دڵی خۆمدایە. هیچ هەڵەیەک ناکەم."

ئەری کێ هەڵە دەکات؟ ئەو یاسا هیچە ئەخلاقییانە کێ دای ڕشتوون. چ خۆشەویستییەک هەڵە بووە؟ نیان هەستی کرد تەنها لە خۆشەویستیدا هەموو ڕۆژەکان نوێن. ڕۆژەکان بازنەیی نیین و ئاسۆیین، دەبێ لە یەکێکیانەوە باز بدەی بۆ سەر ئەوی تریان. تەنها لە خۆشەویستیدا زەوی بەخشندەیە و ژیان بەردەوامە و خۆر هەموو ڕۆژێ نوێ دەبێتەوە.

دیسان سەدەی مێروولەکان دەستی پێ کردبۆوە، دیسان مێروولەکان دەنکە گەنمیان دەگواستەوە، دیسان باڵندەکان بە ئاواز و عەشقەوە پووشکەیان بۆ هێلانەکانیان کێشەوە دەکرد. دیسانەوە ژنە قۆڵ و باسک کوتراوەکانی داوێنی بەغدا، بە خۆیان و ڕیزە مەنجەڵە ماستە گەورەگەورەکانی سەر سەریان هاتنەوە ناو شار، هەوایان پڕ کرد لە بۆنی مەڕ و شیر و بەیبوون، دیسانەوە منداڵی تازە لەدایک

بوون، دیسانەوە ژنە گەنجەکان مەمکیان پڕپڕ بوو لە شیر، شیرێک وەک یەک دەچووە ناو ئێسقان و دڵەوە. دیسانەوە نیان و سەروەر دەستیان تێکەڵ و دڵیان تێکەڵ و لەژێر دارە پیر و پرچدرێژەکانی وەزیرییە کەوتنەوە پێکەنین، کچە هەرزەکارەکانی ناوەندی ئەوانیان دیت و سڵاویان لێ کردن و بۆیان خەنینەوە.

ئەوان کەسیان نەدی، حیکمەتی خودا لە نادادپەروەری دایە، چەندان کەسی دیکە بە نیانیان گوت، عەیبە، عەیبە، عەیبە، شکۆی سلێمانیت شکاند. ئەو هەر پێکەنیی، ددانە سپی و پان و زمانە پەمەییەکەی نیشان دان. ئەویش هێلانەی دروست کرد و پووشکەی دەگواستەوە و چیلکەی دەخستە سەر یەک.

ئەو شتەی، ئەو هەستەی، ئەو زۆڵییەتییەی تەلەفۆن نەیگوازێتەوە، ئاو لەگەڵ خۆی دەیبا، ئەو شتەی ئاو نەیبا هەوا دەیگەیەنێ، ئەو شتەی هەواش نەیگەیەنێ، نامە دەیبا، نامەکە گەیشت، نامە ئاوا بوو:

"تۆ من ناناسی، ناشمەوێ بمناسی و بەدوامدا بگەڕێی، دەمەوێ لە بابەتێک ئاگادارت بکەمەوە، بابەتێک پەیوەندیی بە خۆت و خێزانەکەتەوە هەیە، نامەوێ ببیە پیاوێکی کوردی خاوەن غیرەت و ئازایەتی و کەرامەت و دەست بدەیتە کوشت و کوشتار، دنیا بسووتێنی و شەقامەکان سوور بکەیت و بنەڕێنی، گوایە شەرەف پەروەرن، نا، تەنها ئەوەندەیە کچەکەت لە بەغدا عاشق بووە، هەڵمەچۆ و خوێنت فڕکە نەکات، عاشق بووە و دەیەوێ شوو بکات، ئێمە پێمان

خۆشە، دیارە ڕێگاتان نەداوە بۆیە بەبێ ئێوە بڕیاری خۆی داوە، تەنها ئەوەی لە بەر دڵمان گرانە کە بێ ئێوەییی پێوە دیارە و ڕەنگ زەردە، تکا دەکەم با بەڕەزامەندیی خۆت و با یاسایی شوو بکات، من کوڕێکم لەوێ و ئاگاداری کارەکانیانم، نەمتوانی ڕێگرییان لێ بکەم، تۆش ناتوانی، تکایە تکایە ئەگەر شەهامەتی لێبووردن و بەخشین و خۆشەویستیت نییە، ئەگەر ناتوانی هاوکاریان بیت و دڵیان خۆش بکەی، دڵیان پڕ مەکە لە حەسرەت، هیچ کارێکی تۆڵەستێنانە مەکە، تەنها دەمانەوێ پیرۆزباییان لێ بکەی، بۆ دڵنیاییی ئارامبوونەوەیان"

چ زۆڵێک و بە چ مەبەستێک ئەو نامە ژەهرەی بۆ کەمالی بەزاز نووسیوە؟ کەمال پادشای ئاوریشم و حەریر، پادشای بەزازەکانی سلێمانی، کە ئەو نامەیەی خوێندەوە نەک دڵی هەموو لەشی گرمەی دەهات. دڵی بەتەواوی جەستەیدا بڵاو ببۆوە، وەک شەپۆری جەنگ بۆ هەموو خانەکانی لەشی لێ درابێ. ژێر پێکانی لە هەموو جەستەی زیاتر گرمەی دەهات. جارێکی دیکەش نامەکەی خوێندەوە. جارێک و جارێکی دیکەش، سەد جاری تریش وتیەوە،

"ئەوە چ سەگێک بە چ میزاجێکەوە ئەو نامەیەی نووسیوە؟"

"دەیەوێ بمانکوژێت، یان ئاگادارمان بکاتەوە؟"

"دەیەوێ بمانترسێنێ، یان خزمەتمان بکات؟"

"دەیەوێ فێری ڕەوشتمان بکات، یان حەیامان بەرێ؟"

"دەیەوێ شەرەفم بپارێزێ، یان ڕیسوام بکات؟"

"ئەوە چ کەسێکە دۆستی کچەکەمە، یان دوژمن؟"

"جاسووسە، یان دڵسۆز؟"

چاوە گەورەکانی ئەوەندەی دیکە کرابوونەوە، سوورسوور ببوون، پێڵوەکانی عارەقیان دەر دابوو. ئەو ژنە ڕەش و چرچ و هیچەی بیر کەوتەوە، کە دەهات و دەگریا و پێڵاوەکانی ماچ دەکرد،

"دەبوو پانی بکەمەوە وەک قالۆنچە پانی بکەمەوە."

ئارامی نەمابوو "دەبوو فڕێی بدەم، فڕێی بدەمە بەر سەگ."

کەمال باوک بوو، دەبوو بیزانیبایە ئەو ژنە ڕەشپۆشە لەبەر ئازارەکانی دڵی دێت، نەک قسە ڕەقەکانی ئەو، دەبوو بزانێ منداڵ چ ژانێک دەخاتە ڕۆحەوە، پانیشی کردبایەوە، فڕێشی دابایە ڕەنگی بەغدا هەر دەگۆڕا. بە خۆشەویستیی کچەکەی ئەو پەلکەزێڕینەی شەقامەکانی دەڕازاندەوە، پانیشی کردبایەوە، دارپرتەقاڵەکانی وەزیرییە بە کوڵوکە سپییەکانیان تارایەکی درێژیان بەسەردا دەدان. پەریخان و ئاسۆ و لەیلا و ئەوانی دیکە هەموویان قسەکانی میدیایان بۆ نیان دووبارە کردەوە، "ئەو ساڵیش وانەکانت بخوێنە و زانکۆکەت تەواو بکە."

"تۆ وا دەزانی ئەوە عەشقە، ئەوە فێڵێکە و لێت کراوە."

"خۆت ڕزگار بکە، خۆڕزگارکردن ئازایەتی دەوێت."

تەنها مەحەمەد گوتبووی، "

وازیان لێ بێنن، دنیا بەشێتی کۆتایی پێ بێنی باشترە."

نیان بوێری خۆی کۆ کردەوە و بەبێ ئەوەی سەیری چاوی سەروەر بکات گوتی، "نازانم ئاسوودە نیم. خەریکە بڕووخێم، با ئەو چەند مانگەش بووەستین، هاوین هەمووان

ڕازی دەکەین."

سەروەر قسەی نەکرد.

"کەس باشمان پێ ناڵێ. هەموو یان دەڵێن ئێوە لە خەوندا دەژین. دەڵێن ئێوە منداڵن و نازانن لە فیلمدا دەژین."

سەروەر لە بەر خۆیەوە گوتی، "

بەڵێ من منداڵم و لە خەوندا دەژیم. ئەوە خەونی هەڵبژاردەی منە."

نیان هەستی بەتەنهایی کرد، تەنهاییەک بەسەریدا سەپێندرابێت. ئەو تەنهاییە کوشندەیە، کە لەتەنیشت خۆشەویستەکەتەوە هەستی پێ دەکەی. ئەوەش جۆرە تەنهاییەکە لەگەڵ کچ لەدایک دەبێ، بە منداڵبوون نەبێ، لەکۆڵی نابێتەوە، ئەگەر کچ نەبووایە ئەو تەنهاییە تۆقێنەرە لەدایک نەدەبوو، کچ جەستەیەکی هەیە هەر شتێکی بەر بکەوێ بە ئەندازەی خۆی لە ناخیدا شوێنی خۆی جێ دەهێڵێ، ئەگەر دەنووکی باڵندەیەک بێت لەسەری جێ دەمێنی، بە ئەندازەی ئەو جێگایەش هەست بەتەنهایی دەکات با ئازاریشی نەمابێ.

ئەو شوێنەی لەسەر جەستەی نیان جێ مابوو، ماکی تەنهایی، ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر دەبوو، نەک بە سەروەر بە کەس پڕ نەدەبۆوە. سەروەر هەستی بەو تەنهاییەی نیان کرد، دەیزانی چەند تاڵە، حەزیشی دەکرد نیان ئەو تاڵییە بچێژێ. سەروەر حەزی نەدەکرد هەموو کەس بگاتە نەشئەی ئەو تاڵییە، ئەوە چێژ و نەشئە تایبەتەکەی خۆی بوو، دەیویست نیان لە هەموو شتێک لەگەڵی هاوبەش بێ، تەنهایی ئەزموونی هاوبەشیان فراوانتر دەکات، تاڵی تەنهاییش

پانتاییەکی بەرینی ڕۆحی سەروەری داگیر کردبوو.

دیسانەوە گوتی، "

بەڵێ من لە خەوندام، تۆشم هێناوەتە ناو خەونە پڕئازارەکەی خۆمەوە."

نیان هیچی نەگوت، ئەو بەردەوام بوو، "

تۆشم بەهەڵە هێناوەتە ناو خەونی خۆمەوە، دنیای تۆ دنیایەکی ئاڵ و پەمبەیە، دنیای تۆ دنیای پێکەنین و جوانییە، دنیای تۆ دڵخۆشی و گۆرانی گوتنە، ببورە هەڵەی منە..."

چاوەکانی نیان تەڕ بوون، "

ئەوەتا تۆشم ڕاکێشاوەتە ناو دنیای تاڵیی خۆمەوە، ببورە من گوناهبارم، من ویستم و ئەو ژیانە ڕەنگاوڕەنگەی تۆ، ئاسوودەییم بۆ بگێڕێتەوە، ژیانمت پڕ کرد لە ڕەنگ و لە ئارامی و لە پێکەنین و بەختیارت کردم، بۆ یەکەم جار بە عەشقی تۆوە هەستم بە پشکوتنی گوڵەکان کرد، بۆ یەکەم جار بە عەشقی تۆوە نەسیمی بەیانی خۆی لە دەموچاوم دا... ببورە من هەڵە بووم، چەندم خۆشی و بەختەوەریی لە تۆ دزی، ئەوەندەم تاڵی کردە ناو ژیانتەوە، خەمباریم بە ژیانتەوە وەر کرد، با خیانەتی من لێرە کۆتایی بێ، با خیانەتی عەشق و فیداکاریم لێرە کۆتایی بێ، تۆ ئازادیت، لە ئێستاوە لە عەزابی من ئازادیت، پێویست نییە لەگەڵ کەسێک بیت، با فریشتەش بێت، ئەوەنەی سەد ئەهریمەن نەفرەتت بەسەردا دەبارێنێ. تۆ ئازادیت، سوپاس، هەزار درووود بۆ ئەو ڕۆژە شیرینانەی تێکەڵ ژیانی تاڵیی منت کردن."

سەروەر دەیزانی چ ژەهرێک دەڕێژێتە ناو دڵی نیان، ئەو دەیزانی قەڵای بەختەوەریی نیان چۆن تێکوپێک دەشکێنێ.

ئەو دەیزانی سەربازەکانی بەرگری ناخی یەکەیەکە چەک بکات. کچ ئاوایە دەیەوێ کوڕ ئەوەندە نەرم بێت، قاچی لەناو لیتەی دڵیدا ون بێت، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە تەنها تووڕەبوونێک ئەو نەرمییە دەکاتە چیمەنتۆ، بۆ هەتاهەتایە لاقی لەناویدا ڕەق دەکاتە و ناتوانێ هەنگاوێک دوور بکەوێتەوە.

نیان پرسیی، "

دیارە تۆ دەتەوێ لە خۆشەویستی من ئازاد بیی، بۆچی من کردوومیە کۆیلە؟"

سەروەر شێت و شەیدای ئەو پرسیارە بوو، ئەو پرسیارە سادە و خۆش و بەلەزەتە.

"بۆمن، خۆشەویستیی تۆ شتێک نییە لێی ئازاد بم، وەک چاو و دڵ، وەک خوێن و ئازار لەناومدایە، بەشێک نییە لە من، تا لێم جیا ببێتەوە، پێستێک نییە، بەسەر خۆمدا هەڵکێشابێت تا بتوانم دای بکەنم، خۆشەویستیی تۆ هەموو گیانمە، موولوولە و ئێسقان و ئۆکسجین و بینینمە. چەند دوور بکەویتەوە، چەند ون بیت و بەنەفرەتم بکەی، بە هەمان ورە و هێزەوە بۆم دەگەڕێتەوە و بەر سینگم دەکەوێت، من شێتوهاری نەفرەت و دووری و خۆشەویستیی تۆم. چەند بەنەفرەتم بکەی خۆشەویستی تۆ سەد ئەوەندە لە دڵمدا گەشە دەکات. کە دووری نزیکی، کە نزیکی زۆر نزیکیت، ئیدی من گەیشتوومە هەوایەک هیچ بــایەک لەنگەرم تێک نادا.

ئەوەش ڕاستە تۆ نا، تۆ ناتەوێ، تۆ ئارەزووی ئەوە ناکەی بەلام من، بەلام من لە دڵەوە، بە هەموو کیانمەوە دەمەوێ

دیلی تۆ بم، من دیلێکی خۆبەخشم. نامەوێ هەرگیزاوهەرگیز لە دیلیەتی تۆ ئازاد بم، خۆ ئەو دیلیەتییە شتێک نییە بتوانم وازی لێ بهێنم، دیلیەتی وەک خۆراک هاتۆتە ناو خوێنمەوە، دیلیەتی وەک دەنکەزەنگیانە هاتۆتە ناو خوێنم و بەسەر تەواوی خانەکانی لەشمدا دابەش بووە، ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر و گەورەتر بووە. من ژیانی بێدەربەستی و بەرەڵاییم زۆر تاقی کردۆتەوە، ژیانی بێبەیانیم زۆر بەسەر بردووە، ڕۆژانی تاڵی بێخۆرم زۆر بەسەر بردووە، پەشیمانم لە هەموو ئەو ڕۆژانەی ئازاد بووم، بەختەوەرم کە کۆیلەم، بەختەوەرم کە کۆیلەیەکی ملکەچ و دەستەمۆم.

تەنها مەبەستم ئەوەیە تۆ پێت لەناو ئەو چڵکاوەی ژیانی من دەر بێنە، خۆت لە لیتاوی بۆگەنی تەمەنی من ڕزگار بکە. تۆ وەک من نیت، نەفرەتی و بوغزێنراو نیت، تۆ شیرین و پەسندکراوی، سوپاسگوزاری هەموو ئەو چرکانەم داتن بە من، ئەوانە ئەو دیارییە هەرەشیرین و بەنرخانەن کە لە ژیانمدا وەرم گرتوون، کە نەشتوانم پێیانەوە بژیم، شادمانم کە پێیانەوە دەمرم. فڕێم بدە و ژیانت لە من ڕزگار بکە و لە ناخی خۆتدا دەرم بهێنە هەرگیز بیر لەوە مەکەوە خۆشەویستێک، عاشقێک چاوەکانت جێ دەهێڵی، هەر وا بزانە مشکێکی تۆپیو لە باخەڵت دەر دێنی، بۆ ئەوەی لە بۆگەنی ڕزگارت بێت دوور فڕێی دەدەی، بەڵام ئەو مشکە بەختەوەرترە لە تەواوی مشکانی دنیا، چونکە هەم ماوەیەک لەناو دڵت نا، لە باخەڵتدا بووە، دواتریش دەستی تۆی بەر کەوتووە."

نیان لە دڵەوە دەیویست ئەو کوڕە ڕەشە شیرینە مشکە

لەباوەش بکات، تا قیامەت لێو لەو لێوە سپیهەڵگەڕاوانەی نەکاتەوە. دەیویست دەستی بگرێت و بە سیحرێک بە جادوویەک هەردووکیان بکاتە دوو پەپوولەی سپی و ڕەش، سپییەکە بە خاڵخاڵی ڕەشەوە، ڕەشەکەش بە خاڵخاڵی سپییەوە، بفڕنە ناو هەوا، لەسەر گوڵەکان بنیشنەوە، باڵ لە باڵی یەکتر بخشێنن، هەتاو لەسەر باڵیان بدرەوشێتەوە، کە ئەو قسەیەی بە سەروەر گوتبا، ئەو دەیگوت، "

جا خۆ پەپوولە تەنها سێ ڕۆژ دەژی."

"سێ ڕۆژیش زۆرە، سێ ڕۆژ بوونە پەپوولە و فڕین بەناو هەتاودا سێ سەدە مرۆڤبوونە. سێ ڕۆژ بە خاڵی ڕەش و سپییەوە، سێ ڕۆژ ژیان لەسەر هەڵاڵە، سێ ڕۆژ فڕین دوور لە چاوی نەفرەت، سێ سەدەی تەواوە، جگە لەوەش ژیانی گەندە و هیچ، ژیانی زبڵ و خاشاک، دووروودرێژە، ژیانی چەپەڵی و سووکی بەردەوامە، ژیانی عەشق و پاکی، ژیانی ئازادی و فڕین، کورتە، کورت نا، چونکە ژیان بە درێژی ماوەکەی نییە، درێژی ژیان بە پانییەکەیەوە بەندە، بە جۆرەکەی."

ڕۆژێک سەروەر گوتبووی،

"ژیان جگەرەکێشان نییە بۆ سەد ساڵ، ژیان خواردنەوەی هەزاران پێک عەرەق نییە. قسە و ژاوەژاوی بێبڕانەوەی ڕۆژانە نییە، ژیان نۆشینی پێکێک ژەهرە بەدیار چاوی جەللادەکەتەوە، بەدیار عەشقەکەتەوە، بەدیار چاوی خۆشەویستەکەتەوە."

نیان لەو قسەیە ترسابوو، ترسابوو، زراوی چووبوو، چونکە پێشتر لەسەر قسەکانی سەردار ڕاهاتبوو، تۆ بڵێی

قوتابیی ئەو بوو، " ژیان پێکەنینی منداڵێکی سێمانگانەیە، پشکوتنی گوڵێکە لە سپێدەدا."

گوتبووی، "ژیان ماچێکی بەپەلەی ڕاڕەوێکی چۆڵە."

ئاسانتری کردبۆوە، گوتبووی،

"ژیان دیتنی لامەمکێکی دۆستەکەتە لە کاتی نانخواردنندا، بازنەی دووکەڵی سەر لێوی یارە."

بەترسەوەش گوتبووی، "بۆنی جگەری سەر لێوی تۆیە."

نیان توند کتێبەکانی بە شانیدا کێشابوو، ئەویش گوتبووی،

"ژیان پێداکێشانی کتێبی هاوڕێ کچەکەتە بەشانتدا."

سەروەر بۆ ئەوەی یەکلا بێتەوە، گوتی، "ببوورە باسی مشکی تۆپیوم کرد، تۆ خەیاڵت ئاسوودە بێ، دڵت ئارام بێ، من دەتوانم، بەرگە دەگرم، ناتوانم چیدی تاڵیی ژیانی خۆم لەگەڵ تۆ بەش بکەم."

نیان هەموو هێزی خۆی کۆ کردبۆوە، گوتی، "من بڕیارم داوە، بڕیارێک کە باوەڕم پێیەتی، ئیدی گرینگ نییە کێ دڵخۆش دەکات و کێ دڵناخۆش، بڕیارێک ڕاست لە ناخی دڵمەوە. منیش ژیانم هەنگوین نەبوو، منیش دەردەسەریم دیتووە، جارێ تەنها لەو بەغدایە هێندەی سەدەیەک ژەهریان کردۆتە دڵمەوە، دەترسم ئەو بەغدایە لەناوم بەرێ. ئیدی گوێ لە کەس ناگرم، لە تۆش، تەنها قسەی دڵی خۆم نەبێ، تۆ مشکی تۆپیو نیت، تۆ زەلکاو و پۆخڵی نیت، تۆ ژەهر و شێرپەنجە نیت، ئەوانەی وا دەڵێن، نە تۆ دەناسن نە ژەهر، نە تۆ دەناسن نە شێرپەنجە، تۆ هێزی دڵی منی، کوا تۆ تاڵیت کردۆتە ژیانی منەوە! کوا تۆ خەمباریت بە شادی مندا کردووە! کوا تۆ تاریکیت خستۆتە سەر ڕووناکیی من!

تۆ تەنها دڵخۆشی و بەختەوەری بووی، فڕین و شادی بوویت. مردم ئەوەندەی بۆ خەڵک بژیم، مردم ئەوەندەی ئاگاداری شەرەفی خێزانەکەم بم، ئیدی با براکانم بۆخۆیان سەربەرزیی خۆیان ڕاگرن، با باوکم بۆ خۆی ئاگای لە شەرەف و کەرامەتی خۆی بێ، من ماندوو بووم، من دەمەوێ بۆخۆیشم هەناسەیەک بدەم لەوەتەی هەم هەناسەم بۆ ئەوان داوە."

سەروەر لە ناخەوە سەوز بۆوە، هەموو ئەو کانییانەی لە ناخیدا، ڕۆژبەڕۆژ ئازار و خەم بەسەریاندا کشابوو، هەموو ئەو کانییانەی ڕۆژبەڕۆژ لە ناخیدا وشکیان کردبوو کەوتنەوە قوڵپەقوڵپ، تەنها سەروەر خۆی، بەس خۆی دەیزانی کانییەکانی ناخی ئەو هەموویان سازگار نین، هەموویان شیرین نین. لەگەڵ ئەوەشدا بزمارێک لەبن زمانی مابوو، ڕاستە ئاسوودە ببوو بەو بڕیارەی نیان، بەو هەستە پاڵەوانانەی، بەو خۆشەویستییە بێکۆتاییە، بەڵام مابوو ئەو بزمارە مابوو، بۆیە گوتی، "

نا، من نامەوێ تۆ خێزانەکەت بەنەفرەت بکەی، تۆوی کچ یان خوشک لەسەر بەرەدەستی براکانی دەڕوێن، دەستیان بنووقێنن ژیانی کۆتایی دێت، تۆوی کچ لە خۆشەویستیی بابیدا گەشە دەکات، سۆزی دایکی ئاوی دەدات، تۆ نابێت پشت لەوان بکەی لەبەر خاتری من."

نیان دوودڵ بوو ئەو کوڕە هەولێرییە، هەم شیرین و هەم ڕەش، هەم تاعوونە چیی دەوێت، "من ڕوو لە خێزانەکەم نانێم، ئەوان ڕازی نابن ئێمە پێکەوە بین، من گەورەم و بڕیاری خۆم دەدەم، ئەوە مافی خۆمە تەنها ئەوەم دەوێت."

سەروەر گوتی، "کەواتە هەر بەنهێنی، لە بەینی خۆماندا هەموو شتێک تەواو دەکەین، با کەس نەزانێ، تەنها وەرەقەیەکی سادە، بەڵگەنامەی پێکەوەبوونمان، دێنین و نیشانی ئەو سەرۆک بەش و چایچییە عەرەبەی دەدەین، کە ئێمە بە یاسا پێکەوەین."

نەیوێرا بڵێ ئێمە ژن و مێردین، بەڵام لە نەبەرەو دەنگیدا گوتبووی.

ژیانی خۆیان خستە سێبەرەوە، بەنهێنی دەچوونە دەر، بەنهێنی دەستیان کرد بە شت کڕین، کراسی تازە و پێڵاو و قات، بۆینباغ و بۆیە و عەتر و شامپۆ، هەموو شتێکیان بەنهێنی دەکڕی. هەموو شتێکیان دەشاردەوە، تەنها بانگی دڵ، هاوار و زرمەی دڵ، گۆڕانی پێست و هاتوچۆی خوێن، بریقەی لێو و چاو ئەوانە ناشاردرێنەوە. هەمووان زانییان ئەو دوو پەڕەسێلکەیە، ڕۆژبەڕۆژ بە دەنووک قوڕ دەکێشنەوە، بە دیواری دنیایەوەی دەنێن، تا بیگرێت و هێلانەکەیان دروست بێت، ڕۆژبەڕۆژ هێلانەکەیان چینێک زیاد دەکات، ڕۆژبەڕۆژ پووش بە دەنووکەوە دەفڕن، چیلکە دەکێشنەوە. هەموو شتێک دەشاردرێتەوە، زیندانی دەکرێ زرمەی دڵی عاشق نەبێ، زرمەی دڵی عاشق هەوا دەیبا، ماڵ بە ماڵ و دێ بە دێ و کوچەبەکوچە دەیبا، شەقام بە شەقام و پۆل بە پۆل دەیبا، زرمەی دڵی عاشق کە دەیشارێتەوە جا هاوار دەکات. ئەو هاوارە لە ئاداب دەنگی دایەوە، ئەو کوڕ و کچە سنووریان بەزاندووە، تازە تەواو بەڕەڵڵابوون.

هەموویان کۆک بوون لەسەر ئەوەی تەنها سەردار، تەنها سەردار دەتوانێ سنووریان بۆ دانێ، دەتوانێ کێشەکەیان

بۆ چارەسەر بکات. دەتوانێ دڵی هەمووان وەک یەک ڕازی بکات، دەتوانێ ئەو نیانە سادە و ساویلکە و پەشمەکە لە دەمی ئەو دێوە بێنێتە دەرێ. هەمووان وایان گوت. کەس نەیگوت، ئەو سەروەرە، ئەو پێستە ڕەشە بە بنە پێی نیانەوە نووساوە و ئەویش بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشێ.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، نامە ئاگرەکە، نامە پڕ ئەتک و حەیاچوونەکە گەیشتە دەست کەمالی بەزاز، نامەکەی خوێندەوە، جارێک و جارێکی دیکەش، هەموو ئەوەی سەروەر و نیان بەنهێنی کردبوویان، ئاشکراکانیش، بریقەی چاو و زرمەی دڵیش، هەموو ئەو بۆن و شامپۆ و بۆیانەی بەنهێنی کڕیبوویان هاتە بەرچاوی کەمالی حەریر و ئاوریشم.

پادشای بەزازەکان هەموو شتێکی دیت، هیی ڕابردوو و هیی بەیانییش، بەغدا و سلێمانی، لە بەرچاوی شار ئاگری گرتبوو، دوای نیان کەوتوون، ئەویش بەپێخاوسی بەناو شەقامەکانی شاردا ڕادەکات، لە بەرچاوی هەموو منداڵە چلوورەفرۆشەکان، بۆیاغچییەکانی بەردەرکی سەرا، شاگردە چەورەکان، چایچی و منداڵە ورتکەی بەر سینەما ڕەشید دوای کەوتوون، دوای کەوتوون و هۆپەی بۆ لێ دەدەن، دوای کەوتوون هۆیهای بۆ دەکێشن.

کەمالی بەزاز بەبێ ئەوەی دوکانەکەی دابخات، قەیسەری قەیسەری هات، لای بازاڕی عەسری، دەهاتە لای سەرا، بەلای چاخانەی شەعبدا تێدەپەڕی، خزمێکی لەوێ لە بەردەم چایخانەکە وەستابوو، پێچی کردەوەو گەڕایەوە، بەو بەردا شۆڕ بۆوە، خۆ ئەو خزمەی بزانێ، خۆ ئەو نووسەرانەی ئەو چایخانەیە بزانن، بە جارێک دەیانکەنە سینەما، شیعر

نـا، چامـەی بـۆ دەنووسـن. بـە کۆلانەکـەی بەرامبـەر سـینەما دڵشـادا ڕۆیشـت، خـۆی لـە دەلالْخانەکـە لادا، چـووەوە لای حەوزەوشـکەکە، بـەرەو دوکانەکـەی خـۆی گەڕایـەوە. هێشـتا کاغەزەکـەی لـە بەرباخەڵدا بـوو، دیسـان خوێندیـەوە،

"تۆ مـن ناناسـی، ناشـمەوێ بمناسـی... لـە بابەتێک ئاگادارت دەکەمـەوە، نامـەوێ ببیە پیاوێکـی کوردی خـاوەن غیـرەت..."

لـە دڵـەوە گوتـی "مـن خـاوەن غیـرەت نیـم..." کـە ئـەو ڕسـتەیەی دەخوێنـدەوە، "کچەکـەت لـە بەغـدا خەریکـی شـووکردنە..." دەیویسـت دنیـا، هەمـوو دنیـا، بکاتـە کیسـەیەک خوێن و بیداتـە بەرشـەق و بـە ئاسـمانیدا بپژێنێ و ڕوخسـاری جیهـان سـوور بـکات، هێشـتا دڵـی ئۆقـرە ناگـرێ. کچەکـەت خەریکی شـووکردنە. بـە هەمـوو هێزی مسـتێکی بـە مێزەکـەی بەردەمیـدا کێشـا، شووشـە ئەسـتوورەکەی سـەری لـەت بـوو، دڵۆپـە خوێنیـک لـە دەسـتیەوە کەوتـە سـەر ڕوخسـاری مەلیکـە چکۆل کـە بـە پشـتی دینارێکـی کۆنـەوە بوو، یـەک دوو دوکانـداری هاوسـێی سـەرەتاتکێیەکیان کـرد، ئـەو وەک هیـچ نەبووبـێ ڕووی وەر گێـڕا.

ئێسـتا ئەوانـە بزانـن، ئـەو هاوسـێ دوکانانـەم بزانـن لـە ڕوخسـاریاندا غەمبـار دەبـن و لـە دڵیانـدا دەهۆڵـی شـادی دەکوتـن. یەکەیەکـە بەسـەر هەمـوو گونـد و شـارۆچەکەکاندا دەگەڕێـن، بـۆ لای وشکەفرۆشـەکان بـۆ لای سـەوزە و میـوە فرۆشـەکان، دەچنـە لای یەکەیەکـەی بەرگـدرووەکان، دوکانـی هـەر بەرگدروویـەک لـە بـارەگای ڕۆژنامەیـەک خراپتـرە بـۆ بڵاوبوونـەوەی دیعایـە، بـۆ لای ترشـیات فـرۆش و شـیرینی فـرۆش و کەبابچییـەکان، ئـەو هاوسـێ دوکانانـە لـە ڕواڵـەت

بۆ خەمخۆری و لەڕاستیدا بۆ حەیا بردن بەتەواوی شاردا دەگەڕێن، بەوسەردا دەگەڕێنەوە لای دوکانەکەی عارفە لچە و لەوێشەوە بۆ لای کەوباز و کۆترباز و کەڵەشێرباز و جا عەلافەکانی ژێرپردەکە.

یەکەیەکە بەسەر هەمووواندا دەگەڕێن و سلێمانی لە قاو دەدەن،

"کچەکەی کەمالی بەزاز ڕەدوو کەوتووە."

"کچەکەی کەمالی بەزاز لە پشت پێنج براوە خزاوەتە باوەشی هەولێرییەک."

دەیکەنە قاو، دەیکەنە ناووناتۆرە، کتێبخانەکان دەگەڕێن، قوتابخانە و مامۆستاکانی شار تێدەگەیەنن،

"کچەکەی بەڵقیس کە خۆی بە شاژنی دنیا دەزانێ، کچی شاژنی بەزازەکانی شار ئیدی نایەتەوە بۆ خۆی لەبەغدا قەپاتە."

کەمال ئەو هەموو خەڵکەی دەدی، یەک بە یەک بە چرپەوە قسەیەک دەکەن، لەژێرەوەش سەیری کەمال دەکەن، کەس نەیدەکوشت حاجی عەزیزی دووشەو نەبێت، بۆ دەرمان بەدوای شتێکی وادا دەگەڕێ، ڕێبواری خوێڕی کەمالیات سەقفی ناوەوەی دوکانەکەیان بەسەردا ڕووخا، خۆی و ژن خوشکەکەی لەوێوە بەڕووتی لە باوەشی یەکتردا کەوتنە خوارێ، لە باوەشی یەکتردا کەوتنە بەر چاوی خەڵک. سمایلی عەتار کە بەردەمی دوکانەکەی بە کارتۆن و وێنە بەتەواوی داپۆشیبوو تا کەس نەیبینێ کە کوڕە هەرزەکارەکانی بەسەر خۆیدا دەکێشا. هەموو ئەوانە لە بۆسەدا بوون، هەواڵێکی ئاوا ببیستن و ناوی کەمال بخەنە گرووپی خۆیانەوە. ئەو

کاتە کەمال زانیی خەڵکی ئەو شارە کارێکیان نییە جگە لەوەی نامووسی یەکتر بدەنە بەرچەقۆ.

بەبێ ئەوەی سەیری کەس بکات دوکانەکەی داخست، ویستی تاکسییەک بگرێت، زانیی بەرگەی دانیشتن ناگرێ، بەپێ بەرەو ماڵ سەر کەوت، نەیزانی دەبێ چی بکات. یەکەم کەس ئەم هەواڵە بە کێ بڵێ؟ یەکەم کەس کێ بداتە بەر نەشتەری خیانەتی کچەکەی؟ بە کوڕەکانی بڵێ؟ دەیدی چۆن دڵیان دەکەوێتە بن پێیان، جاری پێشوو تەنها قسەیەک بوو، قسەیەک کە کچەکەیان لەگەڵ کوڕێک دۆستایەتیی هەیە، دواتر کچەکە گوتی، "هاوڕێی پۆلمە و لە قسەتان دەر ناچم." نیان بە تەلەفۆن گوتی، "ئەو کوڕە بۆ خۆی وا دەڵێ، هاتووە و گوتوویەتی لە براکانت داوات دەکەم، من گوتوومە هەموو شتێک بەدەست ئەوانە، ئەوان سەروەر و سەردارمن." بەوەش تەواو دڵیان ئاوی نەخواردبۆوە، بەڵام ئارامیش ببونەوە، کە ئەو ژنە هەر پێست و ئێسقانەش دەهات، داوای دەکرد، کچی هەموو خەڵکیش داوا دەکرێ، نیان قسەی تێدا نەکردووە.

ئەو کاتە کوڕەکان دنیایان بەسەردا ڕووخا، مۆن و ڕەش و تاریک بوون. کوڕی ئەو کوردە وایە لەگەڵ دڵداری خۆیدا دەگەشێتەوە و لە دڵداری خوشکەکەیدا وشک دەبێت. دایک و باوکەکانیش بەسەر لێوەوە و بەبزەوە باسی عەشقبازی و دەستبازی کوڕەکانیان دەکەن، بە لەرز و حەیاچوونەوە لە کچەکانیان دەدوێن. کەمال و بەڵقیسیش هەر وایان کردبوو، کوڕەکانیان حەزیان لە کچی خەڵک کردبوو، زۆر جار بەدزییەوە هێنابووشیاننەوە ماڵێ، نە دنیا ڕووخابوو، نە

ڕۆژی قیامەت هەستابوو، تەنها کەمال جارجارێک گوتبووی، "بەڵقیس با کوڕەکان نەزانن من زانیوومە." جاری واش بووە چوون و کچە دڵسووتاوەکەیان بۆ کوڕە ئافاتەکەی خۆیان داوا کردووە، هەندێ جاریش بەتەوسەوە ئەوەشیان تێگەیاندبوون، کە ئەوە کچەکەتانە واز ناهێنێ و دوای کوڕەکەمان کەوتووە.

ئەو جارە وا نەبوو، لە دڵداری کچەکەیدا وا ئاسان بیری نەکردەووە، ئەو جارە کەمال کە لە تووی مەلیک بەرەو ماڵ سەر کەوت، بۆ یەکەم جار حەزی کرد، ئەزمەڕ گلۆر بێتەوە و تەواوی شار پان بکاتەوە، تەواوی شار بە خانوو و خەڵکەکەیەوە تەخت بکات. ئەوەش تاکە ڕێگا بوو دڵی کەمال ئاوی پێ بخواتەوە. بەڵام خۆ تا ئەمڕۆ ئەزمەڕ بە قسەی کەسی نەکردووە تا گوێ لە کەمال بگرێ.

سەرکەوتن بە تووی مەلیکدا هەرگیز ئەوەندە ماندووی نەکردووە، چاوی کەوتە سەر خەڵکێکی زۆر، لەوناوە کۆ ببونەوە، دەنگی هۆڕن و هاوار، دوو پیکابی ڕەشی سەربازی لە بەردەم سجن وەستابوون، زیندانێک وەک وەناق کەوتۆتە ناوەندی ئەو شەقامە سەربەرزەوە، خەڵکێکی زۆر سەیری ئەو چەند زیندانییەیان دەکرد، کە بە کەلەپچە بە شیشی پشتی پیکابەکەوە بەسترابووەنە، خەڵکی ئەو شارە لە هەموو شوێنێ زیاتر لەناو زیندانییەکاندا بەدوای ئازیزە ونبووەکانیاندا دەگەڕێن. کەمالیش سەیری پشتی پیکابەکەی کرد، چی؟ چی دەبینێ؟ زیندانییەکەی سەرپەڕیان سەیری ئەو دەکات. دەیەوێ دەستی بۆ ڕاوەشێنی، بەسەر ئیشارەتی بۆ دەکات. ئەوە بانگی دەکات، "

باوکە مەترسە هیچم لەسەر نییە، بەڕێکەوت گیراوم."

لەو کاتەدا دەرگا گەورەکەی سجن کرایەوە و پیکابەکە چووە ناو زیندانەکەوە، دەرگاکەیان داخستەوە، کەمال هەر ئەوەندەی پێگوترا، "

ئەوە مەحموود لەسەر چی گیراوە؟"

# ١١

کەماڵی بەزاز گەیشتەوە ماڵێ، دەرگاکەیان کرابۆوە، شۆڕەبییەکە کە شوێنی پەردەشی گرتبۆوە، هێشتا دەلەرییەوە وەک ئەوەی هەواڵی ئەوە بدات تازە کەسێک چۆتە ژوورێ. دەیزانی بەڵقیس سەفەری کردووە و دەبێ گەڕابێتەوە، ترسا کەسێک، هاوسێیەک چووبێتە لای، حەزی کرد کەسی بێگانەیان لە ماڵ نەبێ، نەک بێگانە، نەیدەویست خزم و کەس و هاوڕێ جگە لە خۆیان هیچ کەسی دیکەی لێ بێت. هەر کە چووە ژوورەوە، لە بەرهەیوانەکە، کەسێک لەسەر کورسییە نایلۆنە سوورەکە دانیشتبوو، دڵی بەشی ئەوەی پێوە نەمابوو جارێکی تریش بتاسێ، ویستی بگەڕێتەوە و جارێکی دیکە سەر بەو ماڵەدا نەکاتەوە، بەڕای ئەو، "ئیدی لە ماڵی من شۆڕاوە."

شەقێکی توندی لە ڕیحانەکانی لای دەستە ڕاستی هەڵدا، ڕیحانە بە شەقیش هەر بۆن دەپژێنێ، بۆنێکی توند بە سەروچاویدا بڵاو بۆوە، ئەگەر ئەو کاتە نەبا دەیگوت،

"من دایکم نەمردووە، بەڵکو خۆی لەناو ڕیحانەدا شاردۆتەوە."

دەشێ بیشیگوتبا،

"تەنها بۆنی ڕیحانە منالّم دەکاتەوە، منالّێک گەورەترین سامانی بۆنی سینگی دایکی بێت."

لە دەنگی پێی کەمال بەڵقیس لە بەر بەلوعەکەی حەوشە هەستا، هێشتا دەموچاوی ئاوی لێ دەچۆڕا، کەمال بۆ یەکەم جار دیتی پشتی بەڵقیس تۆزێک کووڕ بۆتەوە، پێشتر سەرنجی ئەوەی نەداوە،

"هەولێر بە یەک شەو چی لێ کرد،" یان، "منال چۆن چەمانوویەتیەوە."

ئەو ئێستا تەنها ئەوەندەی دەویست سەیری لای چەپ، سەیری بەرهەیوانەکە نەکات و ئەو ژنەی لەسەر کورسیەکە دانیشتووە نەبینێتەوە. بەڵقیسیش بە دیتنی دەموچاوی کەمال شڵەژا، چ کۆستێک سەری لە مێردەکەی داوە، ئەو ویستبووی بەتەنها بەرگەی ئەو خەمە بگرێ، کەمال پرسیی، "مەحموود بەدوای تۆدا هاتبوو، تۆی نەدۆزییەوە؟ نەت دیتووە؟"

بەڵقیس بەتیلەی چاو سەیری ژنەکەی سەر کورسییە نایلۆنە سوورەکەی کرد، گوتی، "با منی دۆزییەوە، تۆ بەدوا منتدا ناردبوو؟ دوێنێ هاتەوە؟"

"دوێنێ هاتەوە؟ نەگەیشتۆتەوە؟"

"ئا، دوێنی هاتەوە، من و دایکی (نەیویست بڵێ) سەروەر تۆزێکە گەیشتووینەتەوە."

کەمال بۆ لای دایکی نازانم کێ ئاوڕی نەدایەوە. چووە ژوورەکەی نزیک باخچەکە، بەڵقیس زانیی دەیەوێ

بەدوایدا بچێ. مریەمە ڕەش وەک سیپاڵێکی کونکون بەسەر کورسییە نایلۆنەکەدا هەڵخرابوو، نەک دانیشتبوو. هەر بەڵقیس گەیشتە لای کەمال، ویستی بەهێواشی بدوێ، کەمال بەوپەڕی تووڕەییەوە، پرسیی، "ئەو ئیزرائیلە چییە بۆ منت هێناوەتەوانێ؟"

بەڵقیس هێواشتر، گوتی، "دوو قسە بۆ تۆ دەکات؟"

"من قسەی ئەوم ناوێ، تۆش چوویتە سەر عەقڵی ئەو، من نامەوێ، ڕاوەستە بزانە چۆن شارەکەیان، شێخەکەیان، قەلایەکەیان پێوە دەسووتێنم."

وردەوردە دەنگی بەرزتر دەبۆوە، سیپاڵە کونکونەکەی سەر کورسییە نایلۆنەکە جوولایەوە، بۆخۆی نا، خوێنی تاساوی تەکانی دا، بەڵقیس گوتی، "

تۆ خراپ تێگەیشتووی، تۆ خراپ لەو ژنە بەستەزمانە حاڵی بووی، لە مەسەلەکە خراپ تێگەیشتووی."

"من خراپ تێگەیشتووم، خانم؟ نەخێر من لەوسەری یەمەوانێ، تەنها من ئەزانم ئەوانە چۆن جەرگی منیان سووتاندووە، کچەکەمیان کردۆتە جێی تانەوتەشەری خەڵک، جێی گاڵتە و قەشمەری شار، ئەوان نازانن شەرەف مانای چییە، نازانن کەرامەت چییە، تۆ چیت هێناوەتەوە، چ شێرپەنجەیەکت هێناوەتە سەر دڵی من، هەی بەدبەخت! تۆش بەڵقیس لەوەتەی هەی خەریکی وێرانکردنی منیت، لەوەتەی هەی دڵی من بنکۆڵ دەکەی. نەفرەت لەو ڕۆژەی تۆشم تێدا ناسی، نەفرەت لەو ڕۆژەی تێیدا لەدایک بووم، خودا تاوانم چییە ئەو هەموو عەزابە بۆ من نازڵ دەکەی؟"

دڵی ژن، کەس دڵی ژن وەک من ناناسێت، دەڕەنجێ،

برینـدار دەبێـت، دەپوێـت، هەڵدەوەرێـت، بـە هەمـوو قسـەیەکی توند و توورەیـی و بەڵێنـی درۆ، بـەڵام کـە نەفـرەت لـە خۆشەویسـتییەکەی، لـە ئەڤیـن و دڵدارییەکـەی دەکـرێ، بـا دوای سـەد سـاڵ لـە مردنیشـی بێـت، کـە نەفـرەت لـە هەسـت و سـۆزی دەکـرێ، دەشـکێت، بێدەنـگ دەشـکێت و دەڕووخێـت و دەتوێتـەوە. ئاخـر دڵـی ژن جگـە لـە خۆشەویسـتیی پیـاو هیـچ شـتێک نییـە بـە پێـوەی ڕاگـرێ. بەڵقیسـیش ژنـە، ژنێـک خۆشەویسـتیی ناسـیوە، نەیتوانـی بەپێـوە بێـت، بەسـەریەکدا دارما، تەرمێکی دیت، لە کەمال جیا دەبۆوە، تەرمێکی بۆگـەن هەمـوو تـووی مەلیکـی گرتبـۆوە، ئـەو دەیزانـی ئـەوە تەرمـی خۆشەویسـتییە، کـە مـرد کـەس بەرگـەی بۆگەنەکـەی ناگـرێ، تەرمـی خۆشەویسـتی کاتـی نـاوێ تـا بۆگـەن بـکات، مـردن و بۆگەنکردنـی یەکێکـە، بۆگەنەکەشـی دەماربەدەمـار دەڕوات. لـە ناچاریشـدا گوتـی، "

بە ئارەزووی خۆت نەفرەت لە مردوو بکە، بەڵام نەفرەت لە منداڵەکان مەکە، ئەو ژنەش قسـەیەکی دیکەی پێیە بۆت."

"دەزانم چ قسـەیەکی پێیە بۆم، ئەوەتا مەحموودیان بەگرت داوە."

بەڵقیس هەستایەوە پێ، پرسیی، "

مەحموودیان بەگرت داوە؟ خودایە مەرگ..."

سـیپاڵە کونکونەکـەی دەرێ، مریەمـە ڕەش، ویسـتی بـەرەو ژوورەکـەی ئـەوان بـڕوات و بڵـێ،

" بـۆ ئێمـە دەتوانیـن مێرووسـتانێک بەگـرت بدەیـن، ئـەی پاشـای وێرانکـردن."

کەمال دیسان دڵڕەقانەتر گوتی، "

بەڵێ، ئێستا لای سجن تێئەپەڕیم، بە چاوی خۆم بینیم، لەپشتی پیکابێکدا کەلەپچەیان کردبوو، بانگی کردم، ئاخر من بەرگەی چەند عەزاب بگرم؟"

دەنگەدەنگێک لە دەرەوە پەیدا بوو، "ئەو ژنە کێیە؟" بەڵقیس خێرا چووە دەرێ و گوتی، "

ئەوە کوڕەکان هاتنەوە."

عەبدولکەریم و قودسی و مستەفا لە حەوشە بوون، نەیاندەزانی کە ئەو ژنە ڕەشپۆشەی سەر کورسییە نایلۆنەکە دۆستە، یان دوژمن. میوانە یان بەڵای خوا. مریەمە ڕەش لە شوێنی خۆی هەستا، ویستی زەردەی بێتی، بەڵام خۆ زەردەخەنەش بۆ دەروونێکی هەژار هەر وا هەرزان نییە. نرخی زەردەخەنەش بۆ ئەوانەی نیانە زۆر گرانە. بەڵقیس گەیشتبووە لایان، پرسیی، "

ئەوەچی بەسەر مەحموودا هاتووە، بۆچی گیراوە؟"

ئەوان نەیانزانی دایکیان چۆن بیستوویەتی، نەیاندەویست لەناکاو پێی بڵێن، تا کەمالی باوکیان لە ژوورەکە هاتە دەرێ و گوتی، "

من دیتم لە موسەلەحەی ئەمنەکاندا، ئەیانبرد بۆ سجن."

قودسی گوتی، "

من دوێنێ زانیم. مامە نەجمی حەسەنی شووشە پێی گوتم. بەڵام گوتی دەنگ مەکە بۆ خۆم خەریکی بەردانی دەبم."

کەمال پرسیی، "

"نەجم نەیگوت بۆچی گیراوە؟"

قودسی گوتی، "

با، لە سەیتەرەکەی چەمچەماڵ گیراوە، ئەڵێن دەمانچەی پێ بووە، مامە نەجم گوتی بە سیاسی وەریان نەگرتووە، چەکدارێکی برادەری مامە نەجم دەمانچەکەی کردووە بە هیی خۆی. گوتوویەتی یەک عەشیرەتین، غەدریان لێ کردووین ویستوومانە حەقی خۆمان بکەینەوە، کێشەکەیان بۆ کردۆتە کۆمەڵایەتی. ئەو ئەڵێ ئاسانە، لە خەمی مەبن، دوو شەوی لێ نابێ."

کەمال لە وەختێکدا بە لاچاوێک سەیری مریەمی دەکرد، پرسیی، "

بۆ بەعس کێشەی کۆمەڵایەتی ئەزانێ؟"

سەیرێکی تری مریەمی کرد و گوتی، "

ئەو دەمانچەی بۆ پێ بووە، بزانە کێ زانیوویەتی و هەواڵی لێ داوە!"

مەگەر گرتنی کوڕ لەلایەن بەعسەوە، بۆ ژن ئەوەندەی لێستاندنەوەی خۆشەویستی سەخت بێ.

مستەفا گوتی، "

من دیتم، شوفێری ئەو تاکسییەم دیت کە لە هەولێرەوە پێی هاتبۆوە، تۆش ئەناسێت، کاوەی عەبدوڵا لەنگەر، هەر ئەو شوفێرەش، هەر ئەویش دایکمی بردبووە هەولێر، برادەری کاکە مەحموودمە. ئەو پێی گوتم گیراوە، هەر بۆخۆشی بردمی بۆ چەمچەماڵ، کە من چووم ئینزباتەکان هەر لەوێ لە ژوورێکیان کردبوو، بە هۆی شوفێرەکەوە چووم و دیتم، ئینزیباتەکان دیبوویان شڵەژاوە، گەڕابوون و دەمانچەکەیان پێ گرتبوو."

بەڵقیس هەستی کرد لەناو تۆڕێکی سیخوڕیدایە، ئەوە

چۆن مەحمـوود چاودێری کـردووە، هـەر ئـەو شـوفێرەش هێناویەتیـە ماڵـی ئـەو مریەمـە لـە سـەیداوا، ترسـا، ترسـا متمانـەی بـە کوڕەکانیشـی لەدەسـت دا.

مسـتەفا کـوڕە سـەرەڕۆ و نازدارەکـەی بەلقیس سـەیریکی دایکـی کـرد و ڕوانییـە ژنـەی میوانیـان، گوتـی، "

کاکـە مەحمـوودم تاسـاوە، تاسـاوە نیـان بـۆ وای کـردووە؟ کاکـەم ئەیـوت نیـان سـولتان موزەفـەری بـۆ دۆزیومەتـەوە، کوڕی ڕۆستەمی زاڵ سـەرنجی ڕاکێشاوە؟ ئەیوت لـەو هەمـوو هەولێـرە نەجیـب و بەڕێـزە، لـەو هەمـوو بـەگ و پادشـایەی ئـەوێ، گرگڕ بـە ماڵـی سـواڵکەرێکەوە نووسـاوە. ماڵێکی قەرەج، وێـران و بێکـەس و هەتیوچـە. داخـی ئەوەیەتـی، کـە نیـان سـەری ئێمـەی بـۆ چ دەعبایـەک شـۆڕ کـردووە!"

بەلقیـس هەوڵـی دا لـە کوڕەکـەی بگەیەنـێ، کـە ئـەو ژنـە غەریبـە بەسـتەزمانە دایکـی ئـەو کـوڕە نەگبەتەیـە، بـۆ ئـەوەی زیاتـر لەسـەری نـەڕوات. بـەڵام عەبدولکەریـم گوتـی، "

قسـە مەکـەن، مـن پیلانـی خـۆم دانـاوە، وا بزانن هیـچ نەبووە، هەرچـی بـە تەلەفۆن گوتـی پێی بڵێن باشـە، پێی بڵێن وەرنـەوە ئێرە، لێرە زەماوەندتـان بـۆ ڕێـک ئەخەیـن، لێـرە هەمـوو شـار بانـگ ئەکەیـن، دڵـی خـۆش بکـەن، ئێـوەش سیاسـەتان هەبێـت، بـا بێتـەوە، شـەرت بێت، ئەبێ بیدەم بـە ماسـییەکانی دوکان. بۆ هەمـوو بێرەوشـتێک تەمێیـان بکـەم، ئـەو کـوڕەش بـۆ مـن دانێـن، بڵێن وەرە ئێمـە گـەورە بوویـن بـەو حەیابردنـەت، بـەس بزانـن مـن چیـی لـێ ئەکـەم، پێش ئـەوەی لەتلەتـی بکـەم ئەبێ هەمـوو هەتیوبازەکانـی بـەر سینەما ڕەشـید سـواری بن. "

نامووسـی کـچ لـە دەرپێی داکیدایـە، بەلقیس ئـەوەی دەزانـی،

بەڵام چی لە کوڕەکانی بکات، کە بۆنی شیری دایکیان لەبیر چۆتەوە، ڕووی لە کوڕەکان کرد و گوتی، "

حورمەتی ماڵەکەم بە هەموو دنیا ناگۆڕمەوە، ئەو ژنە (ناچار بوو جوان چاو بگێڕێ تا مریەمە ڕەش ببینێ، ئەوەندە بچووک ببۆوە) من ئەو ژنەم لە هەولێرەوە لەگەڵ خۆم هێناوە، تا هەڵەکە ڕاست بکاتەوە، تا بەرچاومان ڕوون بکاتەوە، تا پێمان بڵێ ئەوەی وتوویانە هەمووی درۆیە، ئەو ئامۆژگاری کردوون، ئەو لە ئێمە باشتر نامووسمانی پاراستووە، وەک ئەوە نییە ئێوە ئەیڵێن، ئەویش کچی هەیە و بە تەنگ نامووسی خەڵکەوەیە، هەڵەیەک هەیە، وا نییە وەک ئێوە تێی گەیشتوون."

کەمال تا ئەو کاتە نەیدەویست هەموو شتێک ئاشکرا بکات، نیازی بوو بابەتەکە بەهێمنی لە کوڕەکانی بگەیەنێ و نامەکەیان بەنهێنی نیشان بدا و بەرنامەی تایبەت دابنێ، بۆیە گوتی، "

هیچ هەڵەیەک ڕاست ناکرێتەوە، تۆ باسی چی دەکەی؟ هەڵە تێگەیشتنی چی؟"

بەڵقیس خێرا گوتی، "

هەڵە نا، هیچ هەڵەیەک نەکراوە، ئەوە ئێوە بەهەڵە لە بابەتەکە گەیشتوون، بزانە ژنە چی پێ وتوون، ئەو ئامۆژگاری کردوون، لە خراپە دووری خستوونەتەوە (ڕووی لە مریەمە ڕەش کرد) خۆت قسەیان بۆ بکە، خۆت دڵنیایان بکەوە."

کوڕەکان وەک ئەوەی تا ئێستا ئەویان نەدیبێ، وەک بۆقێکی ڕەشیان دیبێ، بۆقێک ژەهری کردبێتە هەناسەیانەوە،

بۆقـە چاوڕەشـە زلەکانـی هێڵـی ئیسـتیوا، ئـاوا بـۆ مریەمیـان ڕوانـی، "ئـەو دەعبایـە لێـرە چ دەکات." لـە وەختێکـدا مریـەم هەوڵی دەدا بەشی زۆری ڕوخساری خۆی دابپۆشێ، گوتی، "
پێـم گـوت وەرە جەرگـی مـن پارچەپارچـە بکـە و دڵـی ئـەو ماڵـە مەشـکێنە."

ئەوەندەی دەکرێ بێزیان لە دەنگی بۆوە.

"مـن گوتـم تـۆ دەبێ بخوێنـی، بـۆ خوێنـدن چوویـە بەغـدا، دەرسـودەورەکەت تـەواو بکـە، شـەرەف گرانـە، ئـەو ماڵـەش کەرامەتیـان هەیـە، پێـم گـوت مـن چوومـە لای بابـی، کارەکە وایە دەبێ بابەتەکـە دابخـەی، ئیدی جارێکـی دی باسـی نەکەیـەوە."

مسـتەفا کـە هێشـتا یەقـی دەهاتـەوە، بەنیگەرانیـەوە پرسـیی، "بەقسـەی کـردی، بەڵێنـی دا واز لـە شـەرەفی خەڵـک بهێنێت؟"

"بێگومـان، دەبێ دەسـتی هەڵگرتبێ، ئەویش خوشـکی هەیـە، کەسـوکاری هەیـە، بەقسـەی مـن دەکات، دەزانـێ جگـە لـە بەڵێنـی ئـەو مـن پشـتم بـە کـەس قاییـم نییـە. خـۆ بابـی نەمـاوە، بەقسـەم دەکات، تـا ئەمـڕۆ لـە قسـەم دەر نەچـووە، زۆری لـەو قسـانەی دەکرێـن ڕاسـت نیـن، خەڵـک بوختـان هەڵدەبەسـتن، مـن دڵنیـام ئـەو کیـژەی ئەنگـۆ لـە پەپوولـە پاقژتـرە. ویسـتی دەمـی بابـی تاقی بکاتـەوە نەبوو..."

ئـەو قسـانەی ئـەو پووشـکە بـوون، کـە بەڵقیـس لـە دەریـای ڕەشـی نائومێدی حەیاچووندا دەسـتی پێوە گرتبوون. خەریکە ئـەو پووشـکە ڕزگاری و هەناسـەی بۆ دەگێڕێتـەوە.

مستەفا ڕووی لە مریەمە ڕەش کرد و گوتی، "
کەواتـە تـۆ ئـاگات لـە هەمـوو شـتێکی ئەوانـە، تۆ مامۆسـتایان بـووی، ئـەو کچـەی ئێمـە بـۆ دەبێ دەنگـی بگاتـە لای تـۆ

(سەیری دایکی کرد) با بە دڵی تۆ بێت، تۆ نامووسی ئێمە بپارێزی، کە دەستم پێی گەیشت ئەو کاتە نیشانت دەدەم، ئەو کاتە پێت دەڵێم کە کەسێک پێ لە دڵی بەزازەکان بنێ چیی بەسەر دێت."

مریەم گریانی لەبیر چووبۆوە بەشی شەش کۆست فرمێسکی ڕشتبوو، هەڕەشەی ئەو کوڕە درێژ و قسەڕەقە وەک کوچکە بەرد بەر ئەژنۆی کەوت.

کوڕەکان سەیری باوکیان دەکرد، وەک هیچ نەبیستێ، داغڵەدڵ و لەشداگەڕاو، بەڵقیسیش باوەڕی کردبوو ئەوە کۆتاییی تۆفانەکەیە. مریەم گوتی، "

ئەوانیش هەڵەیان کردووە، پەشیمانن، ئێوەش ناحەقییان بەرامبەر مەکەن، من هەموو شتێکم پێ گوتبوو (دەستی بۆ کەمال ڕاکێشا) هەموو شتێکم بۆ باس کردبوو، سەد جار بەسەر پێڵاوەکانیدا کەوتم، من ژنم و هیچم لەدەست نایەت، ئێوە بە گەورەییی خۆتان کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکەن، ئەو مندارانە مەخەنە بەر تانەوپلاری کەس، چاوەڕێی بەزەییی ئێوەن."

کوڕەکان ملیان بۆ لای باوکیان سووڕاند، وەک ئەوەی بپرسن، "ئەو ژنەت دیوە؟" وەک ئەوەی بپرسن، "هاتووە بۆ لای تۆ؟ ئەو قسانەی بۆ باس کردووی؟" باسی کردبوو، هەمووی باس کردبوو لەو کاتانەی پەلاماری پێڵاوەکانی دابوو، لەو کاتانەی پێیەکانی ماچ کردبوو، بەڵام ئەو، کەمالی بەزاز لە بەرزییەوە گوێی لە قسەکانی ببوو هەرگیز دانەهاتبۆوە. وەک منارەیەک گوێ لە هەژارەکانی بەرپێی بگرێت.

کەمال سەیری ژنە ڕەشەکەی کرد، سەیری بەڵقیسیشی کرد، ئاوڕی بۆ لای کوڕەکانی دایەوە، بەرەو ڕووی کوڕەکانی گوتی، "

باوەڕی پێ مەکەن، هەرچی دەیڵێ درۆیە، منیش هەرگیز گوێم بۆ نەگرتووە، تازە کارلەکار ترازاوە."

مریەمە ڕەش چاوەڕێی ئەو قسەیەی نەدەکرد، ئاخر ئەوە کەمال نییە ئەوەندە ئارام بگرێ، بەڵقیس دەیزانی کەمال لەخۆیەوە قسە ناکات، ببووەوە پووشکە و لافاو ڕای دەماڵی، لەسەر ئەرزەکە دانیشت و گوتی، "

خودایە پەنام بۆ تۆ هێناوە."

کەمال وەک بەردێک بێت و تەقیبێتەوە، وەک بورکانێک بێت و بە نووکە شەقێک توێژاڵەکەی سەری لا چووبێ، گوتی، "

تۆش هەموو شتێک ئەزانی، درۆ تا کوێ ئەڕوا؟ ئەو کەسەی لەسەر پردی درۆ هەڵخلیسکێ هەرگیز هەڵناستێتەوانێ، خانم بەدرۆ ئەو کچەت لەخشتە بردووە، ئەو کچەتان هەڵخەڵەتاندووە، جادوو و نوشتەت لێ کردووە، هەی ناکەسبەچە، ئەوەتا نامەی حەیاچوونەکەمان، بەڵقیس سەرە ژنەکەی شار، بەڵقیس دایکی میهرەبان، شاژنی مەڵکەنی، تازە ئەبێ لەو شارە بار بکەین، ڕووی خۆمان ڕەش بکەین و بڕۆین، تازە ئەبێ سەرشۆڕی هەموو کەس بین، من دان بەوەدا ئەنێم دۆڕاندم، من شەرەف و ناموسم دۆڕاند، هەموو ئەوەم دۆڕاند کە چەند ساڵە کۆم کردبۆوە، پەڵەی ڕەشی خێزانەکەم کەمالی بەزازە، هەموو ئەوەشم دۆڕاند، کە مامە غالی بە خوێنی خۆی دروستی کردبوو،

سەربەرزیمان مرد، هەموو ئەوەی شانازیم پێوە ئەکرد شەرەف و کەرامەت لەدەستم چوو، ئیدی خەڵکی ئەم شارە وەک بەرازیش تەماشام ناکەن. هەموو برینێک چاک ئەبێتەوە تەنها برینی نامووس نەبێ."

نامەکەی دەر هێنا، کورەکان نامەکەیان لێ وەر گرت، یەکەیەکە خوێندیانەوە، چاویان داخست و سەریان ئەوەندەی کێویک قورس بوو، ئامادەی ڕەشبوونەوە بوون. برای کورد بە شووکردنی ئاسایی خوشکی بەشێک لە پیاوەتی خۆی لە دەست دەدات، جا نەک بە ڕەدووکەوتنی. وەک ئەو سوارانەی لە بیابان دەڕۆن و لە دوورەوە گوللەباران دەکرێن، زۆربەی گوللەکان بەر ئەسپەکان دەکەون و سوارەکان دەگلێن و سوارەکان هەڵدەستنەوە، هیی کوڕەکانی کەمالی بەزاز وا نەبوو، گوللەکان ڕاست لە کەللەسەری سوارەکانی دا و کەوتن، لەگەڵ دەنگی تەقەکە کوڕەکان ناڵەیان هات و بەر بوونەوە، بەسەر ڕژانی خوێن و بەزینی خۆیاندا کەوتن. ئەسپەکان نەگلان و ڕۆیشتن، ئەسپەکان پیاوەتییان بوو، ئەسپەکان لە شێوەی کوڕێکی نەناس و هەتیوچە بە ناوی سەروەرەوە، سەروەری مریەمە ڕەشی هەولێری، تێیان تەقاند و لە تەپوتۆزی بیابانی بەغدادا ون بوون.

بەڵقیسیش نامەکەی خوێندەوە، کە گەیشتە ئەو شوێنەی، "کچەکەت خەریکی شووکردنە،" سەیری مریەمی کرد، "ئەوە ئامۆژگاریەکەت بوو، یان وتووتە من سەرقاڵیان ئەکەم، پێت وتوون بەدرۆ سەرقاڵیان ئەکەم، تۆش خەریکی کاری خۆت بە، بە کوڕەکەت وتووە تۆ کچەکەیانت لەخشتە بردوە منیش خەریکی هەڵخەڵەتاندنی ئەوان ئەبم، من بە دایکایەتی باوەڕم

پێ کردی، دایکایەتی کە درۆ نازانێ."

لافاوی فرمێسکی تا بن گوڵەکان ڕۆیشتن، گوڵەکان ڕەنگیان دەگۆڕا و سیس دەبوون، بەخۆی گوت "ئافەرین بەڵقیس قەلەڕەشێک فێڵت لێ بکات."

مریەم بە داوەوە ببوو، هەرگیز خەیاڵی بۆ نامەیەکی ئاوا نەدەچوو، کێ ئەو نامە نەفرەتییەی نووسیوە؟ ئەو دەیزانی لاقی خزیوە، دەشیزانی دەستی ئەو خێزانەشی لەگەڵ خۆی ڕاکێشاوە، یەکسەر بیری چووە سەر ئەو کوڕەی لە وێنەکەدا لەگەڵیانە، ئاخر کورد کە بوونە سێ یەکێکیان خیانەتکارە. ئەو نەیدەزانی ئەو کوڕە ناوی سەردارە، نەیدەزانی زیندانی کراوە و ئەشکەنجەش دراوە، نەیدەزانی ئاوەکەی مەحموودی مێردی ڕشتی ئەویشی لەگەڵ خۆی بردووە، ئەوەشی نەدەزانی کە چەند یارمەتی داون، کە چەند بەتەنگ کوڕەکەیەوە بووە، تەنها ئەوەی دەزانی کە نیگای بێدەربەست و فێڵبازی ئەو کوڕە هەموو شتێکی لەدەست دێ.

کەمال کوڕەکانی بردە دیوەخانەکە، بەڵقیسیش چوو، مریەم وەک قەلەبەڵەکێک بە داوەوە بووبێ تەنها دەستی دەجووڵا، ئەوان قسەیان زۆر کرد، هەوا لە درزی دەرگاکەوە بەشی مریەمیشی دەهێنا.

"من ئەوە نازانم، ئەچم بۆ بەغدا، لە بەر چاوی هەموو قوتابیتە خوێڕیەکانی زانکۆ ئەیانتۆپێنم، تا کەسیان جارێکی دیکە بیر لە هەڵەی وا نەکاتەوە."

"لاشەی ئەو هەتیوە خوێڕییە لە بیابان فڕێ دەدەم، تا مار و دووپشک بیخۆن و بۆنی نەیەتەوە ناو شار."

"ئەویش ئەهێنمەوە لێرە، لە بەر سەرا، لە بەرچاوی هەموو بەزازەکان، لەتلەتی ئەکەم، تا تەواوی خەڵکی بزانن شەرەفی کەمالی بەزاز لەکەدار ناکرێ. ئەوەی ببێتە لەکە بۆ سەر شەرەفمان با جەرگی خۆشمان بێت، لێی ئەکەینەوە."

دەنگی قودسی هات، "نا بە قسەی من ئەکەن پیرۆزباییی لێ بکەن، با دایکم تەلەفۆنیان بۆ بکات و دڵخۆشیان باتەوە، با بڵێ تازە بووە، هیچ نییە هێشتا کوڕ و کچی خۆمانن، با دایکم پێیان بڵێ هەموویانم ڕازی کردووە، لێتان خۆش بوون، با بڵێ باوکیشت دڵی باش بووە، بیرت ئەکات. دایکە پێیان بڵێ خۆ سەردەمی بەرد نییە، کچ ئەبێت بە دڵی خۆی شوو بکات. با بێنەوە دوو دەست جلی ئاوریشمی سپییان بۆ دەکەم، ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕم و لەناوەندی بازاڕ گوللەبارانیان ئەکەم."

زۆریان قسەکرد، تەکبیری کوشتن و لەناوبردن، کە هاتنە دەرێ، دنیا تەواوتەواو تاریک ببوو، مریەمیان لەبیر چووبۆوە، نەیانزانی ئەو ژنە ڕەشە شەوە بردوویەتی یان لەناو باخچەکە تواوەتەوە.

# ١٢

هەموو شتێک لە دڵی نیان و سەروەردا دەتوایەوە، بەردی ڕەشی گرانێت، ئاسنی هەزار ساڵ ژەنگگرتوو، بەردی پاشماوەی نەیزەک، قسەوقەسەلۆک، هەڕەشە و کوشتنی براکانی، فرمێسک و دڵشکانی دایکیان، هەموو شتێک وەک یەک و یەکنەوا دەتوایەوە، ئیدی ئەوە بەس دڵی ئەوان لەسەر نەوای عەشق بوو. هەر چی هەیە لە دڵی پڕ ئەڤین و گەرم و چۆلەکەئاسای ئەواندا دەچووەوە سەر سروشتی خۆی، دڵۆپ دڵۆپ دەبووەوە بە ئاو. کوورەی توانەوەی غەم و زبڵی دنیا، دڵی عاشقانە. بریسکەیەک لە ڕوخساری عاشقدایە، کە لەدڵی دای دنیا دەکەوێتە سەر ئاوازی بـــا، سەر پێکەنینی ڕەنگ. سەروەر بە نیانی گوت، "بۆنی هەموو دنیات بۆ دەکەمە دیاری، بەڵام توخوا لە خۆتیان مەدە، من بۆنی پێستی تۆم پێ خۆشە، بۆنی تۆ بۆنی بەرەبەیانی دنیایە، گەورەترین دیاری بمدەیەی کراسێکی کۆنی خۆتە، ژێرکراسێکی کونکون و دڕاوتە (نەیوێرا بڵێ ستیانێ یان

دەرپێیەک دە ڕۆژ لەسەریەک لەپێت کردبێ و نەتشوشتبێ)."

سەروەر پرسیی، "دانیشتووانی دنیا چەند کەسە؟"

نیان گوتی، "شەش ملیار..."

"من ئەو شەش ملیارە دەبەخشم بە چاپچییەکەی ئاداب، بە سەرۆکی بەشی فارسی، بە مریەمی داکم، بە سەرجەم بەزازەکانی سلێمانی، هەر شەش ملیارەکە بۆ ئەوان بێت، تەنها ئەوەندەم دەوێت دەست لە تۆ هەڵبگرن، تەنها تۆ، لەو شەش ملیارە کەسیانم ناوێ، تەنها تۆم دەوێ، خۆزگە بەس تەنها تۆم ناسیبا و ئاشنایەکی دیکەم لەو سەرزەمینە نەبا."

نیان گوتی، "وا بزانە بەس من هەم، تەواو، من یەک جار دەژیم، یەک جار و بەس ئەو جارەش بەقوربانی کەس ناکەم."

بەئاشکرا دەستی یەکتریان گرت، ئەو ڕۆژە نیان کراسێکی زەرد زەردی گوڵەبەڕۆژەیی لە بەردا بوو، گوڵێکی زەردی لە قژی دابوو، پێڵاوی سپی فلاتی لەپێ بوو، بەختەوەریشی وەک وردەشەکرلەمە بە دەنگیەوە کردبوو، سەروەر دەستی گرت، بەلای کۆلیژی ئەندازیاریدا شۆڕ بوونەوە، حەزیان لێ بوو شەقامەکان سەد ئەوەندە درێژ بان، ئومێدە کۆنەکەی سەروەر لەوەتەی ناوی سوق بەناتی بیستووە، حەسرەتی ئەوەی هەبووە جارێک لەگەڵ کچێکدا بەو بازاڕەدا تێپەڕێ، نەک کچێک ئەوەتا لەگەڵ نیان بەو شەقامەدا دەڕوات، سەروەر شیعرەکەی شێرکۆ بێکەسی خوێندبۆوە، بەڵام ئاسەوارێک لە وشەکانی لەو شەقامەدا نەمابوو. قاتێکی ڕەشی بۆ خۆی کڕی، بۆینباغێکی سوور، کراسێکی سپی، دەستەیەک دەرپێ و فانیلە. بۆ نیان عەزیە و تەنوورە و

قەمیس و پێڵاو، قەمیسێکی شیفۆنی فش، دەرپێ و ستیان و ژێرکراسی سوور، سێتی خەو، بۆن و بۆیەی نینۆک و دوو دەستە میکیاجی خەلیجی و ئەسیتۆن و سپیاوی بەغدادی. هەستیان دەکرد دەفتەر و لیڤێکس و کتێبیان لێ دەکەوێ و ئاوڕیان بۆ نادەنەوە، ژیانی ئەوان ئێستا ژیانی دوو عاشقی شێت و دێوانەیە کوا فریای وانە و تاقیکردنەوە و کتێب و نووسین دەکەوتن. ئەوەی فریای عەشق بکەوێ، هەرگیز فریای کتێب و وانە ناکەوێ.

هەر ئەو ڕۆژە چوونە بازاڕی زێڕنگەرەکان، بە بەردەم جامخانە پڕزێڕەکاندا سووڕانەوە، سەیری زێڕە درەوشاوە و قورسەکانیان کرد، ژن و پیاوێک بۆ یادی لەدایکبوونی کچەکەیان گوارەیەکی بچووکیان دەکڕی، کوڕێک بەنهێنی دڵێکی زێڕی دەکڕی وەک ئەوەی خەریکی دزی بێت، ڕەوە ژنێکی عەرەبی دەشتەکی، بە ژنە شێخ دەچوون، کچێکی ترساو و منداڵیان دوای خۆ دابوو، ملوانەکەی خەلیجی و زنجیری ئەستوور و پشتێنی پانیان هەڵدەبژارد. نیان لە چاویدا دەیخوێندەوە ئەو کچە دڵی لە شوێنێکی دیکەیە، کچ وەک کوڕ نییە، هەر کامە و دڵی تایبەتی خۆی هەبێ، کچان دڵیان یەکە، یەک مۆدێل دڵیان هەیە، بە نیگایەکی چاو قووڵاییی یەکتر دەخوێننەوە.

کچ و کوڕێکی کامڵیش کە دیار بوو لە خۆشەویستیدا زۆریان چاوەڕێ کردبوو، تا بگەنە یەکتر، وەک ئەوان دڵیان بەسەر هیچ شتێکەوە نەدەگیرسایەوە. ئەوانیش، سەروەر و نیانیش بەسەر جامخانەیەکەوە نیشتنەوە، دوو ئاڵقەی باریک و تەنک، کە هەر بۆ دەستی قوتابیی قاچاغ دروست

کرابوون، سەرنجی ڕاکێشان. ئەو زێڕنگەرانە پێویستیان بەوە نییە کەس حیکایەتی خۆیان بۆ بگێڕیتەوە، ئەوان شارەزان، بەبێ قسە و ورتە لە جوولانی نیگای نێوان مشتەرییەکان تێدەگەن، زێڕنگەرەکەی ئەوانیش چوونە لای، پێویست نەبوو ئەوە بگێڕێتەوە، کە ئەو دوو ئاڵقەیە ساڵ و نیوێک لەوەوبەر کوڕ و کچێکی گەنج وەک ئەوان بە عەشقێکی کز و داماوەوە نا، بۆ زەماوەندێکی ڕەزامەندانەوە هاتن و ئەو دوو ئاڵقەیەیان هەڵبژارد، بەڵام ئەوە هەفتەیەک دەبێ ژنەکە هێناونیەوە، زێڕنگەرەکەش لێی کڕیەوە، ژنەش پێویست نەبوو بڵێ مێردە گەنجەکەم دوای ئەوەی دەیبەن بۆ بەرەکانی شەڕ، لە حەسرەتی من لە شەڕەکە هەڵاتووە و لە دواوە تەقەیان لێ کردووە و وەک ترسنۆک کوشتوویانە، ئێستاش بۆ لەدایکبوونی منداڵە هەتیوەکەی پێویستە ئاڵقەکانی بفرۆشێ. ئەوانیش سەروەر و نیانیش پێویست نەبوو چیرۆکی خۆیانی بۆ بگێڕنەوە، چیرۆکی ئەوان ئاشکرا و ڕوون لە دەوریان دەهات و دەچوو.

هەر گوزەری زێڕنگەرەکان، لەو شوێنەی پێی دەڵێن دەللە، لەسەر کورسییەک لەژێر دارێک دانیشتن، دارێک لەبەر خاتری ئەوان تۆزێکی دیکە لقەکانی شۆڕ کردەوە. کابرای زێڕنگەر دوو شەربەتی خەستی مێوژی بە شەربەتفرۆشەکەی بەرامبەریاندا بۆ ناردن، جارێ قوومیان لە شەربەتەکە نەدابوو، سەروەر سەیری چاوە گەورەکانی نیانی کرد، نادییە مستەفای میسری گۆرانی سەلامات سەلاماتی دەچڕی "ژیانی دووری چ سەمەرەیەکی هەیە،" نیان تێگەیشت، سەروەر ڕەزامەندیی لە ڕوخساری نیاندا

خوێندەوە، دەستی برد و قوتووە بچووکە سوورەکەی ئاڵقەکانی کردەوە، ئاڵقەکان هێشتا گەرمیی دەستی کابرای زێڕنگەریان پێوە بوو، نیان پەنجە باریکە کرێمییەکانی درێژ کرد، ئەویش دەستی گرت، کە ئاڵقەکەی کردە پەنجەی گوێی لە چەپڵەلێدان بوو، کە سەری هەڵبڕی دیتی کابرای زێڕنگەر و یەک-دوو هاورێی بەدیاریانەوە وەستاون، نیان سوور و پەمەیی بۆوە، شەرمی کرد و دڵخۆشیش بوو، چاوی پڕ بوو لە ئاو، لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵقەکەی دیکەی هەڵگرت و کردیە پەنجە چەرمن و ڕەشەکەی سەروەرەوە، هەمووان چەپڵەیان بۆ لێ دا، کابرای شەربەتفرۆش شەربەتی نەباتی دابەش کرد، یەک-دوو شاگرد قوونیان بادا، دواتر هەموویان پێکەنین و بەتەمەنترین زێڕنگەریش، کە پیاوێکی سوبی بوو سەری نیانی ماچ کرد، ملوانکەفرۆشەکەی پشتەوەشیان ملوانەکەیەکی لە ملی نیان کرد کە دڵێکی بەردی سووری پێوە بوو، دەوریان چۆڵ کردن و خۆشی و شادی و شیرینیی شەربەتەکانیشیان لەگەڵ خۆیان برد، مەراسیمی شەکراوخواردنەکەیان بەسەر چوو، تەنها دڵێکی سووری بەرد بەسەر سینگی نیانەوە دەلەریەوە، خەمێکی قورس و پڕمردنیش لەوێ کەوتبوو، ئەوان نەدەوێران پەنجەی تێوە بدەن.

نیان هەرگیز ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتبوو، کە ئاڵقەگۆڕینەوە و شەکراوخواردنەوەکەی بەبێ بەڵقیسی دایکی و لە شەقامێک بێت، کە کەسی تێدا نەناسێ، وەک سەروەر شیعرەکەی شێرکۆشی نەخوێندبۆوە تا ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا بکات. کچ لە شووکردندا بەبێ سێبەری دایکی هەست بە وجوودی

خۆی ناکات. کە دایک پشتی لە کچەکەی کرد ئیدی هەموو هەنگاونانێکیان حەیاچوونە، هەرگیز ئەوە ڕوونادات دایکێک لە دڵەوە پشت لە کچەکەی بکات.

تەواو لەو کاتەدا بوو، کە بەڵقیس بە کراسێکی سەوزی گوڵگوڵی ئاوریشمی و کەوایەکی ئەتڵەسیی بریقەدارەوە دەر کەوت، بەلۆمەیەکی ناسکی دایکانەوە سەیرێکی نیانی کرد، کە خەریک بوو خوێن لە لێوەکانیەوە فیچقە بکات، گوتی، "لە کاتی خۆیدا گەیشتم، کچە تاقانەکەم هەرگیز جێت ناهێڵم،" چووە لای زێڕنگەرە پیرە سوبیبیەکە و شەش تاک بازنی پانی ڕەختەی بۆ هێنا و لە بەرچاوی هەمووان یەکەیەک بازنەکانی کردنە دەستی نیان و لەژێرەوە پێی گوت، "ئەگەر دڵیشم بخەیتە ژێر پێ، من لە بەرچاوی خەڵک ناتشکێنم، هەناسە و ئاهی منی." دواتر چووە لای ئەو زێڕنگەرەی ئاڵقەکانیان لای کڕیبوو، ملوانەکەیەکی وەک ملەگۆیەکەی خۆی، بەڵام ئەو خڕ نا، بەڵکو بادامی بۆ هەڵبژارد، هەر کە زێڕنگەرەکە بۆی کێشا بەڵقیس بەوپەڕی دڵخۆشی و زەوقەوە ملوانکە بادامییەکەی هێنا و کردیە ملی نیان و ئەوەندەی دەکرێ لووتی لەناو قژیدا ون کرد و قووڵ قووڵ بۆنی کرد.

لەو کاتەدا نیان بەوپەڕی هەست و گەرموگوڕییەوە باوەشێکی توندی لە سەروەر دا، لێوە ڕەشە هەڵبزڕکاوەکەی وا بەتوندی ماچ کرد و ماوەیەکی دووررودرێژ مژیی. لێوی سەروەر سپی هەڵگەڕا و خەریک بوو هەڵوەرێ. ئەوەش موعجیزەیەک بوو هەرگیز سەروەری چاوەڕێ نەبوو وا زوو ڕوو بدات. سەروەریش توند باوەشی لێ دا و هەستی کرد بەختەوەری لە گۆمەکە بچووکەکانی نیانەوە کەوتۆتە سەر

سینگی، وەک تیشکی خۆری بەغدا لە بەهاراندا هەموو گیانی دەزووڕێنێتەوە.

نەگوێی لە خرینگەی بازنی دەستی بوو، نە قورسی ملەگۆییەکەی هەست پێ کرد، نیان لە خۆی ترسا کە خەیاڵی ئەوەندە دوور دەڕوا. زانیی بەڵقیس بە باڵی تەیریش ناگاتە بەغدا، ئەگەر بشگات تووڕەیی براکانی و هەڕەشەکانی باوکی و حیرسی پیاوانەی خۆی وەک مار پێوەی دەدەن. هەموو گیانی پڕ دەکەن لە ژەهر. کە زانیی تەنها خەیاڵێکی بێسەروبەری کردووە و کەس بازنی بۆ نەکڕیوە و کەس ملوانکەی نەکردۆتە ملی، تەنها ماچە قووڵەکەی لێوە هەڵبزڕکاوەکەی سەروەر ڕاستی بوو، شەرمی کرد، لەسەر سینگی ڕەقوتەقی سەروەر ئەوەندەی دەکرێ، بە قووڵی گریا. فرمێسکی هەموو تەمەنی بەسەر سینگی سەروەر و بازاڕی زێڕنگەرەکانی بەغدا داباراند، دڵە سوورە بەردەکەی ملی ئاوی لێ دەتکا.

سەروەر لە تۆفانی ئەو هەموو فرمێسکە ڕاچەنی، بەڵام پێشی سەیر نەبوو، چونکە دەیزانی کچی کورد لە خۆشی و ناخۆشیدا فرمێسک دەڕێژێ، هیی نیانیش هەم فرمێسکی عەشق و خۆشی و هەم فرمێسکی دڵشکان و غەریبی بوو. هەستی بە نارێکی لێدانی دڵی سەروەر کرد، بەڵام هەرگیز ڕووی نەداوە کچێک بە چاوی پڕفرمێسکەوە هەستی کوڕێک بەتەواوی بخوێنێتەوە.

نیان و سەروەر هەستان، بەڵام زێڕنگەرەکە بۆ یادی ئەوان گوڵێکی سووری لەسەر کورسیەکە کێشا، هەموو ئەوانەی نیوەیان دەبێتە ئاگر و نیوەیان دەبێتە سەهۆڵ،

لەوێ دادەنیشن و پشت بەو گوڵەوە دەدەن، گوڵەکە دوو لێو بوو لێک نزیک دەبوونەوە، لە هەمان کاتدا گنجی لێوەکان پەڕەکانی گوڵەکەش بوون، دڵۆپە ئاوەکانی سەری هەم فرمێسک و هەم ئاونگ بوون. کوڕی ئەو زێڕنگەرە کە نەیزانیبوو ئەو گوڵە وەک خۆی دروست بکاتەوە، بازنەیەکی بچووکی هەشت پەلکی بە دەوردا کێشابوو، ئەو نەیدەزانی ئەو هێڵانە هێڵی لێوی سەروەر و نیانن، هەر لێوەیان چوار هێڵ، هێی نیان باریک و درێژ و بازنەیی بوون، هێی سەروەر ئەستوور و کورت و خوار بوون، ڕەنگیشیان جیاواز بوو، هەر لەو گوڵەشەوە بۆ یەکەم جار ئەو زێڕنگەرە چوار هێڵی باریکی بە ڕەنگی سوور لەباتیی لێوی نیان دانابوو، ئەو کورسییە هێشتاش ماوە، بەڵام باران و حەسرەت بۆ ئەو زێڕنگەرە کە لە شەڕدا ون بوو ڕزاندوویەتیەوە. تەنها چەند هێڵێکی نارێکی ژەنگاوی لەسەر ماوە، کە دیارە ڕۆژێک لە ڕۆژان سوور بووە.

ئەو ڕۆژە نا، بۆ بەیانییەکەی سەروەر و نیان چوونە دوکانەکەی ئەبو سەلام، ئەبو سەلامی شیوعی کە ئەبو شواربیشیان پێ دەگوت، بۆنی جگەری دوکانەکەی هەموو قەمبەرعەلی گرتبۆوە، کچێک نییە لەو ئادابە بۆنی جگەر بکات و سەرداری بیر نەکەوێتەوە، تامی جگەر بەسەر لێوەوە، دوکەڵی سپی و بازنەیی جگەرەی سۆمەری درێژ، چاو نا، بینین لەگەڵ خۆی دەبات. نیان گوتی، "با جگەرەکەی من زۆر ببرژێ."

هێی سەروەر نا، هەر دەبوو تەڕ بێت، هەر ئەوەندەی خوێنەکەی وشک بێتەوە، لە پەناوە بە ئەبو سەلامی گوت،

"کارێکی گرینگم بـە سـەرداره."

"بڵێ -حەبیب- بە کارێک ڕۆیشتووە."

سـەروەر گوتـی، مـن و (بەتیلـەی چـاو سـەیرێکی نیانـی کـرد) دەمانــەوێ بچینــە دادگا، پشــتیوانێک، یارمەتییــەک، کەســێکی دۆســتمان لەگــەڵ بێت باشــترە، بــا نەشــزانن هێنــدە بێکەســین، متمانەشـمان پـێ بکـەن."

ئەبـو سـەلام ئەوەنـدەش سـەرەڕۆ نەبـوو، سـەروەر فریـا کـەوت، "کەسـوکارمان ناتوانـن بێـن، تـۆش دەزانیـت وەزع لای ئێمـە زۆر خراپـە. برایەکانـی لـە کێشـەوە گلاون."

ئەبـو سـەلام تەماشـایەکی نیانـی کـرد، "زۆر باشـە، دەبـێ متمانەتـان پـێ بکـەن، هەردووکتـان گـەورەن، دادگا کێشـە نییـە، کـە هاتـەوە پێـی دەڵـێم، دێـت بـۆ لاتـان، بەیانـی کاتژمێـر نـۆی بەیانـی لـە دادگای ئەعزەمییـە بـن. کـە نەگونجـا کەسـمان بێـن بچۆ بۆ لای (نـاوی کەسـێکی لەسـەر پارچەکاغەزێـک نووسـی) محەمـەد سـەفوان مەحمـوود. خزممـە، دۆسـتی هەموومانـە."

نیـان گوێـی لـە نـاوی مەحمـوود بـوو، ڕاچڵەکـی، ئـەو برایـەی چەنـد قسـەڕەق و دڵنەرمـە. بـرا چەنـد دوژمنێکی بێچارەسـەری خوشـکە لـەو کاتانـەدا. خوشـک لـە کاتـی عەشـقدا جگـە لە براکەی لـە کـەس ناترسـێت. نیـان ئێسـتا جگـە لـە سـێبەری براکانـی هیـچ پیاوێـک نایترسـێنێ، براکانـی وەک سـەرەڕم و چەقـۆ هەمیشـە بـە پشـتیدا دەچـوون. نیـان لـە سـەروەری پرسـیی، "پیاوەکـەی دادگا نـاوی مەحمـوودە؟"

ئەو گوتی، "نا، ناوی محەمەدە، باپیری ناوی مەحموودە."

نیـان یەکەیەکـە نـاوی براکانـی لەوپـەڕی شـیرینیدا بـە دڵـدا هـات، مەحمـوود کـە بـە نـاوی شـێخی گـەورە کراوەتـەوە،

عەبدلکەریم باوکی بە ناوی ئەو سەرکردەیەوە کردبوو، کە گوایە کوردی کردووە بە شەریک، قودسی و مستەفا و ئازاد، برایەکی دیکەشی کە لە هەموویان بەختەوەرتر بووە، بە منالی سەری ناوەتەوە. براکانی بە ڕێز و حورمەتەوە یەکەیەکە تەوقە لەگەڵ سەروەر دەکەن، دەیخەنە شوێنی برا مردووەکەیان، کچێک بەو هەموو برایەوە پادشای خۆر و هەورەکانی ئاسمانیشە، شاژنی لەندەنە، جا شاژنی لەندەن چیی هەیە، "جریوەی چەند پاسارییەک و سێبەری چەند پەڵە هەورێک."

لەوەتەی سەروەر دەناسێ بەختەوەری دڵۆپ دڵۆپ دەڕژێتە ناو کاسەی تەمەنیەوە، هەرچەند کاسەی تەمەنی ئەو بچووکە، بەڵام نازانێ بۆچی پڕ نابێ. لەوپەڕی خۆشبەختی و عەشق و بەختیاریەدا ئەو چاوە سەوزانەی شتێک لە غەمباری و نائومێدی لە قووڵاییی خۆیاندا دەشارنەوە، کە دڵۆپێکی بەشی خنکانی تەواوی بەغدا دەکات. لە خۆی شاردۆتەوە، نەک لە سەروەر، نیان نازانێ دۆستی هەرە نزیک و دێرینی سەروەر غەمباری و نائومێدییە. نائومێدی لەوسەری دنیا بجوڵێتەوە دڵی ئەو لێرە بانگی دەکات، بانگیشی کردبوو، ئەو غەمباری و نائومێدییە جێگای هەمیشەییيان لە دڵی سەروەردا هەبوو، هەر وەک ئەو زیندانییانەی ئازادیش بن، نوێن و جێگایان لەناو زینداندا ناپێچنەوە، چونکە دەزانن پێش ئەوەی نوێنەکانیان سارد ببنەوە دەگەڕێنەوە.

لە ڕۆژی ئاودەستەکەی سینەماکەوە، لە ڕۆژی کەوتنی بەسەر کاشیە سپییەکان و گەندوگووی خۆیدا، غەمباری درزە قووڵەکانی ناخیان پڕ کردبۆوە، ئەوەی لای میوان بوو،

میوانێکی سەنگین و شیرین ئەو بەختەوەرییە بوو، کە نیان لە ڕێی هەناسەوە کردبوویە گیانیەوە، ئەو خۆشییە بە سەروەر نامۆیە، بە بەهاترین میوانی دڵی دەبێت بە نرخترینی ژیانی خۆی بۆ سەر بڕێ، ئەو ویستبووی غەمباری لەبەر پێیدا سەر بڕێ، بەڵام غەمباری، غەمباری لە دڵی سەروەردا کە نیشتیمانی ئەزەلی خۆیەتی سەر نابڕدرێ، سەریشی ببڕی نارِوات و وڵاتی خۆی جێ ناهێڵێ. سەروەر چاوپۆشی لەو میوانە بەوەفا و ڕەزاقورسە کردبوو، ئەویش حورمەتی ئەو بڕیارەی سەروەری گرتبوو، لە سووچێکی هەرە دووری دڵیدا وەک داکێکی بێکەس لە ماڵی نەوەکەیدا، وەک سەگێکی ڕەش بە دوو چاوی نیوەنوقاوەوە خۆی گرمۆڵە کردبوو، نەک سەروەر هەرکەسێکی دیکە با، حەزی دەکرد جارجار دەستێک بە تووکە نەرمەکەیدا بێنێ، کە ڕۆژبەڕۆژ درێژتر دەبوو تا بەتەواوی دایپۆشێ و ئاسەواری بشارێتەوە.

قەت نەبوو نیان لە چاوەکانی سەروەر ڕامێنێ و بڵێ،

"هەر چاوەکانت نیوەی کوڕی ئەم شارە دێنێ."

لەو کاتەدا سەروەر چاوە بریسکەدارەکانی سەگەکەی ناخی بیر نەکەوێتەوە، کەس نەیدەزانی لەناو ئەو چاوە غەمبارانەدا چ خۆشبەختییەک بۆ سەروەر خۆی مەڵاس داوە، خۆش بەختییەکانی سەروەر لە غەمبارییەکی قووڵ دان، ئەوەشی لە مریەمە ڕەش، لە ژووره نسرمەکانی قەراتێ بۆ مابۆوە.

ئەو ڕۆژەش کە ڕێگای دادگایان گرتە بەر، سەروەر ویستی شەقێک لەو سەگە تووک درێژە هەڵدا و بۆ ئەبەد لە خۆی دوور بخاتەوە، بەڵام لەبەر قروسکە و وەڕینی، کە

تەواوی مردووی گۆڕستانەکانیشی لەگەڵ خۆی هەڵدەستاند، بە مردووەکانی گۆڕستانی مەلیکانی لای پردی ئاسنینیشەوە، لەو بیرکردنەوەیە پەشیمان بۆوە.

ئەو بەیانییە هەمووان دڵخۆش بوون، تەواوی دوکان و بازاڕی ئەعزەمییە کرابوونەوە، جامخانەکان بریسکەیان دەهات، هەتا کەناس و کۆڵهەڵگرە پیرەکانیش پێدەکەنین، هەتا ژنە ڕەشپۆشەکانیش، ئەوانەی مێرد و کوڕیان لە شەڕدا لەدەست دابوو، چاوەڕێی هەواڵی ناخۆشی براکانیشیان بوون، کە هەمیشە ڕقیان لەو گەنجانە هەڵدەستا بەدەم کچێکەوە پێدەکەنین، "بۆ دەبێ کوڕ و مێردی ئێمە لە شەڕدا بکوژرێن و ئەو سەرسەریەش لە شاردا بمێنێتەوە و دەستی کچ بگرێ،" هەتا ئەو ژنە سەرتاپا بوغزانەش ئەو ڕۆژە هێمنتر، بەلام دڵتەنگتر لە هەمیشە بۆیان دەڕوانین.

لە بەردەم دادگای ئەعزەمییە سەگێکی ڕەشی تیسکن بە دوو چاوی پڕئاوەوە بۆنی پێوە کردن، نیان گوتی، "ئاهـ... سەگێکی چەند جوانە! بۆ ئاوا غەمباری، بۆچی دەگری؟"

سەروەر دانی بەخۆیدا گرت و لەباوەشی نەکرد، سەگەکەش ئەوەندە متمانەی بە ئینسان نەبوو، کە نیان ویستی دەستی لێ بدات تۆزێک کشایەوە، سەروەر گوتی، "سەگ بەوەفایی کوشتوویەتی، لەگەڵ خاوەنەکەی دەچێتە ناو ئاگریش."

لەو کاتەدا جگە لە وشەی وەفا هیچ شتێک دڵی نیانی نەدەگەشاندەوە. هەرچەندە باش لەوە حاڵی نەبوو، لەو ڕستە ئاڵۆزەی سەروەر، سەگ بەوەفایی کوشتوویەتی، سەری لەوە سووڕ ما، وەفا چۆن کوشتوویەتی، وەفا بۆ دەچێتە

ناو ئاگرەوە. نیانیش ئینسان بوو دەبوو دەستی بسووتێ تا بزانێ ئاگر گەرمە.

لە حەوشەی دادگا وەستان، چاویان گێڕا، نە سەردار، نە ئەبو سەلام کەسیان دیار نین. نیان دووبارە پرسییەوە، "کابرا ناوی مەحموودی بوو؟" سەروەر گوتی، "ئا، محەمەد سەفوان مەحموود." پۆلیسەکەی بەردەم دەرگاکە وەک لەویان پرسیبێ، دەستی بۆ سێیەم ژووری لای ڕاست ڕاکێشا، کە لەسەری نووسرابوو ، قەڵەم، خەڵکێکی ماندوو لە ڕاڕەوەکانی دادگا لە هاتووچۆدا بوون، چەند کوڕ و کچێکی قەیرە و یەک-دوو ژنی تووڕە لە بەردەرگا چاوەڕێیان دەکرد. سەروەر چووە ژوورێ لەگەڵ پیاوێکی چلوپێنج ساڵەی باریک و درێژ قسەی کرد، کابرا پشتی لە ئەو بوو، هەستابووە سەر پێ و فایلێکی قورسی بە هەردوو دەست دەخستە سەر دۆلابێک، ئاوڕی بۆ سەروەر دایەوە و تەوقەی لەگەڵدا کرد، سەروەر بە دەست بانگی نیانی کرد، نیان چووە ژوورێ، کابرا گوتی، "مادام دۆستی ئەبو سەلامن، خۆشەویستیی منیشن، ئەو ئامۆزامە."

ڕووی لە نیان کرد و پرسیی، "خزمی حەبیبیت؟"

حەبیب مەبەستی سەردار بوو، نیان سەیری سەروەری کرد، کابرا گوتی، "انتم اکراد کلکم گرایب،" ئا ئێوەی کورد هەمووتان خزمن. بایەک لە پەنجەرەکەوە هات و قژە زەرد و ئاوریشمینەکەی نیانی بەسەر دەموچاویدا بڵاو کردەوە، بایەکە چەند هەوڵی دا نەیتوانی ئەو تاڵە موونە لە سەری محەمەد سەفوان بجوڵێنێ، کە دەتگوت بە لەزگە بە تەپڵی سەرە لووسەکەیەوە چەسپاندووە، سەروەر هەر سەیری

قەڵەمەکەی محەمەد سەفوانی دەکرد، کە خێراخێرا خانەکانی فۆرمەکەی بەردەمی پڕ دەکردەوە، خۆشی لە بنە پێوە هەڵدەچوو، کە گەیشتە نووسینی ناوی خۆی و نیان لە یەک فۆرمدا بەرامبەر یەکتر و وشەی یتزوج لەنێوانیاندا بوو، خۆشی و هرووژمی خوێن گەیشتە ئاستێک، تا ئێستا دنیا ئەو هورووژم و بەرزییەیەی بە خۆیەوە نەدیوە.

دواوشەی نووسی و فایلەکەی داخستەوە، سەری بەرزکردەوە، ئەو کاتە زانییان کە چاوێکی بەتەواوی سپییە و ڕەشێنەی تێدا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەوپەڕی شیرینی گوتی، "مبرۆک،" دڵیان کەوتە سەر لێوی ئەو. پێشیان کەوت، یەک-دوو ژووری دیکەی پێ کردن، هەر یەکە و شتێکیان لەسەر فایلەکە نووسی و شتێکیشیان لای خۆیان تۆما رکرد، لە دەفتەری گەورەگەورە ناویان تۆمار کردن. هێشتا دەترسان لە سووچێک، لە ڕاڕەوێک خێوێک لە شێوەی براکانی نیان لێیان پەیدا بێ. بردنیە بەردەم دەرگایەکی ساجی گەورە، زانییان ئەوە ژووری حاکمە و هەر ئەڤینداریک ئەو قەڵەمێک بەسەر ناوەکانیاندا نەهێنێت، بۆ یەکتر شێت و شەیدا بن مافی ئەوەیان نییە فوو لە چاوی یەکتر بکەن.

محەمەد سەفوان بە خۆی و فایلەکەوە چووە ژووریّ و بە ئەوانی گوت، "چاوەڕیّ بن تا بانگتان دەکەم."

کوڕ و کچە قەیرەکەی پێشتر دیبوویانن هاتنە دەریّ، یەکێک سەری دەر هێنا و ناوی ئەوانی خوێندەوە، هەردووکیان چوونە ژووریّ و پیاوێک بە سەری زل و سمێڵێکی باریکی قەیتانی لەپشت مێزێکی پانوپۆڕ دانیشتبوو، سەیری نیانی کرد و پرسیی، "بەو پێشەکی و پاشەکییەی لەو فایلەدا

نووسراوە، تۆ ڕازیت شوو بە سەروەر مەحمود بکەی؟"

نیان سەیرێکی سەروەری کرد و وەک تەمەنی خۆی بخاتە ناو دەستی ئەو، گوتی، "بەڵێ."

هەمان پرسیاریشی لە سەروەر کرد، پەنجە مۆری لەژێر ناوی خۆیاندا پێ کردن. محەمەد سەفوان و کابرای بەردەست ئەوانیش وەک شاهید ئیمزایان کرد. جا حاکم لە هەموو لاپەڕەکان ئیمزا و مۆری خۆی لێ دا و گوتی، "پیرۆزە. ئیدی ئێوە ژن و مێردن، بە یەکتر حەڵاڵن و هەموو ژن و پیاوێکی دیکە بۆ ئێوە حەرامە."

کە فایلەکەی داخست سەیرێکی کردن، گوتی، "مادام دۆستی محمەد سەفوانن با پرسیارێکتان لێ بکەم، یەکترتان خۆش دەوێ؟"

سەروەر و نیان، کە هەرگیز چاوەڕێی پرسیارێکی ئاوا نەبوون لە حاکمێک، سەیری یەکتریان کرد و لە دڵەوە بۆ یەکتر پێکەنین. حاکمەکە وەک حاکمی ژوورەکەی خۆی نەبێت و حاکمی هەموو دنیا بێ، گوتی، "خۆشەویستیی ڕاستەقینە هێزی وێرانکردن و لەناوبردنت دەداتە دەست کەسێکی دیکە، جگە لە خۆت، بەڵام باوەڕی تەواوت هەیە کە ئەو کەسە هەرگیز ئەو هێزە بەکا رناهێنێ."

سەروەر بەگاڵتەوە پرسیی، "مافی ئەو وێرانکردنە بە یاسا تۆمار کراوە؟"

حاکمەکە سەیرێکی نیانی کرد، کە دیار بوو، تەواوی ئیرادەی خۆی دابووە دەست سەروەر، جا گوتی، "لەبیرم نییە ئەو قسەم لەکوێ خوێندۆتەوە، بەڵام لە یاسا زیاتر باوەڕم پێیەتی، ئێوەش ئەو هێزەتان داوەتە یەکتر هیوادارم

بـۆ وێرانکردنـی یەکتـر بـەکاری نەهێنـن."

چوونـەوە ژوورەکـەی محەمـەد سـەفوان، پێـی گوتـن، "ئـەو قسـەیە تەنها پەیوەندیی بـە جەنابی حاکمـەوە هەیە."

فایلەکـەی لای خـۆی گێڕایـەوە و یەکـی نوسـخەیەکی لـە گرێبەسـتی مارەبڕینەکـە دانـێ، گوتـی، "ئـەوەش گرێبەسـتی هاوسـەرگیری و نیکاحتـان هیـوادارم پێکـەوە پیـر بـن."

سوپاسـیان کـرد و چوونـە دەرێ، دڵخۆشـییەکی بێسـنوور بـەرەو بەتاڵاییەکی دەبـردن، لـە چەنـد کۆڵانـی ئەولاتـری دادگا، ژن و پیاوێکـی بەتەمـەن، وەک دوو قـازی پیـر بـە هـەردوو لادا دەلەنگیـن، ناسـک و خاوێـن، زەمبیلەیەکیـان بـە دەسـتەوە بـوو، کـە لـە لقوپۆپـی دارخورمـا دروسـت کرابـوو، وردەوردە دەڕۆیشـتن، وەک ئـەوەی گەیشـتبن و ئیـدی هیـچ شـوێنیک نەمابـێ بـۆی بچـن. ژنەکـە تەنوورەیەکـی سـپی و کراسـێکی شینی کاڵی لە بەردا بوو، لە بەردەم دەرگایـەک زەمبیلەکەیان دانـا، دیـار بـوو مانـدوو بـوون، دانەنیشـتن، دەسـتی یەکتریـان گـرت، ژنەکـە دەسـتی بـە لەپـی دەسـتی پیاوەکـەدا دەهێنا، دیـار بـوو پەتـی زەمبیلەکـە شـوێنی خـۆی لـێ کردۆتـەوە، ئیـدی ئەوە کۆتاییی ژیانی دوو عاشقی ئەوپـەڕی بەختـەوەرە، نیـان سـەیری سـەروەری کـرد، ئەویـش ڕووی لـە ژن و پیاوەکـە کـرد، "دەتوانـم یارمەتیتـان بـدەم."

پیاوەکـە ئـاوڕی دایـەوە و ژنەکـەش گوتـی، "فیـدات بـم، زۆرمـان نەمـاوە."

پیاوەکـەش وەک سـیحرباز بێـت گوتـی، "ئێـوەش تـازە دەسـتتان پـێ کـردووە."

سـەیری کاغەزەکـەی دەسـتی سـەروەری کـرد، دیسـانەوە

گوتی، "ئەو بەڵێننامەیەی دەستتان گرینگیەکی زۆری نییە، گرینگ بەڵێننامەکەی ناو دڵتانە."

ژنەکە گوتی، "گوێی مەدەنێ، ئەو هەموو کاغەزێک دەناسێتەوە، چل ساڵی تەواو لەو دادگایە کاری کردووە، شەست ساڵیشە نامە و شیعر بۆ من دەنووسێ."

هەرچواریان پێکەنین، پیاوەکە گوتی، "ئەو ڕێگایە بەبێ خۆشەویستی تەواو نابێ، بەڵام تەنها بە خۆشەویستیش ناچێتە سەر."

ئەوان نەیانوێرا بپرسن چیی دیکەشی دەوێت، ئەو بۆخۆی گوتی، "فیداکاری، فیداکاری دەوێت."

نیان پرسیی، "فیداکاری بە چی دەوێت؟"

ژنەکە کە خەریک بوو دەست بداتەوە زەمبیلەکە گوتی، "بە تەمەن، ئەگەر خودا بیدا."

ئەوان تەمەنیان دابووە یەکتری، سەروەر وەک دوو زیندانی سزادراو بە کاری قورسی هاتنە بەرچاو، وەکو کرم زەوییان شەق کردووە، لە کونێکەوە هاتوونە سەر زەوی، بـــایەک عاشقی یەکتری کردوون، ژنە بەو بـــایە ئاوس بووە، منداڵەکانیان کەوتوونە سەر پێ، چوونە گەشت و مەلەیان کرد، لەژێر سێبەری دارخورمادا خەوتن، منداڵەکان گەورە بوون و لەشەقەی باڵیان دا، ئەوانیش خەریکن وردەوردە توێکڵی زەوی کون دەکەنەوە، دەچنەوە ناوی، لە چاونوقانێکدا سەروەر ژیانی وەک قاپێک دۆندرمە هاتە بەرچاو کە دەبێ پێش ئەوەی بتوێتەوە بیخۆی، تەنها ئەوەندە خێرا نا کە مەلاشووت بتەزێ.

ئەگەر داوایان لەو ژن و پیاوە کردبا، تەنها هەفتەیەکی

هەنگوینی، یان مانگێکی هەنگوینی لە ماڵە کۆنەکەی ئەواندا بەسەر بەرن، هەرگیز ژیانیان بەو ئاقارەدا نەدەڕۆیشت، زەمەن دەگۆڕا و دەشێ ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستیان بەو زەمبیلەش بووایە. بەڵام نا هەر لەوێوە باڵیان گرت و چوونە کۆڕنیش، ئومێدە دێرینەکەی سەروەر هاتە دی، نیان پێڵاوەکانی داکەند و خۆی هەڵکرد، تیشک لەسەر بەلەکی ڕانەدەوەستا، سەروەر شاگەشکە، ئەوەندە خێرا ئومێدەکەی هاتبووە دی، هەر پازدە ساڵێکی پێ چووبوو، خەریک بوو لە خۆشیان سەری بە تاشەبەردێکدا بدا، ئاخر هاتنەدی ئومێد لەوە زیاتر بێمانایە. نیان چووە ناو ئاوەکە و شەقی لە ئاوەکە هەڵدا، لەجیاتیی ئەوەی بە ڕووکاری شاشەی سینەماکە بکەوێ، وەک ئەوەی سوهێر ڕەمزی، بە ڕوخساری سەروەر کەوت. ئەویش کراسەکەی داکەند و هەر بە پاتنۆڵەوە چووە ناو ئاوەکە، دیجلە باوەشی بۆ چەندانی دیکە گرتۆتەوە، حیکایەتی پڕخوێنی ئەم وڵاتە لە دڵی ئەودا نووسراوەتەوە، دڵی دیجلە بە هیچ کەس ناخوێندرێتەوە، دڵی دیجلە لەکوێی دەریادایە، لای سەروەر لەو دڵۆپە ئاوانەدا بوو کە کەوتبوونە سەر سینگی نیان، هێواش دەستی گرت لە خۆی نزیک کردەوە و لەباوەشی کرد، نیان لە کاتێکدا خۆی خزاندبووە سەر سینگی، گوتی، "نا، نا، ئێستا نا."

لێویان خستە سەر لێوی یەکتر، وێنەی دەیان لێوی سوور کەوتە سەر ئاوەکە. شەپۆلە بچووکەکان بۆ دووریان دەگواستنەوە، جەستەی تەڕ و پتەو و پەیکەری یۆنانی نیان، وەک ماسی لەبن دەستی دەخزی و نەیدەزانی دەستی لەکوێ ڕاگرێ. کەمەری دەگوشێت و سینگی بە سینگی مووا وی

خۆیەوە دەنووسێنێ، بنباڵی، ناوشانی، ئا دەستی لەکوێ ڕاگرێ، ئا سەر سمتی.

هەموو کەس لەو ئاداب و بەغدایە دەیانزانی سەروەر دڵی نییە، دەنا دەبوو، کە دەستی بە سمتە خڕ و پتەو و پڕ ژیان و ئەفسوونەکانی نیانەوە دەگرێ، دڵی بتەقێ، دڵی بتەقێ و ببێتە هەزار پارچە، یان هیچ نەبێ لە قەفەزەی سینگی فرتە بکاتە دەرێ و لێ گەڕێ ئاو بیبا. بەڵام ئەو خەڵکانە گوێیان لە ژنە عاشقە بەتەمەنەکەی ئەو بەیانییە نەبوو، کە گوتی عەشق جگە لە فیداکاری تەمەنیشی دەوێت.

ئیدی سەروەر کوڕە ڕەشتاڵە و دەموچاو قوپاوەکەی سەیداوا نییە، کوا ئەو کوڕەکەی ژوورە نسرمەکانی قەڵاتە، نا، ئەو نەبوو لە ئاودەستەکانی سینەما حەمڕادا ڕشایەوە و کەوتە ناو گەندوگووی خۆی، نا ئەو نەبوو کە دنیا گەلەکۆمەکی لە دژی کردبوو، ئەو نەبوو کەوتبووە ژێر پێ، ئەو لەناو دیجلەیە، ئەو کوڕە ئازا و قۆزەکەی سەر شاشەی سینەمایە، ئەو ڕوشدی ئەبازە و حوسێن فەهمییە، ئەو دڵبەری کچانە، ئەو کوڕە ئەمریکییە سیحراوییەکەی ناو دارستانەکانی ئەمازۆنە، ئەو کوڕەی چاوی کچانی لەسەرە، ئەو کوڕەی بەلای کەمەوە ئەوەندەی مەسیحی هەڵکێشراو بۆ ئاسمان، کچ خۆیان بۆ داناوە.

ناشیرینی هەرگیز پەڵە و قوپاوی دەموچاو نییە، هەرگیز ناشیرینی کەپوودرێژی و سەرقوپاوی نییە، نا ناشیرینی بالآیەکی قالۆری نییە، تەمەنێکە بە تەنیشتیەوەیەتی، نا، ناشیرینی سەرچاوەکەی دڵە، دڵ کانگای ناشیرینی و بوغز و خەفەتە. کە دڵ گوڵی کرد و پێکەنی، کە دڵ بریسکایەوە و

شەوقی بڵاو کردەوە، ڕەنگی دنیا لە خۆڵەمێشییەوە دەگۆڕێ بۆ سپی، بۆر و تاریک و زەردوویی نامێنن و دەگۆڕێن بۆ ئاڵ و سوور و سەوز و شین، هەموو ڕەنگەکان لەسەر نەخشاندنی ژیان شەڕیان دەبێ.

تەنها دیجلە سنوورێکی هەیە بۆ خۆشەویستی، تەنها دیجلە تۆڵە لەو کەسانە دەکاتەوە ئیسراف لە خۆشییەتی و لەزەت و سمتکوشین و خۆشەویستیدا دەکەن.

پەنجەڕەش و توێشکە سپییەکانی سەروەر تەواو لە سمتە لوئلوئەکانی نیاندا نقووم ببوو، هەناسەی نیان وەک قوومە ئاو دەکەوتە سەر شان و قۆڵی سەروەر و سەر ڕووکاری ئاوەکە.

پەنجەکانی سەروەر بە خلودێک گەیشتن، هەرگیز کەس بە دیجلەشەوە ناتوانێ لێی بستێنێتەوە.

***

دوو کوڕی هەرزەکاری ماسیگر لەسەر بەلەمەکەیانەوە لەناوەندی ئاوەکە سڵاویان لێ کردن، پێش دەچوو پێشتر لەناو بەلەمە باریک و درێژەکەیان دەسپەڕیان لەبەر کردبن. ئاخر ئەو کوڕە ماسیگرە هەرزەکارانە ئەوەندە ژنە قەرەج و کچی وێڵ و دڵشکاو بە سواری بەلەمەکانیان بەناو دیجلەدا دەسوڕێننەوە، تا غەمیان بڕەوێتەوە، تا دەردەدڵی خۆیان بۆ ئاوەکە، بۆ دیجلە بکەن، جا ئەو کوڕە هەرزەکارە ماسیگرانە، هەر لەمنداڵییەوە، کە جارێ نازانن ڕەحەتبوون و ئاوهاتنەوە چییە، ئەو ژنانە سواری خۆیانیان دەکردن. ئەو کوڕە زۆڵە

ماسیگرانە تاکە مەخلوقن فێربوون لە بەرچاوی بابیان سێکس لەگەڵ ژنان بکەن.

بێگومان باوکیشیان هەر وا، وەختێک سەوڵەکان دەدەنە دەست کوڕەکانیان کە بۆخۆیان لە سووچێکی بەلەمەکەدا ئەوەندە دڕندانە گوژم لە ژنەکان دەدەن خەریکە بەلەمەکە هەڵگێڕنەوە.

ئەو دوو کوڕەی سڵاویان لە سەروەر و نیان کرد، ئامۆزای یەکترن، تەنها یەک جار ڕێکەوتی ئەوەیان کردووە بەلەمەکەیان لەو بارەدا هەڵگەڕێتەوە، ئەویش ئەو کاتە بوو کە باوکی هەردووکیان، جووتە برا ماسیگرە بەناوبانگەکەی دیجلە، ئەو دوو برایەی بەشی زۆری ئەو ماسییانەی لە ئەبو نوئاس بۆ سەرخۆشەکان سوور دەکرانەوە، ئەوان دەیانگرتن، ئەو دوو برایە ئەوەندەی لەناو ئاو بوون نیو ئەوەندە لەسەر زەوی نەبوون.

هەڵگەڕانەوەکەشیان حیکایەتی خۆی هەیە، تەواوساڵێک پێش ئەو ڕۆژەی نیان و سەروەر لەناو دیجلەدا بچنە باوەشی یەکتر، ئەو دوو برایە دوو ژنی باڵابەرز و گەڕاوە، تۆکمە وماینی، لەوانەی عەرەب پێیان دەڵێن -ئێچە-، ئەو ژنەش هەر بۆ غەمبەئاوادان لەگەڵیان سوار بوون، ئەو دوو برایە سەوڵەکانیان دایە دەست کوڕەکانیان و بۆ خۆیان لەگەڵ ژنەکان چوونە ئەوسەری بەلەمە باریک و درێژەکە، ئاخر ئەو دوو برا دڵسۆزە دەبوو شوێنەکانیان نیشان بدەن و ڕێنوێنییان بکەن، ئێرە گێژی هەڵڕشتنی غەمی دووری خۆشەویستە، ئێرە پەنداوی بەئاوادانی خیانەتە، سەرو دوو جگەرەی مەستکەریان دانێ، هیچ تریاک و ویسکی و عەرەقێک

مەستت ناکات، کە خۆت لە دڵەوە نەتەوێ، ژنەکانیش ویستیان. غەمی گەورە لەناو بەلەکەمە بەبــــا دەدرێ، خۆ ئەو دوو برا ماسیگرە زۆڵ و حەرامزادانە دوای ڕەحەتبوونی یەکەم و دووەم و سێیەم بەبێ ئەوەی دەری بێننەوە گوڕ دەبەستنەوە، ئەوەندە وەحشیانە ئەوەندە جەللادانە گوڕ دەبەستنەوە، بێگومان ژنە باڵابەرز و ماینییەکانیش لەوان توندتر و ماڵوێرانکەرتر گوڕ دەبەستنەوە، ئەو دوو کوڕە هەرزەکارە ئامۆزایانە نەیانزانی چۆن لەگەڵ تەکانی ئەو چوار درندە فاحیشانە پەڕینە ناو هەوا، لە هەواشدا ئەوان هەر سەوڵیان لێ دەدا، وەک کۆتر فڕین و وەک ماسی کەوتنەوە ناو ئاوەکە. بەلەمەکە هەڵگەڕایەوە و هەر چوار وەحشیەکانی سێکس کەوتنە ناو ڕووبارەکە، ژنەکانیان خستنە سەر پشتی خۆیان، گەیاندیاننە نزیکترین وشکانی و منداڵەکانیشیان وەک سزا بۆ ویژدانی ئاوەکە جێ هێشت.

نیان و سەروەر هیچ لەو حیکایەتانەیان نەدەزانی، ئەوەشیان نەدەزانی کە ئەو دووبرا جەللادە لە پیاوێک کەوتوونەوە، واتا باپیری ئەو دوو هەرزەکارە، کاتی خۆی ژن و پیاوێک بۆ گەشت و سەیران سواری بەلەمەکەی دەبن، ئەویش لەناوەندی ئاوەکە بەلەمەکەی وەر دەگێڕێ و ژنەکە دەخاتە سەر پشتی و پیاوەکەش بۆ ماسییە ئینسان خۆرەکانی هاوڕێی جێ دێڵێ، ئەو دوو برایە، منداڵی ئەو ژنەن، کە لەبەر خۆشەویستیی مێردەکەی نەیتوانی دیجلە جێ بهێڵێ و مێردی بە باپیرە پاڵەوانەکەیان کردەوە.

نیان و سەروەر هیچیان لەو حیکایەتانە نەدەزانی، ئەوان تەنها شێت بوون، شێت و شەیدای یەکتر، شێتی خۆشەویستی

و نیگای سیحراوی و هەناسەی بێ ئۆکسجینی یەکتر بوون. ئەوان شێت بوون، شێتی عەشق و نامەی دڵداری و شیعری تێزابی یەکتر بوون. تەنها عەشق وەک تێزاب دڵ کونکون دەکات بەبێ ئەوەی سارێژی بکات و بیدروێتەوە. تەنها عاشق هەست بە نەزیفی خوێن ناکات. هەموو کەس عاشقەکان دەناسێتەوە، هەموو دنیا عاشقەکان بە ڕەنگ زەردی دەناسێتەوە. عەشقەکان بۆیە ڕەنگیان زەردە، چونکە لە دڵی کونکونیانەوە خوێن دەچۆڕێت و شەقام و ماڵ و باخچەکان سوور دەکەن، ئەگەر خوێنی ڕژاوی عاشق نەبێ تاقە یەک گوڵی سوور لە دنیادا ناڕوێ.

کوڕە هەرزەکارەکان گەیشتنە لای نیان و سەروەر، ئەوان سواربوون، بە هەوای عەشقەوە سوار بوون، کوڕەکانیش زانییان ئەوانە عاشقن، هەریەکەیان چوونە سەرێکی بەلەمەکە و دەستیان بە سەوڵێدان کرد، ئاوەکەش دەیبردن. نیان و سەروەر لەناوەڕاستی بەلەمەکە دەست لەسەر کەمەری یەکتر وەستابوون، ئاو دڵی ڕەوان دەکردنەوە، خانووەکانی ئەوبەرەوبەری دیجلە غەمبار بۆ ئاوەکەیان دەڕوانی، کەنارەکەیان پڕ کردبوو لە زبڵ، ناوەندی ڕووبارەکە ڕوون و بێبن و خاوێن. بەژێر پردی شەهیدا تێپەڕین، ئەوان بەرەو سەر دەڕۆیشتن، ئاپارتمانە بەرزەکان دەر کەوتن، پردێکی دیکە و لە دوورەوەش پردە هەڵواسراوەکەش دەر کەوت، سەیرە لە وڵاتیکدا کە هێندەی ئاوی دیجلە خوێنی یەکتریان ڕشتووە هێشتا ئاوی ڕوون و دڵانی عاشق هەن. ئەوان دەیانویست زیاتر بەرەو سەر بڕۆن، کوڕە ماسیگرە هەرزەکارە درێژەکەیان گوتی، "ناتوانین، دەبێ کە ئەو

کۆشـکانە دەر کەوتـن بگەڕێینـەوە."

"لـەو کۆشـکانەوە حوکمـی وڵات دەکـرێ، لـە سـەردەمی هاروونـە ڕەشـیدەوە، شمشـێر و هـەوەس بەسـەر ئـەو ئـاوەدا زاڵـن، شمشـێر و تـۆپ و دەسـتی ئاسـنین و هەوەسـبازی و هەتیوبـازی ئـەو وڵاتـە بەڕێـوە دەبـەن. وڵاتێکـە سیاسـییەکانی سەرسـەری و شـاعیرەکانی هەتیوبـاز و ژنەکانـی فاڵگـرەوە." ئەوانـە قسـەی سـەرەوەر بوون، بـەڵام نەیدرکانـدن، ئـەو ناچـار نییە ئـەو باسـە بۆ کـوڕی ماسـیگر بکاتەوە، کە هەموو تەمەنیان لەگەڵ سۆزانی و ماسـی و باوک و مامی شـەهوەتبازدا بەسـەر بردوە. خـۆ دەشـێ ژیانـی ڕاسـتەقینە و سروشـتی ژیانـی ئـەو دوو کـوڕە بـێ. دادپەروەرانەتریشـە وەک چـۆن ماسـییەکان دەخـۆن کـە دەمـرن ئەوانیـش خۆیـان پێشکەشـی ماسـییەکان دەکـەن.

لـە گەڕانـەوەدا لەنـاو بەلەمەکـە دانیشـتن، دەترسـان ئەوانـەی بەسـەر پردەکانـدا دەپەڕنـەوە پێیـان بترازێـت و بکەونـە نـاو ڕووبارەکـەوە، ئـەو بەربوونەوەیـە بـۆ ئـەوان کارەسـات و بـۆ ماسـییەکان خـۆش بەختییـە.

دیسـانەوە کـوڕە درێژەکەیـان گوتـی، "هەنـدێ ماسـی هـەن حوکمـی تـەواوی ڕووبـاری دیجلـە دەکـەن، وەک پادشـان و لـە قووڵاییـی ئاوەکـەدا دەژیـن، چاویـان سـوورە و شـفرەیەک بەسـەر لووتیانەوەیـە، ماسـییەکانی دیکـە لێیـان نزیـک نابنـەوە، ئەو ماسـییە شفرەدارانە تەنها گۆشـتی مـرۆڤ دەخـۆن، ئەگـەر زۆر برسـی بـن و کـەس نەکەوتبێتـە ئاوەکـەوە، بـۆ ئـەوەی نەمـرن نەوەکانـی خۆیـان دەخـۆن. کـە بـە گۆشـتی مـرۆڤ گەورەیـان کـردوون. ڕاوکردنیـان زەحمەتـە، تـۆڕ دەدڕێنـن

و ڕمیش نایانگاتێ. ئەوەکەی دیکەیان گوتی، "مامم دەڵێ هەرکەس ئەو ماسییانە بخوات هیچ ژنێک ڕەتی ناکاتەوە. کەسیش دەرەقەتی نایەت."

سەروەر پرسی، "کەس دەناسی گۆشتی ئەو ماسییانەی خواردبێت؟"

"ئا، باپیرم، ئێستاش ماوە، تەمەنی هەشتا ساڵ دەبێ، چوار ژنی هەیە، ئەوە جگە لەو ژنە پیرە حیزانەی بە گەنجی ناسیویانە و هێشتاش بەردەوام سەردانی دەکەن."

نیان لە زمانی زبر و بازاڕی ئەو کوڕانە بێزار ببوو، ڕووی وەر گێڕا.

هەر ئەو کوڕەیان، ئیشارەتی بۆ نیان کرد و پرسیی، "ئەو خوشکە، دەزگیرانتە یان دۆستتە؟"

هەردووک کوڕەکە هەرزەکارانە و بە حیلکەحیلک پێکەنین، سەروەر سەیرێکی نیانی کرد و بەدڵخۆشییەوە گوتی، "ژنمە، خۆشەویست و هەناسەمە، بۆ دەڵێی دۆستتە؟"

کوڕە درێژەکەیان گوتی، "باوەڕ ناکەم، پیاوەکان هەرگیز لە دەرەوە ژنەکانیان ماچ ناکەن و لەباوەشیان ناکەن، نا، هەرگیز پیاوەکان نەک لە دەرەوە لە ماڵەوەش دەمی ژنەکانیان نامژن، شەوێک گوێم لە بابم بوو بە دایکمی دەگوت بۆنی دەمت منی کوشتووە، دەڵێی حەشیش کێشی، ڕووت وەر گێڕە."

سەروەر گوتی، "ئاخر بابت خیانەت لە دایکت دەکات و خۆشی ناوێت و دەچێتە لای ژنی دیکەش."

کوڕەکە گوتی، "خیانەت! بابم زۆر سەرڕاست و پیاوانەیە هەرگیز خیانەت ناکات، تۆ نایناسی دەنا وات نەدەگوت،

کەس بەبێ قسەی ئەو ناتوانێ پەنجە بخاتە ئەو ڕووبارەوە، بەڵام ئا، دایکم بۆ خۆی ژنی بۆ پەیدا دەکات، ژنەکانیش بۆخۆیان دێن، ئەو شەڕە نیوەی ئەو شارەی حیز کردووە. ئەو ڕۆژە ژنێکی بەغدایی سپی سپی بۆ هێنابوو، بۆنی هەموو سەر دیجلەی داپۆشیبوو، زۆر جوان بوو، دەتگوت نەجلا فەتحییە، هەر کە بابم ژنەکەی دیت، لە خۆشییان داکمی توند لەباوەش کرد و ماچی کرد، بەڵام وەک تۆ دەمی نا، ئەو لاملی داکمی ماچ کرد، هەر بە هۆی ئەو ماچەشەوە بوو، ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار پێستە ڕەشە چرچەکەی داکم تۆزێک سوور بۆوە."

بۆ ئەوەی بابەتەکە بگۆڕێت، نیان پرسیی، "دایکت خۆش دەوێ؟"

ئەو گوتی، "نا، ناهێڵێ سەیری ئەو ژنە شارستانە بەغداییانەش بکەم کە بۆ بابمیان دەهێنێ، بەڵام خۆشم دەوێ، لەبەر بۆن ماسییەکەی، دیجلە و ئەو ئامۆزا خوێرییەشم خۆش دەوێ."

کوڕەکەی دیکە لەو سەرەوە گوتی، "قوربانت ئامۆزا."

دیجلە ترسناکە، بەڵام بۆ ئەو دوو کوڕە ماسییە نا، دەشێ ئەوانە هەر لە بنەڕەتدا ماسی بووبن، سادە و ئاوالا بوون، هەموو شتێکیان دەگوت و دەکرد، خۆ دەکرێ ژیانیش هەر لە بنەڕەتدا ئاوا بووبێ، ئەو هەموو هێڵ و سنور و خەتخەتێنە چییە خەڵکەکە لێک جیا دەکاتەوە، ئەو هەمو سنوور و دابەشکارییەی مرۆڤی هیچ دەستی داوەتێ. مرۆڤیش حەیوانێکە وەک کەر و پشیلە و سەگ و مەیموون و باڵندەش بێ وەک خۆی پێی خۆشە، وەک کۆتر و باز و

شـاهۆ و کاسەڵەشـینکە و تووتـی، کـێ خۆشەویسـتی بداتـێ، لـە کێ نزیـک بـوو بچێتـە باوەشـی ئـەو، هێلانـە دروسـت بکات و جێـی بهێڵـی، هێلکـە بـکات و هەڵـی هێنـێ ئەخلاقـی ئـەوەی هەبـێ بێمنـەت گەورەیـان کات، دواتـر ئازادیـان بـکات و نەشیانناسـێتەوە.

نیـان بیـری لـە منـداڵ و سـەروەر بیـری لـە زەماوەنـد دەکـردەوە، نیـان گوتـی، "حـەز ئەکـەم کچێکـی بچووکـم هەبـێ، کچێـک قژیـم لـە دواوە بـۆ بەسـتبێ، هەمیشـە لـە تەنیشـتم بـێ، کـە بـڕۆم لـە دواوە تەنوورەکـەم ڕاکێشـێ، تۆزێکیـش قەڵـەو بێ، گۆرەوی سـپی لەپێ بکـەم و شـوێن گۆرەوییـەکان لەسـەر قاچـی دەر بچـن، ئـەو شـوێن گۆرەوییانـە مـاچ بکـەم، حـەز ئەکـەم هەرگیـز گـەورە نەبێـت و هـەر نـازم بەسـەردا بـکات."

ئـەو خۆشـییە ژیانـێ سـەروەری ئـارام نەکردبـۆوە، وەک یەکـەم جار بێت خـۆی بێت و بەویسـتی خـۆی قسـە بکات گوتی، "ئینسـان شـایانی ئـەوە نییـە ئیـدی نـەوە بخاتـەوە، ئەزموونـی نـەوە خسـتنەوە و بەردەوامیـدان بـە ژیـان سـەرکەوتوو نەبـوو. نـەوە بـۆ ئـازار و ژان دەهێننـە دنیـاوە، سـەرەڕای ئـەوەی کـە تەنهـا فێـری هونـەری شـەڕ و لەناوبردنـی یەکتـر دەکرێـن، فێـری بەفیڕۆدانـی تەمەنیـان دەکرێـن، ناکرێ ئینسـان بـۆ چاوەڕوانیکردنـی مـردن لەدایـک ببـێ. سـەرەڕای هەمـوو ئەوانـەش ژیـان بێهوودەیـە، هیـچ سـەمەرەیەک لـە ژیانـدا نییـە، بۆقێـک، کرمێـک، مانگایـەک، شەمشـەمە کوێرەیـەک نازانێـت کـە دەژی، جیـاوازی نێـوان ژیـان و مـردن نـاکات، بەرنامـەی نییـە بۆ نەوەخسـتنەوە، سـنووری ژیانـی خـۆی و تەمەنی خـۆی نازانێت، بیرکردنـەوەی نییـە، گـەورەبـوون و پەڕیـن و سـەربڕینیش بـۆ

ئەو لەناکاو ڕوو دەدەن. خۆ لەبەرامبەردا ئینسان دەزانیٚ، دەزانیٚ هەرچی بکات و هەرچی دەست بکەویٚ و بگاتە هەر پلەیەک لە لەحزەیەکدا کۆتایی دێت. نەوەخستنەوەی ئینسان دەبیٚ لە شوێنێکدا بووەستیٚ، بۆ خۆی بیوەستێنیٚ."

نیان هەرگیز بەرامبەر بیرکردنەوەیەک ئەوەندە نەتاساوە، ئەو لە ڕەچەڵەکی ئەو گوڵانەیە، کە تەنها ئەوەندە دەزانن لەگەڵ تیشکی بەیان زەردەیان بێتیٚ و دەم بکەنەوە و بپشکوون و سڵاو لە پەپوولە بکەن، بۆیە پرسیی، "مەبەستت چییە ئینسان دەبیٚ نەسلی خۆی لە شوێنێکدا بووەستێنیٚ؟"

سەروەر هەستی بە قورسی قسەکانی خۆی کرد، لەگەڵ نیان و بەرامبەر تیشکی خۆر و بەدەم سەمای ئاوەوە کوا جێگای ئەو بیروڕا سەمەرانەیە. هەردوو دەستی بە ڕوومەتی نیان گرت، بە شێوەیەک سەری نیان بکەوێتە نێوان هەردوو دەستیەوە، سەیری چاوە سەوزە تا ئەوسەری دنیا سەوزەکانی کرد، گوتی، "بەڵێ دەبیٚ ئینسان سنوورێک بۆ نەسلی خۆی دانیٚ، باشترین کاتیش ئێستایە، هەرگیز ئینسان وەچەیەکی دیکەی وەک تۆ ناخاتەوە، باشترین داهێنانیش ئەوەیە لە لووتکەدا واز بهێنێ، هەموو لەدایکبوونەکان تاقیکردنەوە بوون تا تۆ لەدایک ببی، وەک چۆن ئەدیسۆن سەدان ڕێگای بەکار هێنا، تا گڵۆپی دروستکرد، تاقیکردنەوەکان بۆ دروستکردنی گڵۆپ لێرەدا وەستان. من باوەڕ ناکەم ئینسانییەت بتوانیٚ جارێکی دیکە پەیکەرێکی وەک تۆ دروست بکاتەوە، تۆ بۆ ئەوە دەشێی وەک نموونەی باڵای ئینسان بۆ هەمیشە بمێنیت."

نیان لە ئاڵۆزی قسەکانی حاڵی نەدەبوو، تەنها ئەوەندەی

دەزانی کە باوەشێکی پۆڵاین بۆ ئەو کراوەیە، خۆشەویستی بێسنووری تەواو داگیری کردووە، ئومێدێکی کۆنی کچانەشی لە سەروەردا دەدی، ئەو هەمیشە لەگەڵ دەستەخوشکەکانی چ لە ناوەندی و چ لە دواناوەندی، چ لەگەڵ کچانی هاوسێ و خزم دەیانگوت باشترین خۆشەویست و دەزگیرانی کوڕ بگیرێ، ئەو کوڕەیە کە تەنها تۆی دەوێت و ئامادەیە لە پێناوی تۆدا بمرێ، باشترین کوڕ ئەو کەسەیە کە کچ بە یەزدان بزانێت و خۆشەویستییەکی لەبننەهاتووی بۆی هەبێ. لەبەرامبەر کوڕێکی ئاوادا کچ دەبێ لە هەندێ لە زەوق و داواکاری، هەست و هیوای خۆی چاوپۆشی بکات، وەک ئەوەی بالای، پێستی، پلەی کۆمەلایەتی، زۆر جار تەمەنیشی چەند بێ.

گوێی لێ دەبوو زۆر جار ئامۆزاکانی دەیانگوت، "کوڕێک کەڕ و کوێر و شەل بێ تەنها تۆی بە هەموو دڵێکەوە خۆش بوێ، لە کوڕێکی قۆزی ئاڵتونی چاکترە کە هەر ڕۆژەی لەگەڵ کەسێکی دیکە بێت، کە هەر ڕۆژەی داخێک بە دڵتدا بکات."

سەروەر بۆ نیان ئەو کوڕە بوو، جا کچ لە هەموو تەمەنیدا یەک قسە دەچێتە مێشکیەوە، ئەو قسەیەش بە چەکوچی هیچ ئاسنگەرێک دەر نایەت، میدیاش قسەیەکی نەنکی چووبووە مێشکی، نەنکی گوتبووی،

"ئەو کچانەی مەمکیان لێک نزیکە و بەر یەک کەوتوون. ئەوە شوو بە خزم دەکەن، مەمکی لێک دوور بۆ بێگانەیە."

ئیدی ئەو وتەیەی نەنکی بە ئاوی ئاڵتون لە مێشکی میدیادا نووسرابۆوە، وا لە مێشکی چەسپیبوو، وای دەزانی

کـە پەیوەنـدی لەگـەڵ نیـوەی کوڕانـی زانکـۆ ببەسـتێ، مـادام خزمـی نیـن ئەنجامـی نابێـت. زوو زوو دەیگـوت مەمکـی مـن ئەوەنـدە لێـک نزیکـن خەریکـە سـواری یەکتـر بـن. کچێکـی نەجەفـی کـە نـاوی ئیشـراق بـوو، ئیشـراق ئیحسـان، لـە بەشـی مێژوو دەیخوێند، سـاڵێکی تـەواو لەگـەڵ نیـان و میدیـا لـە یـەک ژووردا دەخـەوتـن، گوتبـووی،

"مـن پەیمانـم بـە نۆفەلـی هاوسـێمان داوە، ئـەوەش بەدەسـت خـۆم نەبـوو، لای ئێمـە پێـڵاوی هـەر کوڕێـک بکەوێتـە سـەر پێـڵاوی کچێـک، نسـیبی ئـەو کچـە دەچێتـە دەسـتی ئـەو کـوڕە، نۆفـەل سـەیدە، خزمەتـکاری مەرقـەدە."

نیانیـش ئـەوەی چووبـووە مێشـک، کوڕێـک هەمـوو دڵـی بـدات بـە تـۆ، هەسـت بـە بوونـی کەسـی دیکـە نـەکات لەسـەر ئـەم زەوییـە، کوڕێـک پێـش تـۆ ڕەنگـی نەناسـیبێ، پێـش تـۆ نەیزانیبـێ پێبکەنـێ، کوڕێـک تـۆ هەمـوو دنیـای بێـت، سـەروەر تـەواو ئـەو کـوڕە بـوو بـۆ نیـان.

لـەو سـادەیییەی نیـان و سـەروەر، لـەوە تێدەگەیـن، لـە هـەوڵ تێکۆشـینی مێروولەئاسـایان لـەوە حاڵـی دەبیـن، ئومێد، خـەون و خەیـاڵ دەکـرێ بێتـە دی، لـەوە تێدەگەیـن ئیـدی عاشـقەکان بێغـەم هەنـگاوی گەورەتـر دەنێـن، بازبازێـن بەسـەر هـەوردا تەنهـا خەیـاڵ نییـە، ڕاسـتییە.

خەونەکانمـان چەنـد دوور و ئەسـتەم بـن، لـە دوورەوە وا دیـارن، کـە دەسـتیان دەدەیـەی ئەوەندەش قـورس نیـن. نیـان و سـەروەر لـە دوو شـاری تەریـک و غەمبـاری ئـەو دنیایـە لەدایـک بـوون، دوو خێـزان جەنجـاڵ بـە بەتاڵـی، بـە خۆشەویسـتی و هونـەر و مۆسـیقا و ڕەنـگ نامـۆ، دوو شـاری داپۆشـراو

بە خۆڵ و مەینەتی، کوژراو بە بوغز و دوژمنایەتی، پڕ کۆڵانی باریک و کۆڵانی نەفەسگر، پڕ هونەری شێتی و خۆ قۆشمەکردن. هەریەکەیان لە دوو ماڵی جیاواز و لێک دوور و خۆڵەمێشی لەدایک بوون، لەناو قسەی بچووک گەورە بوون، بەدەم ڕاکردنەوە خوێندیان، بەدیار تەقە و ترسەوە خەوتن، لە ترسی هاوسێ باڵقبوونی خۆیان شاردەوە، دواتریش وەک دوو ماسی فڕێ درانە ناو ئاسمانێکی وشک، ئاسمانی پایتەخت. ئەوان هەوڵی هەنگیان دا، دەستیان بە هێزی مێرووڵەوە گرت، عاشقی پەپوولەیان خواست، ئومێدیان هەڵچنی، ئومێدی ئەوان هاتە دی، بەسەر ئاودا خلیسکان، لە ترسی هەڕەشەی ڕۆژگار، غەدری کەسوکار چوونە باوەشی یەکتری، چوونە باوەشی یەکتری و چاویان نووقاند، تا بەتەنیشت خەونی یەکێکی دیکەوە دڵیان ئارامتر لێ بدات. لێشی دا ئارامتر، لەسەر سینگی یەکتر چاویشیان نووقاند دنیا ژێرەوژوور نەبوو.

کە گەیشتنەوە شوێنەکەی خۆیان، ئەو دوو کوڕە ماسییە جادووبازە، بە هونەر و فێڵبازییەک بەلەمەکەیان ڕاگرت، بە سووڕانەوە و هەڵبەزینەوەیەک، سەروەر و نیان کە دەستیان لەسەر کەمەری یەکتر بوو، کەوتنە ناو ئاوەکەوە، ئەوان لەتریقەی پێکەنینیان دا و ئەوانیش خەریک بوو بخنکێن. کە سەروەر هەستایەوە سەر پێ ئاوەکە لە کەمەری بوو، نیان پەشۆکابوو نەیدەتوانی هەستێتەوە، سەروەر دەستی گرت ئەویش یەکسەر بەو هەموو ئاوەوە چووە باوەشی، وەک ئەوەی لە تاڤگەی نیڤادا بەر بووبێتەوە توند خۆی بە سەروەرەوە نووساند، جلەکانی وەک پەڕەسیغار بە لەشیەوە

توابوونـەوە، گـۆی مەمکـە ڕەق و قیتەکانـی دەر کەوتبـوون، مەمـک لـەو تەمەنـەدا نەگیـرێ هەرگیـز ناپشـکوێ، وەک ئـەو خونچـە گولانـەی سـەرەکەیان ببەسـتی، بـۆ ئـەوەی لەنـاو خۆیانـدا بخنکێـن.

نیـان وا خـۆی بـە سـەروەرەوە هەڵواسـیبوو، کـە سـەروەر ناچـار بوو دەسـتیک بخاتـە ژێر ڕانی، دەسـتەکەی دیکەشـی بن پشـتی، نیانیـش هـەردوو دەسـتی لـە ملـی سـەروەر ئاڵاندبـوو، ئەوەش دیمەنێک بوو هەرگیز بە خەیاڵی کوڕ و کچانی ئادابدا نەدەهـات. سـەروەر تەنهـا لـە دوورەوە سـەیری خـۆی دەکـرد، کچێکی بـەو هەمـوو ئـاوەوە لـە باوەشـە، تیشـکێکی ئاڵتونی خۆر ڕووناکیـان دەکاتـەوە، لـەو پەشـۆکانەدا بـە نیگایـەک سوپاسـی ئـەو دوو هەتیـوە زۆڵـەی کـرد.

هەمـوو ڕۆژێ بـۆ سـەروەر ڕۆژێکـی تازەیـە، بەیانییەکـی تازەیـە، بـۆ ئـەوەی هەناسـەیەک بـدات دەبـوو دەرگا لەسـەر هەولێـر و سلێمانی دابخـات. کـە بـۆ ئـەو جگـە لـە هەڕەشـە و مـردن شـتێکی دیکەیـان لـێ چاوەڕێ نەدەکرا. برینەکانی سـاڕێژ ببـوون، ماسـوولکەکانی کەوتبوونـەوە سـەریەک، پەپوولـەکان لەتەنیشـتیەوە دەفڕین، باڵندەکان زیاتـر لێی نزیک دەبوونـەوە، دنیا ئەوە بوو لـە بەردەمیدا بـوو نـەک ئـەوەی جێی هێشـتبوو، چونکـە ئـەو کەسـەی بزمـاری ژەنـگاوی ڕابـردوو بێنـێ، قـەت ناگاتـە بەیانـی. ناگاتـە بەیانـی کـە هەمـوو ئـەو یادەوەریانـە نەکوژێـت کـە ئـەو بزمـارەی بیـر دەخەنـەوە. سـەروەر ڕای وا بـوو ئەوانـەی دەیانـەوێ باڵەخانـەی ژیانیـان لەسـەر ئـەو بزمـارە دروست بکـەن، ئەگـەر سـەد نهـۆم بخەنـە سـەر یەکتر بە جووڵانی ئەو بزمارە هەمووی بەسـەر یەکدا دەتەپێ. هـەر

ئەو ڕۆژەی کەوتنە ناو ڕووبارەکە بە نیانی گوت، "ئیدی لەو ڕۆوە ئێمە منداڵی ئاوین، نەوەی ڕووبار و جۆگەلە و دڵۆپەبارانین، منداڵی دیجلەین، دیجلە ئەمانەتی داینیٚ، دیجلە ئەو ژیانەی داینیٚ کە هەموو دنیا دەیەویست لێمان بستێنیٚ."

نیان هەردوو دەستی خستبووە پشت سەری، سەیری ئاسمانی بێبنی دەکرد، گوتی، "ئەو ژیانەی دیجلە دەتداتیٚ هەرگیز کۆتایی نایەت."

سەروەر گوتی، "من دەمەویٚ لە لەحزەیەکدا بژیم، لە چرکەیەکدا بژیم ئەوەندەی سەد ساڵ درێژ بێتەوە."

نیان پرسیی، "چرکەیەک ئەوەندەی سەد ساڵ؟"

"چرکەیەک نا، خولەکێک، کاتژمێرێک، ڕۆژێک، نا سیٚ ڕۆژی هەنگوینی ئەوەندەی هەزار ساڵە بۆ ئێمە، دەچینە ئوتێلێک لەویٚ هەموو ڕۆژەکانی ژیانمان دەخەینە سەر یەک و دەچینە ناو هەنگوینەوە. لەویٚ زەماوەند دەکەین."

نیان بێدەنگ بوو، سەروەر بەردەوام بوو، "شەوێک بۆ ئێمە سەدەیەکە، ئێستا ئێمە موڵکی خۆمانین (دەستی خستە سەر یەکەیەکەی ئەندامەکانی لەشی نیان) کەپوو، چاو، برۆ، دەم هەتا ئەو مەمکانەش هەمووی موڵکی خۆمانن."

ئەو بڕیارەی سەروەر هیی ئەمرۆ نەبوو، هیی ئەو ڕۆژە بوو کە لەگەڵ سەردار وێنەکەیان تێدا گرت، ئەو ڕۆژەی نیان یەخەی کراسەکەی چڵکن بوو، لێوی غەمبار و دڵی توند بوو، قردێلە و پێڵاوی شین غەمبارتریان کردبوو. ئەو ڕۆژە سەروەر خەیاڵی ئەوەی کردبوو، بە جلی بووکێنییەوە، لە دەروازەی ئوتێلێکی پێنجئەستێرەیی سەعدون دەچنە ژووریٚ. ڕیزێک خەڵکی پۆشتە چەپڵەیان بۆ لیٚ دەدەن.

جا ئەو خەڵکانەی چەپڵە لێ دەدەن لە هەموو شوێنێک ئامادەن. کەسێک گۆرانی دەڵێت و یەکێکی دیکە مۆسیقا لێدەدات، هەمو پێدەکەنن و چوکلیات دەخۆن. لەنێوان لاقی پێشوازیکەران و هاموشۆکەران دوو چاوی وەک بزمارێکی ژەنگن بە دڵیدا دەچێ، دوو چاوی گریاو و پڕغەم و تاساو، پڕ حەسرەت و خەمخۆریش، دوو چاو بەسەر کەپوویەکی کوتراوەوە، کە ناکرێ ئەم دوو چاوە جگە لە هیی مریەمە ڕەش هیی کەسێکی دیکە بن. ئەو چاوانە بزمارە ژەنگنەکەی ناخی سەروەر دەلەقێنن و تەواوی نهۆمەکانی ژیانی بەسەر یەکتردا دەدەن. بەڵام نا، ئەوە تەنها خەیاڵی ئەو ڕۆژە بوو، ئەو ڕۆژەی کە وێنەکەیان تێدا گرت.

***

کاتێ ئەو چرکەیەی کە سەد ساڵ درێژ دەبێتەوە هات، وەک خەیاڵەکەی نا، هەر بەجلی ئاساییەوە، بە جلی بووکێنییەوە نا، سەروەر بە چاکەت و پانتۆڵێکی ڕەش و کراسێکی سپی کەتانەوە. نیان بە عەزیزییەیەکی شینی کاڵی درێژ، کە بە ئەستێرەی سپی ورد ڕازابۆوە، گوڵێکی سووری لە ئەستێرەکان گەورەتر ڕێک لەسەر دڵی بوو، بە دوو جانتاوە لە بەردەم ئوتێلە پێنج ئەستێرەییەکە دابەزین، وەک ئەوەی لە شارێکی دیکەوە هاتبن.

سەردار لەوێ لەودیو جامی ئوتێلەکەوە چاوەڕێی دەکردن، کوڕە خوێنگەرم و بە پێکەنینەکەی جاران نەبوو. بەئاگا و توند، بەڵام دیسان ئاڵۆز و پڕنهێنی، وەستابوو. دەموچاوی

گنجی تێ کەوتبوو، بەڵام شتێک لە متمانە زیاتر بەسەر سمێڵە زەدەکەیەوە بوو. بەرەو پیریان چوو، لەباوەشی کردن، قسەیەکی بە گوێی سەروەردا چرپاند، سەروەر بۆ تەنها چرکەیەک خوێنی وەستا، هەندێ پارەشی خستە باخەڵیەوە. دواتر بەگاڵتەوە گوتی، "بڕوانامەی ڕاستەقینەی خۆتان وەر گرت. ئەوە دەر چوونە لە زانکۆ."

ئەوان هەردووکیان پێکەنین. خێرا شاگردێکی چاپووک جانتاکانی لێ وەر گرتن، هۆڵێکی پێشوازی شیک و فراوان، نیان دانیشت و سەروەریش پێناس و پەیماننامەی هاوسەرگیری دایە دەستی ئەو کوڕەی لەپشت مێزێکی شووشە بەندەوە چاوەڕێی دەکرد. ناوەکانیانی نووسی و بانگی ئەو شاگردەی کرد کە جانتاکانی هەڵگرتبوون، کلیلێکی دایە دەستی و گوتی، "بیانبە بۆ ژووری حەوت سەد و حەوت، با ژوورەکەیان ڕووەو خۆر بێ."

پەنجەرەکانی ژوورەکە ڕووەو خۆرهەڵات بوون، لە دوورەوە دیجلەشیان لێ دیار بوو، وەک مارێکی زەبەلاحی خۆڵەمێشی دەجووڵا و هەتاو لەسەر پشتی دەپرینگایەوە.

لێرەوە هەموو شتێک کۆتایی دێت، ماڵی گەورە و بێسنووری عاشق ژوورێکی دوو مەترییە، کە هێزێکی سیحری هەموو شتێکی تێدا کۆ دەکاتەوە، خۆر و مانگ و ڕووبار و تەمەنی هەتاهەتایی. ئەوەی پێویستە بۆ ژیانی عاشق ئۆکسجین و خواردن و خواردنەوە نییە، نوورێکە لەسەر گۆشتی یەکتر، لەسەر ئێسقانی یەکتری دەبینن. ئەوەی عاشق مەست دەکات شەمپانیا و شەراب نییە، بەڵکو بۆگەنێکە لەسەر جەستەی یەکتری هەڵی دەگرنەوە.

لێرەوە لە ژووری ژمارە حەوت سەد و حەوتی بەرخۆرەتاو هەموو شتێک کۆتایی دێ، ئەوان چ پێویستیان بە دنیایەکی ئەوەندە پانوپۆڕە. چ پێویستیان بەو هەموو مرۆڤە هەیە کاتیان لەگەڵ بەش بکەن، دنیا ژوورێکی بەرخۆرەتاوە لە ئوتێلێکی مەیدانی فیردۆسی بەغدا، ژوورێک ئەوەندەی پێویست بێ هەوای تێدایە و باڵندە سڵاوی لێ دەکات، ژوورێک ئەوەندەی بکرێ ئاسمانی لێوە دیارە.

"ئەو ژوورە دوامەنزڵی خۆشەویستیی پیاوە،" "دواوێستگەی خۆشەویستی و یەکەم مەنزڵی مەرگیەتی بەرەو ئاخیرەت."

ژنانی بێئومێد ئەو قەسەیان لە یادەوەری نیان هەڵکەندبوو.

"بۆکچ یەکەم مەنزڵی خۆشەویستییە."

زەنگی تەلەفۆنەکە هێمنی ژوورەکەی ورد و خاشکرد، دەنگەکەی ئەوسەر گوتی، "شیرینی و شەربەتیان بۆ ناردوون."

سەروەر پرسی، "کێ؟"

ئەو گوتی، "من مەحموودم..."

هەرچەند دیار بوو براکەی نییە، دیسانەوە نیان تاساو، هەناسەی بۆ نەدرا، دەنگەکە بەردەوام بوو، "من مەحموود، بەرپرسی بەشی پێشوازی ئوتێلەکەم، هەر کارێکتان هەبوو تەنها ژمارە یەک لێ بدە."

سەروەر کە هەستی بە وەگەڕکەوتنەوەی دڵی نیان کرد، گوتی، "مەبەستم بوو بپرسم کێ ناردوویەتی؟"

"هاوڕێیەکی خۆتان."

دەنگە پیاوانە و گڕەکە کۆتایی هات، بەڵام لەرزینی ناخی

نیان تازە دەستی پێ کردبوو. مەحموود برا گڕ و ئاگرەکەی دەبێ لەکوێ بێت؟ ئەو هەواڵەی بگاتێ چی دەکات؟ دەنگی ناو ئەو ئامێرە پلاستیکییە ئەوەندە ژوورەکەی جەنجاڵ کردبوو، خۆشەویستی خەریک بوو لە پەنجەرەکەوە بفڕێتە دەرێ.

کەمالی بەزاز، باوکە سوور و سپی و چاو سەوزەکەی، کە تەنها بۆنەکەی بەس بوو ژیان بە گوڵی حەوشە و کەنتۆری ژووری خەوتن و قەنەفەی هۆڵی میوان ببەخشێ. "باوکێکی میهرەبان بۆ کچ لە خودا زیاتر پێویستە." ئەوەش قسەی ئەو هەجیجیە بوو کە ساڵانە یەک نیوەڕۆ نانی لە ماڵ دەخواردن.

نیان دەیدی ئێستا لە ژووی ئوتێلەکەیەوە، کەمالی بەزازی دەدی لەسەر منارەی مزگەوتی گەورە وەستاوە، لەجیاتیی تارای بووکێنی، تۆپێک خامی بەرداوەتەوە و کفن دابەش دەکات.

دایکی، بەڵقیس، لە خوارەوە بانگی دەکات، "وەرە ئەو قسانە هەموو درۆن، نیان گەڕاوەتەوە، وەرە خوارێ حەیات بردین." بـا لەچکەکەی بەڵقیسی وەک پەڵەهەورێکی بچووک بردووە، قژ و جلە کوردییە دانتێلەکەی بـا دەیانبات، لەوەتەی دنیا هەیە ئەو ڕەشەبایەی سلێمانی خەڵکەکەی دەر دەکات و بێزاریان دەکات، کەچی خەڵکەکەی ڕۆژبەڕۆژ زیاتر لە شارەکە و خاک و گەرما و گێژەڵوکەکەی نزیکتر دەبنەوە، ئەی بۆ دەڵێن خۆشەویستی بە یەکلایەنە ناکرێ. نیان لە دڵەوە گوتی، "قوربانی گەرد و تۆزی کۆڵانەکانت بم."

لە دەرگاکەیان درا، سەروەر بە پارێزەوە دەرگاکەی

کـردەوە، پیاوێـک کـە لـەلاوە دەڵێـی مسـتەفای برایەتـی، سـینییەکی گـەورەی بەزەحمـەت هەڵگرتـووە، پاقـلاوە و میـوە و چەرەسـات و سـوراحی شـەربەتی بەرێکـی لەسـەر بـڵاو کرابـۆوە، کارتۆنەکـەی سـەری لێـی نووسـراوە، "ژیانتـان هەنگویـن بێـت، حەبیـب." سـەروەر گوتـی، "بەڕاسـتی سـەردار زۆر خـۆی مانـدوو کـردووە."

نیـان هێشـتا لەسـەر لێـواری سیسـەمەکە دانیشـتبوو، هەسـتی کـرد زۆر ڕۆیشـتووە، لـە ژوورەکـەی ئوتێـل و بەغـدا و سـەروەر زۆر دوور کەوتۆتـەوە. هەسـتا چـووە لای مێزەکـە، پەرداخێک شـەربەتی سـوور و پاقلاوەیەکی بـۆ سـەروەر برد، بـۆ خۆشـی کونافەیەکـی بـە ئـاوەوە خـوارد. سـەروەر حـەزی کـرد شـیلەی سـەر پەنجەکانـی بلێسـێتەوە. لای یەکتـر لەسـەر لیـواری سیسـەمەکە دانیشـتنەوە، سـەروەر دەسـتی کـردە ملـی، بـە پشـتدا کەوتـن، قژی نیـان کەوتـە سـەر ڕوخسـاری، لەجیاتیی بۆنـی جگـەر و دوکـەڵ، شـیرینی و تامـی گوێـز لەسـەر لێـوی سـەروەرەوە قـووڵ تـا ناخـی نیـان چـوو. تـف و زمـان و لیـک و کونافـە و شـەربەتی سـوور لەسـەر لێویـان تیکـەڵ بـوون. دوگمـەی سـەر سـینگی نیـان کرابوونـەوە و خۆشەویسـتی بەپێخاوسـی کەوتبـووە نـاو چنگـی سـەروەر. ئاگرێـک لەسـەر سـینگی نیـان کرابـۆوە، ئـەوەش ڕاسـت دەر چـوو کـە گـڕ و گەرمـی بورکانـەکان لـە توانـەوەی بەسـتەڵەکی سـەرزەوی و ئاوەدانکردنـەوەی شـانازی یەکەمیـان بـەر کەوتـووە.

یەکەیەکـە جلەکانـی سـەرەوەیان فـڕێ دان، شـەرمیان لـە جەسـتەی یەکتر دەکرد، سامی لەشـی سـەروەر کـە بەڕووتـی بەرامبـەر نیان وەستابوو تەنها ئـەو کچانە درکی پێ دەکەن،

کە جارێک کەوتبنە ناو دەمی ئەژدیهاوە. سەرەوەریش شەرمی دەکرد ڕووبەڕوو بەرامبەری بووەستێ، بەتایبەتی کە لە بەردەمی ئەندامێک، وەک لە سلاوی سەربازیدا بێت بستێک لە لەشی جیا ببۆوە. نەشدەکرا پشتی تێ بکات، نیان لەسەر سیسەمەکە دانیشتبوو، کە سەرەوەر بەتەواوی خۆی ڕووت کردەوە، ئەو سەری خۆی خستە سەر ئەژنۆی و قژی بەتەواوی دەموچاوی داپۆشی، ئەوەش هەلێکی باش بوو سەرەوەر لە ئاوێنەکەوە تەماشای جەستەی ڕووتی خۆی بکات. یەکەم جار بوو ئاوا لە ئاوێنەیەکی ڕوون و گەورەدا جەستەی خۆی بەڕووتی ببینێ، لەپشت جەستەی کرمی خۆیەوە، لەشی ئاڵتوونی نیانی دیت، کە قژی بەشێکی زۆری پێ دانەپۆشرابوو. نادادپەروەری گەورەترین حیکمەتی خودایە. خۆی وەک مارمێلکەیەکی ڕەش هاتە بەرچاو کە قووتدانی ماسییەکی لە خۆی گەورەتر ئەستووری کردبێ.

حەزی کرد مستێک لە ئاوێنەکە بدات و هەزار پارچەی بکات، بە دەستەکەی دیکەش قوڕقوڕاگەی خۆر بگرێت و بۆ هەتاهەتا بیکوژێنێتەوە، لەسەر ئەو باوەڕەی دادپەروەری لە تاریکیدا دێتەدی.

بەتاریکی، ژیان تەنها بەتاریکی ئازادی دەبینێ. جەستە لە تاریکیدا دواقسەی خۆی دەکات. لە ڕووناکیدا هەرگیز زمانی لەزەت نا پشکوێ. پەردەکانی جووت کردن و گڵۆپەکانی کوژاندنەوە، پێکەوە چوونە ژێر بەتانی، ئەوەندەی توانیان توند چاویان نووقاند و جەستەیان بە هەموو خانە و وردەموو و ئارەقەوە پێکەوە نووسا، ژێر بەتانییەکە دوکەڵی لێ هەستا. با هەستێ چەندی دەکرێ، دوکەڵ لەسەر ئەستێرە

ساختەکانی ئەو ئوتێلەش هەستێ. لە چرکەیەکدا نیان چاوی کردەوە و ڕوخساری جیاواز و هەڵەمساوی سەروەری دیت، چاوی ئەوەندە بەتوندی نوقاندبوو کە زەن نەدەکرا جارێکی دیکە بتوانێ بیانکاتەوە، هەر چاوی بە ئاوێنەکە کەوت، هەموو کورد، لە پێشیانەوە بەزاز و قوماشفرۆشەکان و کورە گیرفاندڕاوەکانی بەر سینەما، خزمە بەگلەیی و مامۆستاکانی ئامادەیی و هاوسێ کۆنەکان و ئەو قوتابییانەی بە درێژایی تەمەن لەگەڵیاندا خوێندبووی، هەر هەموو کورد لە ئاوێنەکەوە هاواریان دەکرد،

"قەحبەی ڕەدووکەوتوو دەستمان بتگاتێ پارچەپارچەت ئەکەین."

"هیچوپووچ، بێ پرسی کەسوکارت لەگەڵ ئیبلیسێک دەچییە ناو جێگاوە، هەی دێڵە بەبا."

نیان هەموو لەشی سارد بۆوە، ئەو ئارەقەیەی کەوتبووە سەر پێستی وەک سەهۆڵ بێ ئازاری دەدا، لەرزی هاتێ، سەروەر هەستی بە ساردبوونەوەی نیان کرد، بەڵام نەیتوانی هاوکاری بکات و زیاتر لە خۆی نزیک کردەوە، ویستی بچێتە نێو ڕانەکانی، نیان هێواش دەرپێکەی لەپێ کردبۆوە، گوتی، "جارێ هەر لەسەر دەرپێوە خۆت تەواو بکە."

وەک سەد شمشێریان لە سینگی سەروەر دابێ، وەک ئەو ڕۆژەی ناو ئاودەسەکانی سینەما حەمڕا، تەنگەنەفەس بوو، نیان هەستی بە خامۆشبوونی دڵی کرد و گوتی، "لەبەر خاتری من، ناتوانم... من وام پێ خۆشە..."

وشەی وام پێ خۆشە فریای سەروەر کەوت، ئەوەی کە نیان شتێکی لەگەڵ ئەو پێ خۆشە سەرکەوتنە. ئاوا هەر

وەک ئەوەی نیان پێی خۆش بوو.

شەویش هات، خەڵکێکی زۆر لە باخچەکە دانیشتبوون، ژنی ناسک و بالاَعەرعەری، عەرەبی پشتە سمتبەرز، سینگقوت، بەلەکدرێژ، کوڕانیش شیک و فریشتەیی، پیاوی بۆشناخ و جوانخاس، موسیقا و گۆرانی، دانس و چوونەباوەش تا شەهیدبوون. بوورانەوە بەسەر سینگ و دەستی یەکتردا. فێگرتن و زمانلێستنەوە. داهاتنەوەی لووسکەیەک و خۆپێوەجووتکردنی زڕتەبۆزێک، گرتنی زوڕنای گەنجێک بە دەستی پیرەپیاوێکی لێو لەرزیو. چاوی سەروەر دەگەڕا، بەسەر سەما و باخچە و مێزەکاندا، لەوێش هەبوو، لەوسەر کچێکی ڕەنگ زەرد بەدیار مێزێکی تەنها و بەڵێنێکی مردارەبووەوە، کوڕێکی ڕەشتاڵە بەدیار پێکی عەزابەوە، لەوێش هەبوو.

ئەوان چوونەوە ناو نوێنەکانەوە، جلەکانیان بۆ خۆیان جێیان هێشتن، نیان چەندی کرد، چەندی هەوڵدا قاچی بۆ نەکرایەوە، نەیتوانی ڕانەکانی لێک جیا بکاتەوە، ئەگەر نەیویست هەموو هێزی دنیا لاقی کچێکی پێ ناکرێتەوە. هەر بەڕووتی لەسەر باسکی یەکتر خەویان لێ کەوت. دیارە هەموو ئەو جووتە عاشقانەی پێکەوە هەڵاتوون، حیکایەتە پڕشەهامەتەکانیان هەر ئاوا بووە. شمشێریان هەر بە ڕواڵەت لەنێوان خۆیان داناوە، دەنا ئەوە ترسێکە، تۆقینێکە هەر لە منداڵییەوە، لەناو دڵ و مێشک نا، لەناو یەکەیەکەی ئەندامەکانی جەستە دەچێنرێ.

نیان لە ژوورەکەیاندا پشکووت، تیشک بە پەنجەی باریک و درێژ و نەرم لە پەنجەرەکەی دا، نیان چاوی کردەوە،

هێشتا باوەڕ ناکات، لە باوەشی کوڕێکدا خەوتووە، باوەڕ ناکات. هەموو ئەو شتانەی باوەڕیان پێ ناکەین ڕاستین. سەروەر بەئاگا هات، دەمار و بۆریەکانی میزڵدان ئەستوور ببوون و ئازاریان دەدا. پیاوان ئەو ئازارە دەناسنەوە، ئازاری عەمبارکردنی هەرچی شیر و ژەهری جەستە هەیە لەو دەمارانەدا. کوڵمی نیانی ماچ کرد، "شادومانی هیچ نییە، جگە لە نیانێک بەسەر دڵتەوە."

نیان جوانتر لە سڵاو زەردەی هاتێ، خۆیان شوشت، سەروەر بە سەبرە، هەر لە ژوورەکەیاندا نانیان خوارد. زەنگی تەلە فۆنەکە لێی دا، بەیانیتان باش."

سەردار بوو، وەک بانگی سەروەر بکات گوتی، من لە خوارێم."

لە دەنگیەوە یەک دنیا ترس و نیگەرانی ڕژایە سەر زمانی سەروەر، نیان پرسیی، "چیی گوت؟"

سەروەر تەلەفۆنەکەی داخستبۆوە، "هیچ، تەنها گوتی من لە خوارێم."

سەروەر چووە خوارێ، دیار نەبوو، نامەیەکی بۆ جێ هێشتبوو، "لە کتێب فرۆشی نەهزە چاوەڕێتم."

گومان وەک کرمێکی هەزار پێ، نا هەزار چەقۆ گەیشتە ناو دڵی، بە نیانی گوت، "لەگەڵ سەردار پیاسەیەک دەکەم، زوو دێمەوە."

کە چووە دەرێ لە بەردەرگای کتێبخانەکە نەبوو، لەپشت ڕەفەی کتێبەکانی ژوورێ دۆزییەوە، سەروەر پرسیی، "بۆ چاوەڕێت نەکردم؟ بۆ هێناوتمە ئێرە؟"

سەردار گوتی، "پێم باش بوو بەتەنها بێمە دەرێ، ترسام

یەکێک بەدوامەوە بێ."

سەروەر ترسا بپرسێ، "لە کێ ترسای بەدواتەوە بێ؟" وەک ئەوەی وەڵامەکە بزانێ، بەڵام پرسیشی، "دیسان قاچاغی؟ شتێکت لێ ئاشکرابووە؟"

سەردار بە نیوەڕاستی و نیوەگاڵتەوە گوتی، "من هەمیشە قاچاغم، بەس لە خۆم ناترسێم."

"ئەی لە کێ دەترسی ئەفەندی؟" ئەوە پرسیاری سەروەر بوو.

سەروەر بێدەنگ بوو. دڵی ڕاستەوخۆ نەیگوت، "لە ئێوە، لە ژیانی ئێوە دەترسم."

سەردار گوتی، "بەدواتاندا هاتوون بۆ ئێرە، بەووردی لێتان دەگەڕێن، چوونە ئاداب و سۆراغی ئێوەیان لە قوتابییەکان کردووە، یەکەم وێنەی ئەو جارەی هەر سێکمان پێکەوە گرتمان، لای ئەوانە و نیشانی چەند کەسێکیان داوە، بە هۆی برادەرێکی عەرەبەوە گەڕاون، لە منیان پرسیوە، گوتوویانە نازانن ئەوان لەکوێن، ئەو کوڕەمان پێ بناسێنن؟ هەر دەمانەوێ بیناسین. بۆ دڵئارامی چونکە برادەریان بووە."

سەروەر تاسابوو، چاوەڕێی ئەو بەدەستەوەهاتنە خێرایەی نەدەکرد، بۆ خۆهەڵخەڵەتاندن گوتی، "دەشێ دایکی هاتبێ، دەشێ دایکی بیری کردبێ، یان لە خەمی بووبێ و بەدوایدا هاتبێ."

"نازانم دایکی هاتووە یان نا، بەڵام براکانی وەک زەردەواڵە دەسووڕێنەوە."

هەواڵەکە وەک بزمارێکی سوورەوەبوو کەوتە ناو دەستی، ئەو هەواڵە فڕێ نادرێ، با دەستیشت کونبەدەر کات.

"نا، نامان دۆزنەوە، ئەمڕۆ و سبەی خۆمان ون دەکەین."

سەروەر دەیزانی سەردار شتی زیاتر دەزانێ، نەیویست بپرسێ، با خۆی ئەوەی پێویستە پێی بڵێ، لەو کاتەدا خۆی نەدەدی، هەزاران گورگی دەدی بەدوای ئاسکێکەوە، ئاسکەکە نیان بوو، بۆ خۆی گەڕا، خۆی چ بوو، ئا خۆڵ بوو، گورگەکان میزیان پێدا دەکرد. سەردار ئەوەندەشی گوت، "پۆلیس دەتوانێ بەئاسانی بتاندۆزێتەوە، بەڵام باوەڕ ناکەم ئەوان بیانەوێ بە پۆلیس بڵێن، ئەوە تێگەیشتم، دەیانەوێ بۆ خۆیان بتاندۆزنەوە، نیازێکی دیکەیان هەیە."

"نیازێکی دیکەی کوردی تۆڵەستێن دەبێ چی بێ، جگە لە مردن."

ئەوە قسەی دڵی سەروەر بوو. دوامەنزڵ خۆشەویستییە، کە گەیشتی با بتکوژن، کێ وای پێ گوتبوو؟ گرینگ نییە، ئەوەی گرینگە خۆشەویستی بەپێی خۆی تا بەردەرگا هاتووە، گومانی کەوتە سەر سەردار، دەبێ فێڵێکی لەبن سەر نەبێ؟ ئەو دەتوانێ، دەتوانێ پەلبەستیان بکات. شتێکی گرینگتری بیر کەوتەوە، نیان؟ نیان ئێستا تەنهایە! پەشۆکا، ئەوەتا ئەوی تا ئێرە هێناوە، بۆ ئەوەی نیان لە ئوتێلەکە تەنها بێت، ئەوەتا لێکی جیا کردوونەوە، تەنها ئەوەندەی دەوێ ڕاوچییەکە تۆڕەکەی هەڵگرێتەوە. ئەوە گومانێکی قورس بوو، ئەوەی بەدوای خوێنی کەوتوون مافی هەموو گومانێکی هەیە. عاشق و پیاوکوژ وەک یەکن دەبێ گومان لە سێبەری خۆشیان بکەن. تەنها تۆڵەکردنەوە لە عاشق دوژمنەکان دەکاتە دۆست. ماڵی کوڕ و کچی عاشق ڕێک دەکەون، هەریەکەیان و عاشقەکەی خۆیان بکوژن. ئەوەیان کوڕە عاشقەکە و ئەوەشیان کچە

ئەڤیندارەکە. جەستەی عاشق وەک لوو و شێرپەنجە بەوپەڕی دڵڕەقییەوە لێ دەکرێتەوە، لە ڕەگەوە دەر دەهێنرێت، فڕێ دەدرێتە بەردەمی سەگ، بۆیە سەگەکانی ئەم وڵاتە هەمیشە بەبان، ئەوە قسەی کەسێک نییە ئەوە حیکایەتی گەلێکە.

بەپەلە لە کتێبخانەکە هاتە دەرێ، دەبێ چەندی زووە بگاتەوە ئوتێلەکە، ترس قامچییەکە بەر ڕوحی دەکەوێت و ڕاوی دەنێ، هەر هەنگاوێک دەکاتە هەزار، بیری لەوە نەدەکردەوە دەشێ ئێستا خۆیشی بە ئامانج گیرابێ، خۆ ئەو هەرگیز ئەو گەلەگورگەی نەدیوە، بەناو خەڵکەکەدا ڕێی خۆی دەکردەوە، لەناکاو شانی کەسێک بەتوندی بەر سینگی کەوت، نوچێکی برد و خۆی گرتەوە، "هێواش، بابە هێواش،" گوتنەکەی کوردانە بوو، ئا دوای ئەویش کەوتوون، مادام وێنەیەکیان بەر دەست کەوتووە، براکان هەرگیز دەموچاوی کەسێکیان لێ تێکناچێ بەتەنیشت خوشکەکەیانەوە وەستابێ. وەک بەرنامەی دانابوو، ئەو شتانەی پێویستی بوو بەپەلە کڕینی، کەوتەوە ڕێ، یەکێک توند لەدواوە شانی گرت، لە دڵەوە تاسا و هەنگاوی بۆ نەنرا، ویستی بە کۆڵانەکەی دەستە ڕاستدا ڕابکات، ئەو گوتی، "بۆ هێندە بەپەلەی، جارێ تۆزێک بیر بکەوە، ئاگات لە خۆت بێ، زۆر پەشۆکاوی."

سەروەر ئاوڕی دایەوە، سەردار بوو، نامەیەکی خستە باخەڵیەوە و گوتی، "ئەو نامەیەش داکت بۆی ناردووی."

# ١٣

گوڵەکانی حەوشەکەی ماڵی کەمالی بەزاز ڕەنگیان چووبۆوە، وەک ئەوەی گوڵی سەر کراس بن و لە فاستدا جێ هێڵرابن. بەو قسە توند و ئاگراویانەی کوڕەکان ڕۆحیان لە بەر نەمابوو. سەرسامیش بوون لەو بێدەنگی و چۆڵییەی لەپڕ ماڵەکەی تەنی، هەرچەند بەشی ساڵێکی تەواوی کوشتنی گوڵ هەڕەشەیان بە هەوادا وەر کردبوو.

تەنها نەجمی حەسەنی شووشەی کۆنە سەربازەکەی حامییە، ئاگاداری پلانەکەیان بوو، هەر بۆخۆی نەخشەی تەواوی کێشابوو، وێنەکەی بەلقیس لە ماڵی سەروەر دۆزیبوویەوە، لەگەڵ خۆی هێنابووی، وەک نەخشەی جەنگ دەستا و دەستیان پێ دەکرد.

نەجم، دەستی خستبووە سەر وێنەکە، گوتی، "ئەو کوڕە لووتبەرانییە یارمەتیمان بدات کارمان ئاسانە."

پرسییان وەک دڵسۆز و خەمخۆری ئازیزان پرسییان، وەک کەسوکار و دڵپەرۆش پرسییان، ئا هەموو دەیانناسین،

هەموو دەیانزانی کورێ و کچێکی عاشق، گوڵە باخێک و ڕیحانەڕەشەیەک، دەستی یەکتریان دەگرت، لە ئاداب دەهاتنە دەرێ، بەژێر پردە ئاسنەکەی وەزیرییەدا ڕەت دەبوون، تا سەرەگێژەیان دەگرت پیاسەیان دەکرد، لەپەنا دارە ئەستوور و بەتەمەنەکان دەوەستان و لە تاریکولێڵی ئێوارەدا دەچوونە باوەشی یەکتری، زۆرشتی تریش، زۆر زۆر، کەمیان دەگوت، ئەوەشیان باس دەکرد، هەموو چۆلەکە و تەیری سەر دارەکان و ئاسمانی بێبن بەسەریاندا دەفڕین و ئەوەندە نزم دەبوونەوە بۆنیان بکەن. ماڵەکانی ئەو دەوروبەرە ئاشنایان بوون، هەندێ ئێوارە فەرمووی سەر خوانی خۆشیان لێ کردوون. کچەکەیان، کە مەبەستیان نیان بوو، نوقڵە بادامی داوەتە ئەو ژن و پیاوە بەتەمەنە غەمبارانەی ئێواران جورئەتی ئەوەیان دەکرد بە عەرەبانەکانیان تا بەردەرگا بێن و لە ڕێبواری کۆڵانەکانیان ڕامێنن.

هەموو ئەو زانیارییە هیچ و بەنرخانە ئازاد، جمکەکەی نیان دەستی کەوتبوو، بەڵام بۆ برایەکانی نەگێڕایەوە، برا ناموسشکان لە دەنگ و ڕەنگی براکەیەوە هەست پێ دەکات. تەنها ئەوەندەی گوت، "بە یەکەوە دیویانن ئێواران پیاسەیان کردووە."

هەر بەو قسەیە، کەمالی بەزاز، مەحموود ئاگری قودرەت، مستەفا و قودسی ئەوانی دیکەش ڕەش داگەڕان.

مەحموود پرسیی، "ئێستا، ئێستا لەکوێن؟ داوەشێ چیی بۆ هێناومەتەوە، پیاسەیان کردووە!"

ئازاد گوتی، "خۆ ئەو قوتابییانەش نازانن چۆن قسە ئەکەن، یەکێکیان ئەڵێ دوێنێ لێرە بوون، یەکێکی تریان ئەڵێ

هەفتەیەک، دە ڕۆژە نەمان دیون، هەیە وتوویەتی سەفەریان کردووە، هەڵاتوون، هەموو شتێک ئەڵێن، تەنها ئەوە ناڵێن ئێستا لەکوێن."

ڕۆژی دواتر مستەفاش چووە ئاداب، وێنەکەی بە کچێک نیشاندا، کچە یەکسەر گوتی، "نیان، کچە شەکرەکە، نیان و سەروەر، دەمێکە نەمدیون."

وا گوتی وەک ئەوەی باسی پەیکەرێکی بەردین بکات کە هەر دەبێ پێکەوە بن. نەک خوێنی دڵی، خوێنی قولەپێی مستەفا کولا، خوشکێک لەجیاتیی حورمەت... بەسەر خۆی نەهێنا و گوتی، "من کارم بەو کچە نییە، ئەو برادەرەم دەوێت، ئەوەی لەگەڵیان وەستاوە."

"سەردار!"

کچەکە دەنگی خۆی لە گوێیدا دەنگی دایەوە، جا ترسا، خۆ سەردار دەمێکە گیراوە، دەشڵێن ڕای کردووە، ئیدی ژیانی لە نهێنیدایە، بەپەلە گوتی، "من ئەو کوڕە ناناسم، لە کەسێک بپرسە کە هاوڕێی بێ."

ئیدی کورد وایە کە حەزی کرد وەک کوندەی سەر بەرەوژێر قسە هەڵدەڕێژێ، کە کاریشت بە قسەکانیەتی دەنگی لێوە نایەت. بەلای کەمەوە مستەفا وای بیر دەکردەوە. هەمیشەش دوو چیرۆک لەنێوانیاندا هەیە چیرۆکێکی ئاشکرا و چیرۆکێکی نهێنی، بە پێچەوانەی هەموو دنیاوە چیرۆکە نهێنییەکەی زووتر بڵاو دەبێتەوە، هەر بەنهێنی دەگاتە هەمووان. چیرۆکە ئاشکرایەکە نیان کچێکی کوردە، قوتابی بەشی زمان و ئەدەبی ئینگلیزییە لە زانکۆی بەغدا، سەروەریش کوردە و قوتابی بەشی زمانی تورکییە، هەموو

ڕۆژێ وانەخوێندن و سەعیکردن و تاقیکردنەوە، کتێبخانە و باخچەی زانکۆ و ماڵی قوتابییان، ئەوانە و سەدان ڕستەی دیکە کە بەشێک بوون لە چیرۆکە ئاشکراکە کەس باسی ناکات. چیرۆکە نهێنییەکە هەمیشە دووبارە دەبۆوە لە تاریکی و نهێنیدا.

"نیان هەڵخەڵەتا و دڵیان بریندار کرد."

"فێڵیان لێ کرد و لە خشتەیان برد."

"دەستیان خۆش بێ زۆر ساویلکە بوو."

"نا، سەروەر فریای کەوت، هەڵی ستاندەوە، دەنا شێت دەبوو."

"ئەویش دڵی بەو هەتیوە سیاسییە خوێڕیەوە بوو."

"ئەویش لەوانی دیکە خراپتر، بەرد دەتاشێت و نایکاتە پەیکەر، بە بەرچاوی خەڵکەوە دەستی گرت، لەباوەشی کرد..."

بردییە کۆڕنیش، بن دارە و داری پێ کرد."

"کەس ڕەنگە زەرد و چاوە شکاوەکانی نەدەدی."

سەربووردەی ئەو ڕۆژانە چرکەبەچرکە لەکوێ پێکەنیوون و لەکوێ کراسیان کڕی، چ میکیاجێکیان هەڵبژارد، تا دەگەیشتنە دادگا و ئەعزەمییە، چیرۆکی کابرای چاو بەتانەشیان دەزانی، کە هەرگیز نەیاندیبوو، هەتا خواردنی جگەر و دوکانی ئەبو سەلامیش، ئەو پیاوە شیوعییەی کە لەو هەموو بیروباوەرە پۆلاییینە، تەنها سمێڵە ستالینیەکەی بۆ مابۆوە. گوزەری زێڕنگەران، دوو ئاڵقەی دەستی دوو، کابرای زێڕنگەر و شەربەت فرۆشەکەش، هەموو ئەوانەشت لەکوێ دەست دەکەوێ، لە چیرۆکە نهێنییەکانی ئەو شوێنەی

پێیان دەگوت بەشی ناوخۆیی، شوێنی حەوانەوەی قوتابییان. هەموو ئەوانەش ئازاد جمکەکەی نیان بە گوێی مشکدا گواستیەوە.

***

ڕێگای نەجم و کەمالی بەزاز جیاواز بوو، کەمال سالانە بۆ دەمچەورکردن و سەلامەتی کوڕەکانی نیوەی قوماشی دوکانەکەی دەدا بە ئەمن و سیخوڕەکان. تا کوڕەکانی و کارەکەشی لە هەڕەشە و بەدگۆییەکانیان بپارێزێ، نەک کەمال، نیوەی قوماشی بەزازەکانی سلێمانی بۆ ئەو پیاوە دڵ و زمان پڕئەشکەنجانەی دەوڵەت بوو. هەر ئەو پیاوانەش سەرداریان بۆ دۆزییەوە، سەردار هەمیشە لەژێر چاوەدێریدا بوو، بۆخۆشی نەیدەزانی تەڵە بوو، بۆ گرتنی هەموو ئەو مشکانەی خەریکی کونکردنی ئاوریشمەکانی سەرۆک بوون، ئەوان وایان دەگوت. سەردار ئیدی کوڕە قۆشمە و دڵتەڕەکەی ئاداب نەمابوو، ئەو کوڕە نەماوە بە قسە و نیگایەک هۆشی کچەکان بەرێ و ئاگایان لەوە نەمێنی کە دەرپێکانیشیان تەڕ بووە. ئێستا لێوبەبار و خەم بەکۆڵ، کەچی هەر زۆڵ و حەرامزادە. پێویست نەبوو کەس پێی بڵێ هەر لە دوورەوە کەمالی بەزازی ناسییەوە، ئەو ئەمنە عەرەبەشی دیت لەوسەری شەقامەکەوە ئەوی نیشان دان و گەڕایەوە.

کەمالی بەزاز یەک جار وێنەکەی دیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە یەک نیگا سەرداری ناسییەوە، هەر زوو بە ئەمنەکەی

گوت، "دیتم، تۆ برۆ."

کەمال بەبێ ئەوەی چاو بتروکێنێ، بەبێ ئەوەی جگە لە قاچەکانی هیچ شوێنێکی دیکەی جەستەی بجوولێنێ، بەرەو سەردار هات، لە دڵی خۆیدا گوتی، "ئەو قوتابییانەی زانکۆ هەموویان بێئەخلاقن، هەموویان تەنها بۆ ئەوە هاتوون کچی خەڵک لەخشتە بەرن، تۆ بۆ خوێندن هاتووی یان بۆ شاگردی، هەی نارەسەن." چاوەکانی تەواو کرابوونەوە هێندەی مووررووی تەسبیحێکی شووشە لە چاوەکانی سەوز بوون، سپێنەی چاوی کۆتایی نەدەهات. دەیویست سەردار بە دەست بگرێت و وەک پاکەتە جگەرەیەکی بەتاڵ لە دەستیدا بیپێچێنێتەوە.

یەکەم پرسیار نەجم کردی، "هەموو قوتابییەکان ئەڵێن تۆ ئەزانی ئەوان لەکوێن؟"

سەردار قورگی وشک بوو، گوتی، "ئێوە لە دوورەوە هاتوون، دەبێ پشوو بدەن، فەرموون دانیشن."

کەمالی بەزاز گوتی، "کوڕی باش تۆش کوردیت، باش دەزانی پیاو کچەکەی دیار نەمێنێ ئاگر ئەکەوێتە ناو پێڵاوەکانی، پێ لەناو ئاگردا پشوو نادات."

سەردار گوتی، "هەموو قوتابییەکان و ئەوانەی شوێنی منیشیان نیشانی ئێوە داوە دەزانن من ئەم ساڵ لە خوێندن دابڕاوم، ئێستا وەک جاران ئاگام لە قوتابییەکان نییە."

ئاگر گەیشتبووە کەمەری کەمال، نەجم گوتی، "دەرگاکان لەسەر خۆت دامەخە، باش نییە، نە بۆ خۆت و نە بۆ کەس."

سەردار دڵی کەوتبووە ناو هەستی کەمالی بەزازەوە، بۆ چرکەیەک نەیدەتوانی ئارام بێ، بەهەیکەل بوو، بەڵام

لـە ناخـەوە ڕۆحـی دەلـەرزی. سـەردار کـچ بایـە هەرگیـز ئـاوا ئاسـان نەیدەتوانـی میـز بکاتـە ژێـر کەرامەتـی باوکـی. سـەردار زانیـی چەکیشیان پێیـە. ژیرانـە گوتـی، "مـن تێگەیشـتم، هەسـتی ئێـوەم زانـی، مـن یارمەتیتـان دەدەم."

کەمـال بۆ یەکـەم جـار بەحورمەتـەوە سـەیری کرد و گوتـی، "هـەر ئـەوەم لـێ چاوەڕێ ئەکردیت."

"ئێوەش دەبێ یارمەتیم بدەن."

نەجم پرسیی، "چۆن؟"

"من نامەوێ خیانەت لە هاوڕێکانم بکەم."

کەمـال گـڕی گـرت، دەسـتی هەڵێنـا قسـەیەک بـکات، نەجـم دەسـتی گـرت و گوتـی، "تـۆ خیانـەت ناکـەی، ڕاسـتی ئەڵێـی، تەنهـا شـوێنەکەیانمان نیشـان ئـەدەی، تەنهـا پێمـان ئەڵێـی لەکوێـن، تـەواو کارێکـت نامێنـێ. لـە سـڕینەوەی خراپـەدا بەشـداری ئەکـەی، تـەواو."

سـەردار بـە وریاییـەوە گوتـی، "دیسـان یارمەتـی ئێـوەم پێویسـتە، یارمەتیـم بدەن، مـن شـوێنەکەیان نازانـم، کاتـم بدەنـێ مـن دەتوانـم بیاندۆزمـەوە."

نەجم ڕووی لـە کەمالی بـەزاز کرد و گوتـی، "با ئەمڕۆ بۆ ئـەو بێـت، ئێمـە سبەینێ دێینـەوە."

پشـتیان لـە سـەردار کـرد، نەجـم بەسـرتەوە بـە کەمالـی گـوت، "کاری ئێمـە ئێسـتا دەسـت پـێ ئـەکات، دەبـێ چاودێـری بکەیـن، ئەشـێ بچـێ ئاگاداریـان کاتـەوە، باوەڕیـان پـێ ناکـرێ."

ئـەو کاتـەی ئـەوان هاتـن سـەردار تـازە لای نیان و سـەروەر گەڕابـۆوە، شـەربەت و پاقـلاوە و میـوەی بـۆ بردبـوون. کـە ئـەوان ڕۆیشـتن و دوای ئـەوەی هەڕەشـەیان لـێ کـرد و ئەویـش

بـە فێڵ مۆڵەتـی ڕۆژێکـی لـێ وەر گرتـن، بڕیـاری دا بـڕوات، بڕوات و خـۆی بۆ هەمیشـە لـە بەسـڕە بشـارێتەوە، نـا بەسـڕا نـا، لای دۆسـتەکەی زیندانـی لـە دیوانییـە، لەگـەڵ ئـەو بچێـت بۆ چبایـش، لەنـاو بەلـەم و خانـووە قامیشـەکانی سـەر ئـاوی هـۆڕەکان لەگـەڵ شـیوعی و سـەربازە ڕاکـردووەکان لـەوێ خـۆی بشـارێتەوە. ئـەو زۆری هـەوڵ دا تـا خـۆی لـە بەعـس بدزێتـەوە، بـە بیانـووی کارکـردن و نەخۆشـی و وازهێنـان لـە سیاسـەت لـە قەمبـەر عەلی خۆی پەنا دابوو، بـەڵام خۆدزینەوە لە بەعس ئاسـانترە لـە خۆدزینـەوە لـە دوو کوردی تۆڵەسـتێنی عاشـقکوژ.

تاوانـی نیـان و سـەروەر گەورەتـر بـوو، تاوانێکـی سیاسـی نەبـوو، هەوڵیـان نەدابوو تـا دەسـەڵات بڕوخێنن، تـا بـە گرتـن و کەلەپچەکردن و هەڵواسـین و نینـۆک دەرهێنـان یـان پاکانەکردن و بوونـە پیـاوی ئـەوان ڕزگاریـان بـێ، نـا سـزای تاوانـی ئـەوان تـا مردنـە. پەشـیمان بوونـەوە و پاکانەکـردن و تۆبەکـردن لـە عەشـق ڕێـگا پـێ نـەدراوە، کـەس بـاوەڕ بـە عاشـقێک نـاکات پاکانـە لـە عاشـقەکەی بـکات. لـە سەرانسـەری وڵاتـدا، لـە نـاو دڵ و هەسـتی تاکـە تاکـەی کەسـەکاندا، تەنهـا عەشـق تاوانێکـی بێلێخۆشـبوونە. کـەس بەرگـەی برینـی عەشـقی سـەر دڵـی کچەکـەی ناگرێ، باوکێـک نییـە بتوانـێ برینی عەشـقی کچەکـەی خـۆی ببینـێ، یـان هـەر سـەیری کردبـێ، نـا، بـاوک نابـێ سـەیری بـکات دەبـێ پێـش دیتنـی پاکـی بکاتـەوە. مێـژووی ئـەو گەلـە هەرگیـز ڕێـگا بـەوە نـادات باوکێـک، عەشـق لەنـاو چـاوی کچەکـەی ببینـێ و نەیکوژێ. ڕەونەقـی عەشـق لـە چـاوی کچـدا تاکـە گوللەیـە بێدەنـگ دڵـی بـاوک کونکـون دەکات.

لەو خەیاڵاتانەدا بوو نەجم گەڕابۆوە لای سەردار و پێی گوت، "هەوڵ نەدەی خۆت بدزیەوە، ئێستا متمانەت پێ ئەکەم و جێت ئەهێڵم، بەڵام دوایی دڵنیا بە لێت خۆش نابم."

سەردار دوور لە چاوی کەمالی بەزاز گوتی، "باشە بۆ ئاوا ئاگرت گرتووە! ئەو کوڕ و کچە عاشقی یەکترن؟"

نەجم سڵەمییەوە وەک سوژنێک بە لووتیدا کرابێ، یان سینگی ئاگری گرتبێ، گوتی، "تۆش باوەڕت بەو قسە قۆڕانە هەیە؟ عاشق! ئەو کەسانەی بەفاڵ دێن و ڕێگای بێشەرەفی ئەدۆزنەوە، ئەو وشە هیچەیان داهێناوە. تۆ خۆت لەو کارە وەر مەدە."

***

چبایش گوندێک لەسەر ئاو، گوندێک لە قامیش و زەل و سەعف، تاکە جێگا بوو بۆ خۆپاراستن بە دڵی سەرداردا دەهات، تا بۆ هەمیشە خۆی لێ بشارێتەوە. گوندی ناو دڵی تاریکی و ڕەشاییی سەر ئاو، خەڵک هەیە لەوێش ڕزگاری نەبووە، لەوێش زۆرێک لە ماڵە قامیشەکانی سەر ئاوی هۆڕەکە سوتێنران. بەڵام ئەو دەتوانێ، سەردار دەتوانێ یەک ساڵی تەواو خۆی لەبن تاقە قامیشێک بشارێتەوە، خۆ کە بولبولێکی بیابان جارێک لەسەری بخوێنێ کەیفیش دەکات، تەنها بۆ ئەوەی تاوانی ئاشکرا کردنی ئەو عاشقانەی نەچێتە گەردن.

پێش ئەوەی نەجم بگاتەوە کەمال کە لەسەر سووچەکەی ئەوبەریانەوە وەستابوو، سەردار سووڕایەوە و ڕۆیشت،

پێش ئـەوەی ئـەوان فریـا بکـەون بـە ئەمنـە عەرەبەکـە بڵێـن، "چـاوی لـێ نەخافڵێنـی."

سـەردار خـۆی ڕزگار کـردووە دەتوانـێ بـڕوات، بـڕوات و لـە چبایش خـۆی بشـارێتەوە، بـۆ شـوێنێکی نادیـار بـڕوات، هـەر واشـی مەبەسـتە، بـەڵام خەمێـک، قورسـاییی تاوانێـک خـۆی بـە دڵیـەوە هەڵواسـیووە، سـەرەتا نەیزانـی ئـەو قورساییيەی سـەر دڵـی چییـە، تـا زانیـی، تـا هـەڵی هێنـا خەریکـی چ تاوانێکـە خەریـک بـوو شـێت بـێ.

"خۆشـاردنەوە، پشـتکردنە کوشـتنی دوو عاشـق، تەنهـا بـۆ خۆڕزگارکـردن کارێکـی ترسـنۆکانەیە."

"خیانەتە لە هاوڕێیەتی."

تا توانی جرتیکی بۆ خۆی لێ دا.

"خیانەت کاری تۆ نییە."

سەردار لە دڵەوە هاواری کرد، "کام خیانەت؟"

"برادەرەکانـت، کچـە دڵپاکەکـە، هـاوڕێ دڵشـکاوەکەت لـە ژیـان، بـۆ مـردن جـێ دێڵـی؟"

ئـەوە دەنگـی دڵـی بـوو. ئـەوە چ دەنگێکـی شـوومە خەریکـە ناخـی سـەردار هەڵدەتەکێنـێ؟ ئـەوە چ ژەهرێکـە لـە دەروونیـدا دەگـەڕێ و ناهێڵـێ ئـارام بـێ؟

سـەردار بـە هەمـوو دەنگـی هـاواری کـرد، "جارێـک گەلەکـەم لەخاچـم دەدات و جارێـک هـاوڕێ عاشـقەکانم پانـم دەکەنـەوە. من چیـم خوێڕییەک کە ژیانـی خـۆی لـێ بەڵایـە."

بە خۆی گوت، "هێمنتر"

"نیـان چییـە؟ پەڕەسـیغارێکی بێبەرگـری، ئاگـری جگەرەیـەک کونکونـی دەکات چ پێویسـتی بـە چـەک و گوللەیـە."

دیسانەوە سەروەر و نیانی هاتنە بەرچاو، لەناو خانوویەکی قامیش لەسەر ئاوی زۆنگاوێک، نیان وا دانیشتووە لاقەکانی بخاتە ئاوەکەوە، سەروەر سەهمێکی پێیە نیشانە لە ماسییەک دەگرێتەوە، لەپڕ خانووەکەیان ئاگر دەگرێت و هاواری ئەو دەکەن.

"سەردار هاوڕێکەم، هەر چوار دەورم ئاگرە ڕزگارم بکە".

ماڵی لە قامیش بە خولەکێک دەسوتێ و ئاسەواری نامێنێ، تەنها ماڵی عاشق زووتر لە ماڵی قامیش دەسووتێ. ماڵی نیان لە قامیش بوو، قامیشێک گڕی گرتبێ. نیان خۆی هەڵدەدات، خۆی هەڵدەدات و شڵپە لە ئاوەکە دێنێ. سەردار بەنیگەرانییەوە دەپرسێ،

"بۆچی دەبێ هەمیشە بۆ ڕزگارکردنی گیانێک، گیانی من ببێتە بارمتە؟"

دەبێ بچێ ئەو کوڕ و کچە لە مەترسی ژیانیان ئاگادار بکاتەوە و هاوکاریان بێ، خەیاڵێکی خۆشی بۆ هات، "ئەوانیش دەبەم، ئەوانیش لەگەڵ خۆم دەبەم بۆ چبایش، بابنە ماسیگر، با نیان لەجیاتیی بامیە ماسی وشک بکاتەوە،" تەنها عەشق دەتوانێ هەموو شتێکت لێ بستێنێتەوە، هەموو شتێکت لێ بستێنێتەوە و هیچیشت نەداتێ و سەرکەوتووش بێ. عەشق باوک، برا، ئامۆزا، سلێمانی، بەڵقیس، هاوڕێکانی سەردەمی قوتابخانە، بەفری گوێژە، پیاسەی تووی مەلیکی ئێواران، قاورمەی نۆک و هەموو شتێکی لە نیان ساندبۆوە، هیچیشی نەدابوویە، هەر هیچ کەچی لە لووتکەی سەرکەوتنیشدا بوو.

***

هەموو شتێک بۆ سەروەر گۆڕا، ڕەنگی دنیا سوورێکی تۆزاوی بوو، وەک ئەو چاوانەی لە بێخەوی و تۆزدا سوور هەڵدەگەڕێن، "دیارە سەردار بۆیە بانگی کردووە و بۆ ئەو کتێبخانە دوورە تا نیان تەنها بمێنێتەوە و زەفەری پێ بەرن." ئەوە چ وەفا و خۆشەویستییەکە، چ داد و کەرامەتێکە، کچەی عاشقت بە قسەیەکی فێڵبازانە بەتەنها جێ هێڵی، لە کاتێکدا ئەو هەموو دنیای بۆ تۆ جێ هێشتووە.

هەر بەدەم گەڕانەوەوە، زیڕەی نیان لە ناخیدا دەنگی دایەوە، لە نەبوونی ئەودا هاتوونە سەری و هەموو شتێکیان بەچاودا داوەتەوە، "بێشەرم، بێحەیا، کەرامەتی براکانت فرۆشت، قەحبەی ڕووڕەش،"داغیان کردووە، سەریان بە دیواردا کێشاوە، دواتر دەماری دەستیان بڕیوە و بۆ مردن جێیان هێشتووە، هەرگیز مردن بۆ سەروەر کێشە نییە، مردن بۆ سەروەر چارەسەرە، بەڵام ئەو کە تا ئێستا نەمردووە تەنها لەبەر ئەوەیە نەیتوانیوە بەتەنها بمرێ. مردن تەنها، بەتەنێ، کارەساتە. چۆن نیانی جێ هێشتووە بەتەنها بمرێ؟

جگە لەوەش سەروەر دەیەوێ بۆخۆی بمرێ، بۆخۆی بڕیار بدات، بۆخۆی خاڵێک لەدوای زەمەنەوە دانێ، نەک یەکێک زەمەنی لێ بستێنێتەوە.

دەبێ سیمای خۆی بگۆڕێ تا لە کاتی چوونە ژوورەوە بۆ ئوتێلەکە کەس نەیناسێتەوە، لە ڕێگای خۆی شەپقەیەکی خڕ و چاویلکەیەکی ڕەشی کڕی. سەیری بەردەم ئوتێلەکەی کرد هیچی نامۆی نەدی، لە دەرگای پشتەوە چووە ژوورێ، بەبێ ئەوەی خۆی لە کابرای پێشوازییش ئاشکرا بکات. سەر کەوت.

نیان ئارام بوو، ئەو کاتەی سەروەریان بانگ کرد و زانیی سەرداره ئارام بوو، دەیەوێ لێیان دڵنیا بێتەوە. باشە سەردار بۆ ئەوەندە بەدوامانەوەیە؟ بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی، "دەشێ چاوی هەر لەسەر بێ، ئەو سەرسەریەش کوڕێکی شیرینە." دوێنێ پێویست بوو بێت، ئەمڕۆ بۆچی؟ بۆ ئەوەندەیان پێ چوو؟ دەبێ بەفێڵوتەڵەکە سەروەریان نەبردبێ؟ دەبێ بۆ منیش نەیەن؟

هەموو شتێک بوو بە دوژمنی. جووڵەی پەردە، دەنگی بای سەر پەنجەرەکە. هەموو شتێک بوو بە دوژمنی، دەرگا و پیادەڕۆی ڕاڕەوەکە. باشە سەروەریان بۆکوێ برد؟ من چاوەڕێی چی بم؟ لەسەر لێواری سیسەمەکە دانیشت، "بۆکوێ چوویت. بڕیار بوو تەنها جێم نەهێڵی!"

دەنگی دەرگاکە هات، کلیلەکە هێواش بادرا، "ئەو ئاوا بە دزی و سرتەوە دەرگا ناکاتەوە. دەبێ کلیلەکەیان لێ ستاندبێ،" چووە پشت دەرگاکە، تا کە دەرگاکە کرایەوە ئەو یەکسەر ڕاکاتە دەرێ، لێواری شەپقەیەک، ڕۆحی نیان هاتە سەر لووتی، چاویلکەیەکی ڕەش، سەروەر بۆ ئەوەی ترسی بڕەوێنێتەوە و ژوورە کپەکە بشلەقێنێ و خۆی ئاشکرا بکات، گۆرانییە کۆنەکەی گوتەوە، "با لەسەر تۆ بمکوژن وەک کابرای لە بازاڕی." تەنها دەنگ ترس ڕیشاڵ ڕیشاڵ دەکات و لەناوی دەبات.

چوونە باوەشی یەکتر، بەتوندی، وەک ئەوەی تازە لە مردن گەڕابنەوە، وەک ئەوەی نیوەی دنیا سەروەر پاڵ پێوە بنێ و نیوەکەی دیکەی نیان. دەستیان بەتوندی لە یەکتر ئاڵاندبوو، نیان پرسیی، بەنازەوە پرسی، "جارێکی تر بەتەنها

مەرۆ، سەردار کاری پێت بوو، بۆچی بانگی کردی؟" ئەو تەنها نامەکەی دایکی نیشان دا کە سەردار خستبوویە باخەڵیەوە، نامەکە یەک تاکە ڕستە بوو.

"خۆتان ون بکەن، بتاندۆزنەوە دەتانکوژن."

هەردووکیان ترسان، هەڕەشەی مەرگ لە بەردەرگایە، ئەو کەسانەی تفەنگیان بەرامبەرە لێی ناترسێن تا نەتەقێ، دەنگەکە دەنگ و دەنگدانەوەکە ترسناکترە، نیان بەدوای ئومێدێکدا سەیری چاوەکانی سەروەری کرد، چاوە ڕەش و گەورەکەی یەکەم جار دیبووی، پرسیی، هیچی تری نەوت؟ سەردار باسی هیچی تری نەکرد؟"

سەروەر وەک بەردێک ئاوی گەرم نەیسووتێنێ، گوتی، "ئەو زیاتر دەزانێ، ئاگاداری شتی زیاترە."

نیان پرسیی، "چیتر دەزانێ؟ وەک چیی تر دەزانێ و نایڵێ؟"

سەروەر هێمنتر، "دەبێ لەگەڵت ڕاستگۆ بم، شتی مەترسیدارتر دەزانێ، نایەوێ بیڵێ، دەترسم ئاشکرامان بکات. من لە هەموو ئینسانێک بەگومانم."

سەیرێکی قووڵی نیانی کرد، "تۆ ئینسان نیت، تۆ تەنها ڕەنگ و جوانی و پاکیت، تۆ نووری، بۆ ئەوەی ژیانی تاریکی من ڕەنگ بکەی، بۆ ئەوەی ژیانی من ڕووناک بکەیەوە هاتوویە دنیاوە."

نیان دەیویست ئینسان بێ، هەوڵیشی دابوو، شانبەشانی دایکی بڕوات و ئاوڕ لەو کوڕانە نەداتەوە تانەوتەشەری شیرینی لێ دەدەن. دەیویست لە باخچە بێت و پەپوولەیەکی شین بە نیشانەی وەرزی عەشق بزانێ، حەزی دەکرد

نەیەت، ئەو پەپوولە نەیەت. چاوەڕێکردنی پەپوولەی عەشق و نەهاتنی زۆر بەختەوەرانەترە لە هاتنی. پەپوولەکە بێت و وەرزی عەشق نەیەت، ئاخر هەموو وەرزەکە ئەوەندەی باڵلێکدانی پەپوولەیەک شیرین نییە. ئینسان بێت و لەسەر شووشتنی قاپەکانی دوای نانخواردنی ئێوارە لەگەڵ میدیا و پەریخان و لەیلا سەد جنێو بەیەکتر بدەن. ئینسان بێت و بەپێخواسی بەناو لم و خۆڵدا بڕوات، با گەرم گەرم بێت و داغی بکات، هەموو جەستەت داغ بکرێت و بەس دڵت داغ نەکرێ.

***

هەر ئەو ڕۆژە هەموو شتێکیان بۆ ڕوون بۆوە، ترس دنیا سەد جار ڕوونتر نیشان دەدات. تەلەفۆنەکەی سەرداریش بەتەواوی داگیری کردن، "نیوەی سلێمانییان هێناوەتە سەرتان، یەک پارچە هەڕەشە و ئاگر و تۆڵەکردنەوەن. لە هەموو شوێنێک بەدوای منەوەن، من خۆمیان لێ ون دەکەم، دوای ئەوەی تۆم جێ هێشت لە دوکانەکە منیان دۆزییەوە، فێڵێکم لێ کردوون، من دەتوانم خۆمیان لێ ون بکەم، ئەی ئێوە چۆن؟ بەرنامەتان چییە؟ ناتوانم سەرتان لێ بدەم، دەترسم شوێنم هەڵگرن و ئێوە ئاشکرا بن، هەرچەند گومانم هەیە، بۆخۆیان دەتوانن بتاندۆزنەوە، باوکی بۆتە چەقۆ و خەنجەر و شمشێر، پیاوم نەدیوە ئاوریشم بفرۆشێ و ئەوەندە ئاگر بێت. نازانم چۆنە قوماشەکانی بە دەستیەوە ناسووتێن. یەک-دوو جار تا نزیک ئوتێلەکەش هاتووم، نەمتوانیوە بێمە ژووری. وەک

گورگی بریندار وان بۆنی خوێنی نێچیرەکەیان دەکەن، بۆنی خوێنی نێچیرە بریندارەکەیان لە هەموو شوێنێ دەکەن، بۆکوێ دەڵێن دەتانبەم، دەتانبەم بۆ گوندێک لەو خوارووی عێراقە، بۆ ناو زۆنگاو و هۆڕ و قامیشەڵان. هەرچی ئێوە بتانەوێ، دەبێ ون بن، بۆ هەمیشە ون بن."

سەروەر گوتی، "من ناتوانم، من ناتوانم خۆم بشارمەوە."

"ڕاستە ئێوە ناتوانن خۆتان بشارنەوە، بۆنی عەشقی ئێوە تەواوی شەقامەکانی بەغدای داپۆشیوە، مامۆستا و قوتابییەکانی ئاداب هەموویان بۆنی عەشقی ئێوەیان لێ دێت. ژن و پیاوە پیرەکانی سەر عەرەبانە لە وەزیرییە وا دەزانن سەرەتای ژیانیانە جارێکی دیکە عاشق بوونەوە، ژن و پیاوێکی بەتەمەن هەن، لەپشت دادگای ئەعزەمییە سەربان و حەوشە و سەر شەقامەکانیشیان کردووە بە گوڵی سوور، هەموو دنیا بۆنی عەشقی ئێوەی لێ دێ. دوو هەرزەکارە ماسی گرەکە، زێڕنگەرەکانی شەقامی کچانی بەغدا، مامۆستا بوغزنەکانی بەشی فارسی، چایچییە ترنەکە هەموویان دڵداری و ئەڤین بۆتە ئیمانیان. دەبێ لەو شارە خوێن بڕژێ تا شەڕیان بەبیر بێننەوە، لەبیرت نەچێ ئەوانەی داری عەشق دەڕوێنن زۆر کەم لە بەرەکەی دەخۆن."

سەروەر دەستی نیانی گرت، سەری بە سینگی خۆی کرد. ترس لە چاوی سەوزدا شتێکی دیکەیە.

"کە ئێرەشی نیشان نەدابن، بە هاتنی بۆ نزیک ئێرە، ئێمەی بۆ ئاشکرا کردوون، ئێستا ئێرەیان گەمارۆداوە، دەشێ بە پارە بە هۆی ئەمنەکانەوە، پاسەوان و کارمەندەکانی

ئێرەش ڕازی بکەن و بۆمان بێنە ژووری. با کلیلەکە بخەمە ناو کێلۆنەکە تا لەودیوەوە نەکرێتەوە."

ڕاکشان بەبێ ئەوەی بتوانن بۆ یەکتریش بڕوانن، ڕاکشان لە بە تاڵاییەکی بێئامان و وەڕزکەردا ڕاکشان، سەیری بنمیچی ژوورەکەیان دەکرد، تەنها دیل دەزانێ بنمیچەکان چەند نزمن، تەنها عاشقی دیل دەزانێ ئاسمانی وڵات چەند نزمە و هەرگیز پشتی تێدا ڕاست نابێتەوە. هەموو دەنگی دەرگایەک، بانگ و هاوارێکی ڕاڕەوەکە ڕای دەچڵەکاندن. هەر وەک چۆن سەیری بنمیچەکەی دەکرد، سەروەر، بەبێ ئەوەی ڕووی تێ بکات، گوتی، "ناتوانم جێت بهێڵم."

نیان پرسیی، "بۆ دەتەوێ؟"

سەروەر گوتی، "بەڵێ."

نیان دڵی شکا، ئەو جارەش مێرگی خیانەت، بەڵام نەجووڵا، گوتی، "هەر وا ئاسان؟"

"ئاسانتر، دەمەوێ جێت بهێڵم و بڕۆم، بڕۆم و هەرگیز نەگەڕێمەوە، نەدەکرا من عاشق بم، خیانەتی عەشق من لەتلەت دەکات، دەمەوێ بڕۆم و شوێنەواریش جێ نەهێڵم، تاکە هەڵە منم، من هەڵەیەکی زەقم بە ناوچاوانی ژیانەوە، دەمەوێ بڕۆم و بۆنیش جێ نەهێڵم، سووم لە هیچ نییە، هەست بەوە ناکەم غەدرم لە کەس کردبێ، باری سەر شانی ئەو شارەش سووک دەکەم، تەنها ئەوەی لێی دەترسم تۆی، تۆش نا، خۆشەویستانت، ئازیزانت دەترسم ئازارت بدەن، دەترسم ڕقی منیش بە تۆ برێژن، لەگەڵ هەموو ئازاردانێکی تۆ من ڕادەچڵەکێم، لە هەر شوێنێک بم، لەبن عەرز، لە

ئاسمان، لە قووڵاییی ئاوەکان، لەگەڵ هەموو فرمێسکێکی تۆ، لەگەڵ هەموو هاوارێکی تۆ من ڕادەچڵەکێم، من ڕادەپەڕم. من بەدوای ئارامیدا دەڕۆم، من دەمەوێ جێت بهێڵم، بۆ هەمیشە جێت بهێڵم و ئاوڕ نەدمەوە، من دەمەوێ بمرم، هەر ئێستا، هەر ئەم شەو بمرم. من پێشتریش مردبووم، عەشق مۆڵەتێکی کاتی دامێ، بەڵام ناتوانم، ناتوانم بەتەنها بمرم، ناتوانم بەتەنها ئاسوودەیی بۆ خۆم هەڵبژێرم، تۆش تەسلیمی نادیار بکەم، ناتوانم خۆم تەسلیمی حەقیقەت و تۆش تەسلیمی باتڵ کەم. خۆم تەسلیمی ئارامی و تۆش تەسلیمی تۆفان بکەم."

نیان پرسیی، "بمری؟ خۆت تەسلیمی مردن بکەی؟"

"زەمەنێکە دەمەوێ بمرم، نازانم بۆ چاوەڕێم دەکرد. مردنیش بەتەنها چارسەرە. من گوتم پێ لەناو لیتاوی ژەهری من مەنێ. دەروونی من یەک پارچە ژەهرە."

نیان گوتی، "نا تۆ ئارام و ئاسوودە بووی، تۆ بە هۆی منەوە کەوتیتە ناو مەترسیەوە."

سەروەر گوتی، "مەترسی گەورە هەڕەشەکانی باوک و براکانت نییە، هەڕەشەی زانکۆ و سەرۆکی بەشی فارسی نییە لە ئێمە و لە خۆشەویستی، نا هەڕەشەی گەورە بەعس و ئەشکەنجە و شەڕ نییە، مەترسی هەرە گەورە، هەڕەشەی هەرە گەورە ژیانە. ژیان بۆخۆی هەڕەشەی هەرە گەورەکەیە، دەستگرتنی ئێمە نەبێ بە ژیانەوە کەس ناتوانێ بمانترسێنێ. من لە مردن ئازاترم، چونکە من ژیانم ڕەت کردۆتەوە. کەس ناتوانێ شلوێم بکات، کەس ناتوانێ بێتە ناو جیهانی منەوە."

نیان پرسی، "ئەی من؟"

"من چارەسەری هەردووکمانم هێناوە، هەرگیز ناتوانم تۆ لەبیر کەم، ناتوانم بێ تۆ سەیری هەلاتنی خۆر بکەم. بێ تۆ ناتوانم سەیری پێکەنینی منداڵێک بکەم، ناتوانم سەیری فیلمێک بکەم، ناتوانم بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن بێ تۆ ببینم، هەستم بێ تۆ چۆڵە، بەتاڵە، وێرانەیە، لە منداڵیمەوە هەستم کردووە لەتەنیشتمەوە شوێنێکی چۆڵ بۆ تۆ هەیە. هەموو ئەو فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنیانەی بەتەنها دیومن، هەموو ئەو ڕۆمان و کتێبانەی بەتەنها خوێندومنەوە بەتەواوی لە مێشکی خۆم سڕیونەوە، نامەوێ شتێکم هەبێ هیی تۆ نەبێ، ئەو کاتانەم بە کاتی لەدەست چوو داناوە. کاتە خەساربووەکانی تەمەنم، نامەوێ یادەوەریەکم هەبێ هیی تۆ نەبێ."

"من لەو ڕۆژەوە هەم کە چوومە ناو ژیانی تۆوە."

"دەشێ هەر پێکەوە بین و هێمنتر بژین؟"

"چۆن؟"

"من حسابی هەردووکمانم کردووە، ژەهرم بەشی هەردووکمان هێناوە."

نیان ڕاچڵەکی و پرسیی، "ژەهر؟"

هەستا و لەسەر سیسەمەکە بەوێڵی دانیشت. دووبارە گوتی، "بەشی هەردووکمان."

سەروەر وەک وانەیەکی بیرکاری شیکار بکا گوتی، "من لە مشک زیاتر ژەهر دەناسم. دکتۆرەکان دەڵێن بۆ هەندێ نەخۆشی بەسوودە، بەلام سوودی گەورەی ژەهر لەناوبردنی ژیانە. لەناوبردنێکی بێئازار، ئەوەیان تەنها من

دەزانــم. وەرە بەڵێنــم پــێ بــدە ئێمــە لــە ترســی بــاب و بــرا و دەمانچــە و گوللــە خۆمــان ناکوژیــن، نــا هەرگیــز، ئێمــە بۆیــە خۆمــان دەکوژیــن و ژەهــر دەخۆینــەوە تــا پێکــەوە بیــن، تــا زەمــەن ڕاگریــن. بــا لــە تەمەنــی ئێمــەدا زەمــەن ڕاوەســتێ. هــەر لەســەر ئــەو جێگایــە، پێکــەوە ژەهرەکــە، یــان ئــەو دەرمانــە فریادڕەســە، ئــەو ئەبەدیبەخشــە دەخۆینــەوە. وەک ڕزگارکــەر جوانــی و عەشــق و پاکیمــان دەیخەینــە ســەر زمانمــان، یــان وەک ئــەو گەنجانــەی یەکــەم جــارە عــەرەق دەخۆنــەوە لووتمــان دەگریــن و هەڵــی دەدەیــن، ڕادەکشــێین، دەســتی یەکتــر دەگریــن و ســەیری چــاوی یەکتــر دەکەیــن. قووڵتریــن ســەفەر ئــەو سەفەرەیە بە چاو دەکرێ. من بەرنامـەی ئەوەشـم داناوە من بە دوو چاوی کەسـکدا، بـە دوو چـاوی پڕشـنگدار و کەسـکدا کـۆچ دەکـەم، بـۆ سـەر زەمینێکـی دیکـە، بـۆ جیهانێکـی دیکـە، کـە هیچـی لـەو جیهانـە پۆخـڵ و نەخۆشـە ناچـێ، کـە هیـچ لـەو زەمەنـە پەرکەمگرتـووە ناچـێ. مـن ئـەو جیهانـە پەنهـان و نهێنییـە دەناسـم، مـن ئـەو جیهانـە دەناسـم، پێـم تـێ نـاوە و گەڕاومەتـەوە. ئـەو کاتـە نەمزانـی، بـەڵام ئێسـتا دەزانـم، وەک یەکێـک بچێتـە سـەفەر و ناسـنامەی لەبیـر چووبـێ، پاسـپۆرتی پـێ نەبـێ، وەک یەکێـک بچێتـە سـەفەر و خـۆی لەبیـر چووبـێ. ئـەو کاتـە نەمزانـی بۆچـی ڕێـی ڕۆیشـتنم نییـە، بـەڵام ئێسـتا دەزانـم، ئێسـتا کـە دەسـتم بـە دەسـتی تۆوەیـە دەزانـم تـۆم لەبیر چووبوو، نـەک لەبیر چووبـوو، تـۆم لەگەڵدا نەبوو، تـۆم نەبردبـوو، تـۆ لـە گـەروی ژیانـدا وەک دڕکـە ماسـی عاسـێ ببـووی، دەزانـم پاسـپۆرتی ڕۆحـی مـن تـۆی.“

نیان زمانی وشک ببوو، سەیری لێوە توێشکهەڵدراوەکانی سەروەری دەکرد، سەروەر بەردەوام بوو، "هەر ئاوا بەڕاکشانەوە، ژەهرەکە دەخۆینەوە، دەیخەینە سەر زمانمان، زمان بۆخۆی دەزانێ چی دەکات، زمان بۆخۆی دەزانێ بۆکوێی دەنێرێ، بەشێکی یەکسەر بۆ مێشک دەبات، ئەوەی دیکەی بۆ گەدە و ناو خوێن، بۆ هەناسە و سییەکان و بۆ ناو دڵ و شاخوێنبەر، بۆ سەنتەری مەرگ. عەشقی ناو دڵمان ئەو ڕەنگە زەردە سەنگینەی پێویستە، ڕەنگی زەرد مۆرکی ئەبەدی عاشقانە، نەک سوور. خوێن پەیامبەرە بەمتمانەکەی دڵ، ئەو ژەهرە زەردە ڕزگارکەرە لەسەر زمانەوە، لەناو موولوولەکانەوە یەکسەر دەبات بۆ دڵ، بۆ سەنتەری وجوودی ئەڤین، دڵ بەو ڕەنگە ئاڵتوونییە شاد دەبێتەوە، ئەو ڕەنگە زێڕ و سەرمایەی ڕاستەقینەی دڵە، وردەوردە خامۆش دەبێ، خامۆش دەبێ تا ئارامی بە خۆشەویستیمان ببەخشێ. خامۆش دەبێت و دەچێتە سووری گەردوونی ئەبەدییەوە.

دڵی عاشق هەموو ڕەنگەکانی هەیە، هەموو ڕەنگەکان هەرچەند زۆر بن، بەبێ ئەو ڕەنگە ناتەواون، بەبێ ئەو ڕەنگە زەردە مەیلەوسەوزە سەنگینە ناتەواون. من و تۆ، لەگەڵ ژەهری ڕزگارکەر و عاشق، جەستەمان لەسەر ئەو ئیسفنجە ئینسانگر و عاشقکوژە جێ دەهێڵین، لەسەر ئەو سیسەمە خوێنتاڵە جەستەمان، بەتەنها، بەبێ عەشقی ئەبەدی جێ دەهێڵین، بۆ ئوتێلەکەی جێ دەهێڵین، بۆ خزمەکانی جێ دەهێڵین، بۆ پیاوە ئاگرەکانی جێ دەهێڵین، ئێمە پێویستمان بەو جەستە قورسانە نەماوە، تازە تەواو کاری جەستەمان

تەواو بوو، جەستەمان ئەرکی خۆیان گەیاندە جێ، بە یەکتریان گەیاندین، ئێستا ئەو جەستە قورسانە لەسەرمان بارە، بۆ ئەوەی بۆ ئەبەد بەیەکتری بگەین دەبێ لەوان ڕزگارمان بێ، با هەر بۆ ئەوان بێ، با بێن و هەزار گوللە لە جەستەی بەتاڵ لە خۆمان بدەن، با یەکێ هەزار گوللەمان لێ بدەن (تاڵترین پێکەنین، پێکەنین) جەستەیەکیان بۆ جێ دەهێڵین خوێنیشی لێ نەیەت، جەستەیەک پڕ لە ژەهر (تەنها جەستەیەک بکوژەکەی وێران دەکات کە خوێنی لێ نەیەت) با چەند گوللەیان پێیە لە جەستەی ئێمەی بەتاڵ بکەن، دڵۆپە خوێنێکیان لێ نایە، جەستەی بەتاڵ لە خۆمان."

سەروەر تۆزێک وەستا، دوو شووشەی بچوکی لەسەر مێزەکە دانان، گوتی، "تەنها ئەو کەسانەی بۆخۆیان خاڵێک لەدوای زەمەنەوە دادەنێن و بەرەو مردن دەچن، تەنها ئەوان جەستەیان تەسلیم دەکەن و بۆخۆیان دەگەڕێنەوە."

نیان وەک لە خەودا بێت پرسیی، "جەستەمان خوێنی لێ نایەت."

سەروەر هەردوو دەستی نیانی توند گرتبوو، پەنجە کاغەزی و باریکەکانی ماچ دەکرد، گوتی، "نا خوێنی لێ نایەت، من و تۆ و عەشق، هەرچی زیندوویەتی جەستەمان هەیە، هەرچی جوانی و هێزمان هەیە، لەگەڵ خۆمانی دەبەین. جەستەیەکی قورس بە قورقوشم و زبڵی ژیانیان بۆ جێ دەهێڵین. دوو جەستەی زەرد و سەوز هەڵگەڕاویان بۆ جێ دەهێڵین. ئێمە، من و تۆ و عەشق، سێبەری دڵێکیش وردەوردە بەرز دەبێتەوە، وردەوردە لەو جەستە پرکێشەیە جیا دەبینەوە."

نیان پرسیی، "بەرز دەبینەوە، سێبەری دڵێکیش؟"
لەو کاتەدا چاوی لەسەر بنمیچەکە نەدەتروکاند.

"بەرز دەبینەوە، وەک هەڵمێکی پڕ لە نوور بەرز دەبینەوە، لەو کاتەدا، هیچ بەربەستێک بۆ ئێمە نامێنێ، هیچ بەربەستێک ڕێگامان پێ ناگرێ. چیمەنتۆ و ئاسن و پۆڵاش ڕێگای ئێمەیان پێ ناگیرێ، کە بەرز دەبینەوە، دوو جەستەی زەرد، کە دەستیان وەک تەختە و دار تێک ئاڵاون، دوو جەستەی زەردی سەوزهەڵگەڕاو وەک توولی دارمێو تێک ئاڵاون و بۆیان لێک جیا ناکرێنەوە، سەریان بەلای یەکتردا سووڕاوە، دەبینن، بۆخۆشمان ئەو دوو جەستە قورسانەی خۆمان دەبینین، وەک دوو کیسەی گەورە کە زبڵی ڕۆژگاری تێ کراوە دەبینن، لەسەر ئەو سیسەمە کە بۆ عەشق وەک گۆڕە وایە دەبینن. هەر چەند من حەز ناکەم جارێکی دیکە جەستەی خۆم ببینمەوە، با هیچ گرینگیەکی بۆ منیش نەمابێ."

نیان دووبارەی کردەووە، "با هیچ گرینگیەکی بۆ من نەمابێ."

وەک لە خەودا بێت سەیری پەنجەرەکەی کرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتیەوە، "بەرز دەبینەوە."

سەروەر گوتی، "هەرچوار تاکی پەنجەرەکە دەخەینە سەر پشت، تێگەیشتم، تۆ ڕاست دەکەی، با بە چیمەنتۆ و ئاسن و بلۆکدا نەڕۆین، لە پەنجەرەکەوە، من و تۆ و عەشق، شێوەی دڵێکی وەک دووکەڵی شین، لە پەنجەرەکەوە دەچینە دەرێ. بەسەر باخچە و ئاپارتمانە بەرزەکان و شەقامە جەنجاڵەکان

و کۆشـکە کوورەکانـدا دەڕۆیـن، ئەوەنـدە بـەرز دەبینـەوە، مـرۆڤ ئەوەنـدە بچـووک بێتـەوە نەیبینیـن. ئێمـە ئاسـوودەی دنیـای خۆمـان و ئەوانیـش ئاسـوودەی ئـەوەن کـە لاشـەی ئێمەیان دەست کەوتووە، هەرچەندە ئـەوان نازانن کە بەتاڵن لـە ئێمـە. ئـەوان نازانن کە لاشـەکان تەنها ئـەو شتانەیان تێدایە کە خۆیـان فڕێیـان دابـووە نـاوی."

نیـان گوتـی، "لـە چـواردە سـاڵیمەوە، لەوەتـەی خـۆم ناسـیوە، لـە دوور جەسـتەی خـۆم دەڕۆم، نەمدەویسـت ئـەو جەسـتەیەی دەبـووە جێـی توانـج و تانـە و سـەرنجی دەوروبـەرم مـن بـم. منیـش وەک خەڵـک سـەیری خـۆم دەکـرد، کەسـێک مـن، منـی وەک خـۆم نـەدەدی، هـەر سینگم و ڕانـم و چاوەکانـم سـەرنجی خەڵکیـان ڕادەکێشـا، هەتـا خێزانەکـەم، دایکـم، خزمەکانـم بـۆ چرکەیـەک گوێیـان لـە دەروونـم نەگـرت."

لەو کاتەدا نیان دەستی بەتەواوی جەستەی خۆیدا هێنا، بە ڕانەکانیدا، بە سکیدا، بە مەمکەکانیدا، لەگەڵ مەمکەکانی ڕاچڵەکا، وەک ئەوەی لە جەستەی خۆی بەئاگا هاتبێ، وەکو کونی مەمکی کرابنەوە، لافاوێک لە حەز و جنس و تێکەڵ بوون، لافاوێک لەسەر سیسەمەکەوە دەڕژایە ناو ژوورەکە، حەزی بیستویەک ساڵ تەنهایی و دڵشکان و بێبەشی ڕژایە سەر سینگی سەروەر، بە جۆرێک سەروەر لەو هەموو خۆشنوودییە سەرسام ببوو، وەک دوو مارمێلکەی سەوزی لووس تێک ئاڵابوون، وەک دوو کرمی چەور و لینج و تەڕ کەوتبوونە سەر یەک، هەرگیز دەست و لاقی یەکتریان نەناسییەوە.

ئـەو لافـاوە لـە پەنجـەرەی ئوتێلەکـەوە ڕژایـە خـوارێ، وەک

ئەو وێنانەی لە بانیژەی ماڵێکەوە، لە گوڵدانێکەوە، گوڵ بەسەر دیوار و شەقامدا دەڕژێ، ئاوا لە پەنجەرەکەیانەوە گوڵ، گوڵی سووری عەشق و لەزەت و جووتبوون، گوڵی مۆری وەفا و دڵسۆزی، گوڵی زەردی جیابوونەوە و ڕۆیشتن لە پەنجەرەی ئوتیلەکەوە، ڕژانە ناو باخچە و تەواوی کۆلانەکانی مەیدانی فیردۆس، تا شەقامی سەعدون و تا بە تاوین و هەموو بەغدای گرتەوە، ڕەنگی هەموو شتێکی گۆڕی تەنها ڕەنگی دوو شووشەی ژەهرە بچووکەکەی سەر مێزەکەی پێ نەگۆڕا.

سەروەر گوتی، "هەمان ئەو ژەهرەم پەیدا کردووە، کە گرووپە خۆکوژەکەی قەشە جیم جۆنسی ئەمریکایی بەکاریان هێناوە، ئەو خۆکوژییە بەکۆمەڵە شیرینترین مەرگیان هەبووە لە سەرانسەری مێژوودا، دەیان کەس ژەهرەکە بخۆنەوە و دەستی یەکتر بگرن و بەناو جەستەی یەکتردا بۆ ئەبەد بفڕن، یان دڵۆپ دڵۆپ بتوێنەوە."

کە سەروەر ئەو قسانەی بۆ نیان دەکرد ڕێک دەساڵ بەسەر خۆکوژییە بەکۆمەڵەکەی جۆنس تاوندا تێپەڕیبوو، لەو کاتەوە سەدان کەس لە کاتی جیاوازدا قەشەیان بەشاقەلی فشەوە دیتووە، لە ئاسمان پێش ڕەوەقازێکی ملدرێژ و لاقسوور کەوتووە. ئەوان لە ڕێوڕەسمێکی ئایینیدا بەکۆمەڵ لە ساڵی هەزار و نۆسەد و حەفتاوهەشتدا ژەهری دیازیپام و سیانیدیان خواردبۆوە. سەروەر تەنها سیانیدی تۆزی دەست کەوتبوو، بۆ ئاسانکاری نیانی خۆشەویستیی ژەهرە تۆزەکەی بە شەربەت گرتبۆوە، ئەو نەیدەویست

نووری چاوەکەی، هێزی هەناوەکەی لە ژەهرخواردنەوەشدا تاڵی بچێژێ.

ئەگەر هەزار ئەوەندەی دیکەش گوڵ لە عەشقی ئەوانەوە بەسەر بەغدادا بڕژێ، تەواوی وڵات غەرقی ڕەنگ بکات، هێشتا کار ناکاتە سەر ڕەنگی ئەو دوو شووشەیەی لەسەر مێزەکەی تەنیشتیانەوە چاوەڕێیان بوون.

لەتەنیشت شووشەکانەوە هەندێ ژەهری سیانیدی بەوشکی لەسەر پارچە کاغەزێک دانابوو. سەروەر گوتی، "دەتوانی بەبێ کەوچک، هەندێ هەنگوین بخەیتە سەر زمانت، جا تۆزەکە، یان قومێک لە گیراوەکە، هەم تامەکە خۆشتر دەکات، بە زمان هەستکردن بە تۆزی ژەهر، تاڵییەکەی فەرامۆشیت دەداتێ، بەرگەگرتنی تاڵیەکەی لە بەرگەگرتنی ژیان گرانتر نییە، من بەبێ هەنگوین، حەزم لە تۆزەکەیە، هەستکردن بەو تۆزە لەبن زماندا وەک هەستکردنی لمی کەنار دەریایە لەبن پێدا. هەم تامەکەی خۆشترە، هەم خێراتر و هەم مردنێکی بەتام دەبێ."

نیان سەیری ژەهرەکە دەکات، ئەوەی لای چەپیان بانگی کرد، بۆ ئەوەی ئازایەتیی خۆی بنوێنێ، بە دوو پەنجە هەڵی گرت و خێرا خواردیەوە، بەبێ ئەوەی چاو بکاتەوە تەواوی کرد، ئەوەی هەر بە خەیاڵ و وەک خۆڕاهێنان هێنایە بەرچاوی، بەڵام بەڕاستی دەستی بە کۆخین کرد. لەسەروەری پرسی، "ئەوانەی بە ژەهر خۆیان دەکوژن، ڕەنگی جەستەیان دەگۆڕێت بۆ سەوز، سەوز هەڵدەگەڕێن؟"

سەروەر گوتی، "سەوز نیشانەی ژەهراویبوونە، وەک

کەڕووی نان، ڕەنگێکی ناشیرین نییە، نانیش کە کەڕو هەڵدێنێ تەنها بۆ ئەوەیە حەقی فەرامۆشکردن و پشتگوێخستنی لە توخمی مروڤ بکاتەوە. نوورێکی سەوز بەسەر جەستە و ڕوخسارماندا دەڕژێ، بە جۆرێک هەتا ناتوانن دەست لە لاشەکانیشمان بدەن. ئەوەیە سەرکەوتن."

سەروەر دیسانەوە تاڵ پێکەنی.

وەختێک چووبوونە باوەشی یەکتری، سەروەر گوتی، "لەگەڵ یەکەم دەرکەوتنی تیشکی خۆر ژەهرەکە دەخۆینەوە."

نیان توند خۆی بە سەروەرەوە نووساند، گوتی، "تا ئەو کاتە تەمەنێکە."

دەشێ جارێکی دیکە خۆر لە بەغدا هەڵنەیەت.

# ١٤

سەردار چەند پاسێکی گۆڕی، هەستی نەکرد کەس بەدوایەوە بێ، تەنها گومانی هەبوو، گومانی هەبوو دەیان چاو چاودێری بکەن، دواپاس لە بەردەم گەراجی عەللاوی دابەزی، چووە کۆلانێک و بەلای چەپدا چووە کۆلانێکی دیکە، ئارامی نەما، خۆی دڵنیا کردەوە کەسی بەدواوە نییە، یان توانیویەتی خۆیان لێ بدزێتەوە، تاکسیەکی ڕاگرت و بەرەو سەرووەر و نیان بەڕێ کەوت، دوور لە ئوتێلەکە دابەزی، لە سووچێک وەستا و سەیری هەموو شوێنێکی کرد، هەموو لایەکی بەسەر کردەوە، هیچ شتێکی نامۆی نەدی، پاسێک لە بەردەم ئوتێلەکە وەستا، لەپشت پاسەکەوە خێرا چووە ژووری، کاتژمێر هەشتی بەیانییە، نایەوێ زەنگ لێبدات و خەبەریان بکاتەوە، با تۆزێک چاوەڕێ بکات، بەڵێنی بە کەمالی بەزاز داوە ئەمڕۆ شوێنی کچە عاشقەکەی پێ بڵێ، ئەوانیش چاوەڕێ دەکەن، لای دوکانەکەی ئەبو سەلام. چارەکێک وەک چارەکە سەدەیەک بەسەر سەرداردا تێپەڕی.

هەشتونیو چووە لای کوڕە قۆزەکەی لای تەلەفۆنەکە، بە کوڕەکەی گوت، "زەحمەت نەبێ زەنگێک بۆ برادەرەکانم لێبدە."

کوڕە دەیزانی بووک و زاواکەی ژوری حەوت سەد و حەوت دەڵێ، گوتی، "وازیان لێ بێنە، بووک و زاوان دەشێ هەڵنەستابن."

"درەنگە با هەستن."

"هەموو ڕۆژێ نابنە بووک و زاوا براکەم، یەک جارە، لەوانەیە تا بەیانی نەخەوتبن."

سەردار بۆخۆی دەستی دایە تەلەفۆنەکە، گوتی، "کارم پێیانە، با هەستن."

زەنگی تەلەفۆنەکە لە گوێی سەرداردا دەنگی دایەوە، بەر دیوارەکانی ژوورەکە دەکەوتن و دەگەڕانەوە، یەکەم زەنگ و دووەم و سێیەم، لە پێنجەمیش وەڵام نەبوو. شاگردەکە گوتی، "خۆیان باش هیلاک کردووە، وا زوو هەڵناستن."

سەردار نەیتوانی هاوبەشی گاڵتەی شاگردەکە بێ، لە هەمان کاتدا سەددڵ بوو، ویستی زەنگ لێبداتەوە، سەد جار زەنگ لێبداتەوە، تا نەک ئەوان هەموو بەغدا بەئاگا بێنێ، مەترسی نووکی پێڵاوە بزمارییەکانی لە ناخی دڵی چەقاندبوو، نەدەبوو ئەوە ببینێ، لەودیو پەنجەرەکەوە لووتە درێژە داکەوتووەکەی نەجمی ناسییەوە، لەپشت ئۆتۆمبیلێکی ڕەشەوە خۆی مەلاس دابوو، سەردار زانیی هەر بەدوایەوە بوون، ئێستاش چاوەڕێی هاتنە دەرەوەیان دەکەن، دەشێ خەڵکی دیکەشیان لەگەڵ بێت و لەولاولا خۆیان پەنادابێ. سەردار شەرمەزار بوو، شەرمەزاری ئەوەی بەبێ ئەوەی

مەبەستی بێت عاشقەکانی ئاشکرا کردووە، بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت خوێنی ئەوانی هاتۆتە ئەستۆ، قورسی تاوان تەنها تاوانبار دەتوانێ هەڵی گرێ.

"دەشێ وا نەبێ، دەشێ بە هۆی برادەرە ئەمنەکانەوە شوێنەکەیان دیبێتەوە."

وا پەشۆکا نەیزانی چۆن تەلەفۆنەکەی خستەوە شوێنی خۆی، لەسەر کورسییە چەرمە ڕەشەکەی پشت پایەکە دانیشت، بە شێوەیەک لە دەرەوە نەبینرێ، بەرنامەکەی بە جارێک تێک چووبوو، بە هەر شێوەیەک بێت ئەو دوو پەپوولەیە ئاشکرا بوون، تاوێکی دیکە سزای مەرگ دەدرێن. بە دڵی خۆی فیڵی لێ کردوون، بەڵێنی دابوونێ سۆراغیان بکات، ئەوانیش بێنەوە دوکانەکە تا لە شوێنی خۆشاردنەوەیان ئاگاداریان بکاتەوە. لە دوێنێوە سەد شوێنی گۆڕیوە، بە پاس و تەکسی لە شوێنی جیاجیا دابەزیوە، هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو، بەدوایەوە بن.

دای نابوو بێتە لایان و لەگەڵ خۆی بیانبا، بۆ شوێن ونی کەلوپەلەکانیان نەهێنن و ئوتێلەکەش ئاگادار نەکەنەوە. سەردار هەموو شتێکی ئامادە کردبوو، یەکسەر بە تاکسییەکی تایبەت دەیبردنە نەجەف، نیانی لە عەبا و پەچەوە دەپێچا، لەوێ لە ماڵی دۆستێکیان دەمانەوە، لەوێوە دەچوونە ناسرِیە. تاسا، گێژ بوو، هەر کە لووتە درێژ و گەورە و قەبەکەی نەجمی لەودیو ئۆتۆمبیلەکەوە دی، هەموو شتیکی لێ تێک چوو، بەرنامەکەی بەتاڵ بۆوە. ئێستا، گرینگ ئەوەیە ئێستا دەتوانێ چی بکات، لە وەختێکدا چەقۆکە ئەوەندە نزیکبۆتەوە بەر کەلەکەی دەکەوێ؟

دەیزانی بچێتە دەرێ کەمالی بەزاز و کوڕەکانی و برادەر و دۆستەکانیان چاودێری دەکەن. کە هیی ئەویش نەکەن هیی ئوتێلەکەی دەکەن. لە دەرگای دواوە بچێتە دەرێ؟ "نا، نابێ، دەشێ لەوێش بن."

هەستا دیسانەوە ژمارە حەوت سەد و حەوتی لێ دا، دیسانەوە دەنگدانەوە و درێژبوونەوەی زەنگەکە، کەس هەڵی ناگرێ، کەس وەڵام ناداتەوە، قوڕگی وشک بوو، وەک لە بیابانێک بێت و داوای ئاو بکات، بەڵام هەی هات لە بیابان کانی بە پێلاقەی منداڵێک هەڵدەقووڵێ، بەڵام لەو ژوورە دەنگێک نایەت، "ئەوە چ خەوێکی نەگریسە! ئێوە دەخەون و دنیاش بەدوای ئێوەوەیە."

کاتژمێر یازدەی تەواوە، سەردار ویستی جارێکی دیکە ژمارەکە لێ بداتەوە، هەستایە پێ و چووە لای تەلەفۆنەکە، لەپشت سەریەوە، یەکێک وەک بە گوێیدا بچرپێنێ، گوتی، "زۆر باشە کاک سەردار پێش ئێمە هاتووی، دیارە چاوەڕێی ئێمەت دەکرد، تەلەفۆنیان بۆ بکە، با هەستن، درەنگە."

نەجم بوو، کابرای عەرەبی دوێنێشی لەگەڵ بوو، سەردار خەریک بوو بە لادا بکەوێ، ناترسێ تەنها ئەوەندەیە لەو کاتانەدا خوێن بۆ مێشکی ناچێ و هەناسەی تەنگ دەبێ. لەو کاتەدا دوو گەنجیش کە ڕەنگی نیانیان دەدا هاتنە ژوورێ، یەکێکیان شیرینی و ئەوی دیکەیان باقە گوڵێکی بە دەستەوە بوو، وەک ئەوەی بۆ پیرۆزبایی هاتبن. برای کورد لە کاتی ئاساییدا نازانێ پیرۆزبایی لە خوشکەکەی بکات و دڵخۆشی خۆی بۆ زەماوەندەکەی دەر بڕێ، جا ئەگەر لاملی کردبێ و دوای کوڕێک کەوتبێ و مێزی کردبێتە ژێر حەیا و ناموسیان

ئەوە جارێکی دیکە نایەتەوە بەر چاویان. کچەش ئەوە باش دەزانێ، بۆیە براکانی نا، دایک و باوکی نا، خۆی لە ژیانی ئەوان بەتەواوی دەسڕێتەوە.

نەجم چەند جارێک ژمارەکەی لێ دایەوە، سەردار لە کاتێکدا ژمارەکانی دووبارە دەکردەوە، سەیری پەنجە ئەستوور و پێستە وشک و خوارەکانی نەجمی دەکرد، بیری لەو ترس و تۆقینە دەکردەوە کە نیان گەمارۆ دەدات، کاتێک بە دەنگی ئەو پیاوە خەبەری دەبێتەوە. سەردار پێی وا بوو، سەروەر وەڵام بداتەوە باشترە، سەروەریش دەترسێت و پێستە ڕەشەکەی دەگۆڕێت بۆ زەرد. ئەگەر سەروەر وەڵام بداتەوە، ناهێڵێ سەردار ئەو هەموو حیکایەتە گوماناویانە ڕێک بخات، نەجم یەکسەر دەڵێ، "ئاشنای خۆتانم،" هەرگیز ڕووی نەداوە وشەی ئاشنا ئەوەندە دوژمنکارانە بەکار هاتبێ، سەروەر فێڵ لە خۆی دەکات و دەپرسێ، بەترسەوە دەپرسێ، "سەردار تۆی،" نەجم ئەو ڕێگایەشی لێ دەگرێت و دەڵێ "سەردار! ئەوەتا لەتەنیشتمە،" سەروەر ناپرسێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێ، "برادەر ئەو گوللەیەیە کە هەرگیز هەڵە ناکات و ڕاست نێوچاوانت دەپێکێ،" حەقیەتی سەروەر وا بڵێ، حەقیەتی گومان بکات، چونکە جگە لەو کەس شوێنی ئەوان نازانێ. نەجم ئەو هەڵە دەقۆزێتەوە و دەڵێ، "کاتتان ناگرم، ئەوە دیارییەکی بچووکم بۆ هێناون، لە بەردەرگاکەتانم داناوە، پێویست ناکات من سەر بکەوم بۆ لاتان، زەحمەت نەبێ دەرگاکە بکەوە و دیارییەکەتان بەرە ژووریێ."

سەردار زراوی دەڕژێ، دەڕوانێ کابرای عەرەب لەوێ نەماوە، بە خەیاڵیدا هات، ئەو دیارییەکەی نەجم بێ بۆ

سەروەر و نیان، ئێستا لە بەردەرگای ژووری حەوت سەد و حەوت چاوەڕێ دەکات سەروەر دەرگاکە بکاتەوە، تا بچێتە ژوورێ و ڕاست دڵیان، شوێنی عەشق و ئەوینیان بکاتە نیشانە و هەریەکە سێ گوللەیان بۆ بکاتە دیاری.

بەڵام ئەو غایلە و خەیالاتانەی سەردار نایەنەدی، ئەوانە هیچی ڕوو نادات، کەس لەوسەری هێڵەکەوە وەڵام ناداتەوە، ئەگەر دار و بەرد و دیوارەکان و مێز و کورسی و دوو بوتڵە شووشە بچووکەکە وەڵام بدەنەوە، ئەوە سەروەر و نیان هیچیان وەڵام نادەنەوە، ئەگەر سوور بزانن سەردارە و فڕۆکەی بۆ ڕاگرتوون، دیسانەوە ناتوانن وەڵام بدەنەوە، کەس لەوسەری هێڵەکەوە وەڵامی نەدایەوە.

نەجم چەندان جاری دیکە زەنگەکەی لێدایەوە، دیار بوو دەنگی زەنگەکە بەر دیوارە سارد و غەمگینەکانی ژووری بووک و زاوا دەکەوێت، بە هەمان هێڵدا دەگەڕایەوە ناو گووشەیەکەی بە دەست نەجمەوە بوو، بە بوغز و سەرسامییەوە سەیرێکی سەردار دەکات و دەپرسێ، "بۆ وەڵام نادەنەوە، چیت لەژێر سەردایە، خۆم دەزانم چیت لێ دەکەم؟"

سەردار لەو هەموو دەموچاوە نەناس و بەگومانە زراوی چووبوو، کە هەریەکە بە بیانوویەک لەولاولا وەستابوون و سەیری ئەویان دەکرد، بۆ ئەو دوو کوڕەی ڕوانی کە تامی خوێنی نیانیان دەدا. کابرای عەرەبیش دیار نەبوو، دەنگێکی وەک کوتانی دەهۆڵ دەهات، دەنگی دڵی بوو بێپەروا خۆی بە قەفەزەی سینگیدا دەکێشا، هەر وەک ئەو ڕۆژەی سەرەوخوار هەڵیان واسیبوو، سەری ئەوەندەی مەنجەڵێکی ساوەرکوڵان

گەورە ببوو، دڵی وەک کوتکی ئاسنگەر بەر پەراسووەکانی دەکەوت، لەو کاتانەشدا پەراسووی خوێڕی چەندە بەهێزە و ناشکێ.

نا، ئەوەش دەنگی لێدانی دڵی نەبوو، ئەویش بوو، بەڵام نا، ئەو دەنگەی وەک کوتانی دەهۆڵ دەنگی دەدایەوە، دەنگی لێدانی دەرگای ژوورەکەی سەروەر و نیان بوو، ئەو کاتەی سەردار سەرقاڵی تەلەفۆن و کاک نەجم بوو، ئەوان بە پلیکانەکاندا سەرکەوتبوون، بەپێی بەرنامەی خۆیان، خۆیان لەپەنای دەرگای ژوورەکەی سەروەر و نیان مات کردبوو، گوێیان لە دەنگدانەوەی زەنگی تەلەفۆنەکە ببوو، چاوەڕێیان کردبوو، بەڵکو دەرگا بکەنەوە، نیشانەکەیان ئەوە بوو کە وەڵامی تەلەفۆنەکەیان دایەوە، دەڵێن، "دەرگاکە بکەنەوە دیاریمان بۆ ناردوونەتە بەردەرگا،" ئەو کاتە یەکێکیان دەرگاکە دەکاتەوە و دێت دیارییەکە وەر گرێ، ئەوانیش یەکسەر بچنە ژووری و هەر لەوێ کاری خۆیان تەواو بکەن و ژیانیان کۆتایی پێ بێنن. ئەوە ڕووی نەدا، وەک چۆن وەڵامی تەلەفۆنەکەیان نەدایەوە، وەک زەنگەکە نەپچڕا و هەر درێژ بۆوە، ئاواش دەرگاکە نەکرایەوە. ئەوان سەریان سووڕ مابوو دەبێ چ پلانێکیان لەژێر سەردا بێ ئاوا وەڵام نادەنەوە! دیارە هەموویانیان بە سەرداریشەوە هەڵخەڵەتاندووە. ناچار لە دەرگایان دا، یەکەم جار شەرمنانە، بەهێمنی، وەک برا و دۆست، وەک پارچەنانی چەوری سەر تەڵە، جا تۆزێک توندتر، تۆزێکی دیکەش، زیاتر، توندتر، دەرگای هەندێ لە ژوورەکانی نهۆمەکە کرانەوە و داخرانەوە، تەنها هیی ژووری حەوت سەد و حەوت نەبێ، هەر نەکرایەوە. توندتر، وەک

لێدانی دەهۆڵ دەنگی دایەوە. سەردار خێرا بەرەو سەر غاری دا، نەجم و شاگرد و ئەو چەند کەسەی لەگەڵیان هاتبوونە ژووری بەدوایاندا.

کە سەردار گەیشتە سەرەوە، ڕووی ڕاستەقینەی گوڵ و شیرینی هەڵگرە بە نیان چووەکان دەر کەوتبوو، نەک دەرگا دەیانویست دیوارەکەش بڕووخێنن، لەنێوان ئەوان و سرپینەوەی ناموسیان تەنها یەک مەتر مابوو کە نەدەکرا ئەوەندە پتەو بێ و ڕێگای کارەکەیان لێ بگرێ.

پیاوێکی بالابەرزی ڕێکپۆش بە پێچەوانەی ئەو هەراو دەنگە دەنگەی نهۆمی حەوتەمی داگیر کردبوو، بەهێمنی گوتی، "دوور کەونەوە، ئەوە باوکیەتی، هاتووە سەردانی کچەکەی بکات، تکایە ئێرە چۆڵ بکەن."

کەمالی بەزاز، وەک ئەو پاشایانەی ولاتەکەیان داگیر دەکرێ و بۆخۆشیان دەستبەسەر دەکرێن، لەپەنای کابرا وەستابوو، کابرا فێڵێک لە دەنگیدا بوو، لە شاردنەوەی سەرکەوتوو نەبوو.

دواتر گوتی، "کوڕ و کچێک زەماوەندیان کردووە، کارێکی خراپیان نەکردووە، ئەو پیاوەش باوکی کچەکەیە و پیاوێکی بەناوبانگ و بەشەهامەتە، دڵی گەورەیە و هاتووە پیرۆزباییان لێ بکات و دڵیان بداتەوە."

وا قسەی دەکرد کە ئەوانەی ژووری گوێیان هەبێ، بیبیستن. دوو جار بە ئەدەب و شەرمەوە لە دەرگای دا، هەموو هەناسەیان ڕاگرت، وەک گوێیان لە کەسێک بێ بیەوێ دەرگا بکاتەوە، چاوەڕێ بوون. چاوەڕێ بوون دوو بوتڵە بچووکە ژەهرەکە هەستن و دەرگا بکەنەوە و دان بە

تاوانی خۆیاندا بنێن، "کەس تاوانبار نییە، ئێمە، ئێمە هەموو لایەکمان بێئومێد کرد،" کەمال نەیدەویست چاوی بە چاوی نیان بکەوێتەوە، حەزی لەو فێڵە نەبوو، با نەجم، هەر بۆخۆی ئەو شەرمەزارییەم بسڕێتەوە، سەیرکردنی چاوی نیان، جووتە چاوێک کە ڕاست وەک چاوەکانی خۆی بوونە، بەرگەی نەدەگیرا.

کابرا لە دەرگاکە زیاتر نزیک بۆوە، دەیویست لێوی بگاتە کەلێنی دەرگاکە، گوتی، "من لە بەغدا لەدایک بووم، بەڵام وەک ئێوە کوردم، ژیانی هەموو کوردێک ژیانی منە، تۆش وەک کچی خۆم دەپارێزم، مەترسێ، من پشتوپەناتانم، کچەکەم مەترسێ باوکت لێتان خۆش بووە، بە منی بەخشیون، لە ئوتێلەکەی من هەرگیز شتی خراپ ڕوو نادات. ئێستا تۆ ئەمانەتی منی."

گوێی مشکیان بۆ بیستن قەرز کردبوو، دەنگێکی نیان تەواوی جەستەی کەمالی بەزازی دەخستە لەرزە، بەڵام کوا هیچ دەنگێک لە ژوورەکەوە نەهات، وەک فەزای ناو ژوورەکە ئاسن و قورقوشم بێت و هیچی بەناودا نەگوازرێتەوە، بە هەمان قورسییەوە کەوتبووە سەر چاوەڕوانی ئەو خەڵکە.

سەردار چووە بەردەم کەمالی بەزاز و گوتی، "قوربان مادام لێیان خۆش بووی، زیاتر لێرە چاوەڕێ مەکە، دیارە منداڵەکان ترساون، ئێوە تەشریف بەرن، با ئەو خەڵکەش لێرە بڵاوە بکات، من قسەیان لەگەڵ دەکەم و دەرگاکەیان پێ دەکەمەوە."

کابرای هاوەڵی کەمالی بەزاز کە خۆی بە خاوەنی ئوتێلەکە ناساندبوو، گوتی، "بێگومان دەڕۆین، تەنها ئەوەندە

چاوێکمـان پێیـان بکەوێـت و لێیـان دڵنیـا بینـەوە."

سـەردار کـە هـەر ڕووی لـە باوکـی نیـان بـوو، گوتـی، "باشـترە ئێوە لێرە بڕۆن، دڵنیا بـە، دواتـر ئـەوان دێنـە دەرێ، خۆ خۆیـان زیندانـی ناکـەن، من خۆم، هەردووکیـان دەهێنمـەوە خزمەتـت."

پیـاوە باڵابـەرزە ڕێکپۆشـەکە چرپانـدی بـە گوێـی کابـرای عەرەبـی هاوکاریـدا، ئـەو ڕۆیشـت و دوای تاوێـک لەگـەڵ کارداری ئوتێلەکـە گەڕایـەوە، "دەرگای ئـەو ژوورەمـان بـۆ بکـەوە."

کابـرای کارداری ئوتێلەکـە بەسـتەکلیلێکی لـە گیرفانـی دەر هێنـا، گوتـی، "ئێمـە هەمیشـە کلیلـی یەدەگمـان هەیـە بـۆ کاری پێویسـت، بەسـەرچاو."

سـەردار دەیزانـی ئێسـتا سـەروەر و نیـان گوێیـان بـە دەرگاکەوەیـە، دەشـێ هـەر ئێسـتا قریشـکەیەک لـێ بدەن، هـاوار بکـەن، یـان بەپاڕانـەوەوە دەرگاکـە بکەنـەوە، سـەردار هیـچ ئـاگای لـەو بووتڵـە بچووکـە عەشـق کوژانـە نەبـوو. کـە دەنـگ نەبـوو، ترسـا هەردووکیـان خۆیـان لـە پەنجەرەکـەوە فـڕێ بدەنـە ئەودیـو.

کـە کلیلـی خسـتە نـاو کێلۆنەکـە تـا دەرگاکـە بکاتـەوە، کەمـال بـە چـاو قسـەیەکی بـە نەجـم گـوت، دوو کـوڕە لـە نیـان چـووەکان سـوور بوونـەوە، سـەردار خـۆی بەسـەر دەسـتی کابـرادا دا و گوتـی، "کابـرا ئـەوە تـۆ ئەمانـەت نازانـی، ئەوانـە بـە متمانـەی تـۆوە لێرەن، جگـە لـەوەش ئـەوان بـووک و زاوان چـۆن دەرگایـان لەسـەر دەکەیتـەوە، لـە وەختێکدا دەبینـی ئـەو هەمـوو خەڵکـە لێـرە وەسـتاون."

یەک-دوو دەستی پۆلایین سەرداریان ڕاکێشایە دواوە، کابرای کارداری ئوتێلیش گوتی، "گەمژەی حەیوان دەستت شکاندم."

هەموو پێیان وا بوو، لەگەڵ خرمەی کێلۆنەکە ئەوان خۆیان لە پەنجەرەکەوە فڕێ دەدەن، یان وەک مشک و جرج خۆیان لەژێر سیسەمەکە دەشارنەوە، یان ترساو و زەندەقچوو دەپاڕێنەوە.

دەرگاکە کرایەوە، دەنگ نییە، سەردار ئێستا لەو باوەڕەدایە هەردووکیان وەک دوو پاڵەوان، هەڵدەستنە پێ و دەڵێن، "ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ، فەرموو بمانکوژن،" ئەوانیش یەکەی سێ گوللەیان لێ دەدەن، چاوەڕێی دەنگی ئەوان و تەقەی گوللە بوو، بەڵام هەرچی ئەو سەرداره لە ژیانی خۆیدا چاوەڕێی کردووە نەهاتۆتە دی، نە گوێی لە دەنگی ئەوان بوو، نە لە گوللە. هێشتا لە ناخەوە دەیویست جارێکی دیکە گوێی لە دەنگی نیان بێ، دەنگە مۆسیقییەکەی، دەنگە زیندووکەرەوەکەی، با بە نرخی گیانیشی تەواو بێ. دەرگاکە کرایەوە کەس ناڵێ، "توخوا بمانبەخشن،" کەس ناڵێ، "ئێوە گەورە و ئێمە خیانەتکار، بمانبەخشن،" کەس ناگریەت، هەریەکە و سەیری شوێنێک دەکات، وەک ئەوەی ئەو ژوورە ڕووتە سەد ئەشکەوتی تێدا بێ، نا دیار نین، تەماشکردنی سیسەمی دوو عاشقی هەڵاتووش ئازایەتیی دەوێت، سەیری ئەویشیان کرد، ڕەنگی سەوزهەڵاتووی بەتانییەکە، بۆنی تاڵی سەر جێگا، بەتانییەکە هەڵدەدەنەوە، زەرد، زەردێکی مردوو، ڕەنگی سەرچەف و پشتییەکان بێزاری کردن، بەتانییەکی قورسی تووکدرێژی سەوز کە هێشتا گەرمیی لەشیانی پێوە

بوو، هێواش هەڵی دەدەنەوە، پشتی و دۆشەکێکی چۆڵ، چۆڵ، لە بیابان چۆڵتر، دەبینن، هەموو دەبینن، گوارەیەک بەسەر پشتی لای ڕاستەوە، گوارە هەرە کۆنەکەی نیان، کەمال بە بۆنەی دەرچوونی و وەرگرتنی لە زانکۆ بۆی کڕیبوو، ئەوە شوێنی نیانە، هەندێ مووی چەور و ڕەش و ئەستوریش بەسەر پشتی لای چەپەوە، هەموو بێزیان لەوە بۆوە تەماشای بکەن. جانتا و زەرف و کەلوپەلەکانیان لەوێن، ئەوەش ئومێدێکە، لەسەر کۆمیدییەکەی تەنیشت سیسەمەکە کتێبی تاوان و سزای دۆستۆیۆڤسکی، کە کتێبی پیرۆزی سەروەر بوو، کەمالی بەزاز هەڵی گرت و کردییەوە تەنها یەک ڕستەی لێ نووسرابوو،

"خۆتان ون بکەن بتاندۆزنەوە دەتانکوژن." سینگی سەرداری گرت، "تۆ هەواڵت دانی، تۆ پێت گوتن، خۆتان بشارنەوە، تۆ ئەو نامەیەت بۆ هێناون، هەی نامەرد."

نەجم گوتی، "لێی گەڕێ، لەو سپلەیە گەڕێ، دوایی من حیسابی لەگەڵدا دەکەم."

سەردار کە دەیدی ئەوان هەڵاتوون، کە دەرگا کرایەوە و دیتی ئەوان لەوێ نین، شاد بوو، کەیفساز بوو، وەک تەمبوورێک شەقیان تێ هەڵدابێ ویزەویزی دەهات. نیگەرانیش، دڵ قورسیش، قورسی ئەو هەموو درزانەی چرکەبەچرکە تێی دەبوو. هیچ قسەی نەکرد هەوڵی خۆڕزگارکردنیشی نەدا، ئەو حەشاماتە دوای ئەو هەموو ماندووبوون و ڕق و بێئومێدبوونە دەبوو یەکێک بەر شەق بدەن، کابرای عەرەب زللەیەکی توندی لەپشتەوە لێدا و پرسی، حەرامزادە بۆکوێت ناردوون؟"

مستەفا هاتە تەنیشتیەوە و پێی گوت، "هاوڕێی خیانەتکار، هاوپشتی دز، هەڵەکەت ڕاست بکەوە، جاریَ زەبری ئێمەت نەدیوە، ناترسی چونکە نامانناسی، پێم بڵێ لەکوێت شاردوونەتەوە؟"

پیاوێک کە لە شیوعییەت دۆڕابێ، دەبێ لە وەفا و عەشقدا بیباتەوە؟ با تا دەتوانن دارکاری بکەن، با جنێوی دنیای بەسەردا ببارێنن، خۆ دۆستەکانی ڕزگاریان بووە. ناتوانێ هەر بیریش لەوە بکاتەوە کە ئەوان لێرەبان چ کارەساتێکیان بەسەر دەهات.

"تا دوور نەکەوتوونەوە فریایان کەون."

کێ بوو هاواری کرد، هەرکەسێک بوو، سەرداری لە دەست ڕزگار کردن.

هەموویان هاتنە خواریَ بەرۆکی یەکەیەکەی شاگرد و کارمەندەکانی ئوتێلەکەیان گرت، "کامتان دواجار ئەوانتان دیوە؟"

"پاسەوانی بەردەرگا کێ بووە؟ بیهێنن."

"کاتژمێر چەند ئەوان چوونە دەرێ؟"

"دەبێ کەسێک هاوکاری کردبن؟"

"هەرکەس پێمان بڵێ بۆکوێ چوون خەڵاتی دەکەین."

جگە لەسەر ئێشە، جگە لە کات بەفیڕۆدان هیچی دیکەیان دەست نەکەوت.

نەجم هاواری کرد، "پۆلیس، پۆلیسی بازگەکان، ئاگادار بکەنەوە."

سەردار بێ بنەما، دڵی بەو قسەیە خۆش بوو کە بە دڵیدا هاتبوو، "کوا جریوەی چۆلەکە دەگیرێ."

کە چووە دەرێ چاو بگێڕێ، ژنێکی بالآبەرزی بەویقار بەرەو ڕووی هات، گوتی، "لێرە، دوور لە هەمووان چاوەڕێم کردی، تا بەتەنها پێم بڵێی، من دایکم، دایک هەرگیز تۆڵە ناکاتەوە، من بۆنیم دەوێ، تەنها بە من بڵێ کچەکەم لەکوێیە؟"

بەڵقیس زۆر بەزەحمەت بە پێوە وەستابوو، چاوەڕێکردن ئێسقانەکانی کرۆشتبوو، سەردار دایکی بیر کەوتەوە، چاوی دایک چ ئارامییەک دەچێنێ، ویستی بەسەر پێلاوەکانیدا بکەوێ، لەجیاتیی هەموو دایکانی دڵشکاوی دنیا ماچی بکات، ئاخ بۆخۆی چەند پێویستی بە باوەشی داکیەتی. لەگەڵ ئەوانەشدا دڵڕەقانە گوتی، "تۆ باوەڕم پێ بکە، من هیچ دەربارەیان نازانم."

توند سینگی سەرداری گرت، زیاتر بۆ ئەوەی پێوەی ڕاوەستێ، "تۆ هەموو شتێک دەزانی، ئاگاداری هەموو شتێکی، ناکرێ دڵی دایکیش بشکێنی، دڵنیام بکەوە."

***

ئێستا بەغدا هیچ نییە، جگە لە دوو عاشقی هەڵاتوو، دوو عاشق کە دوای سێبەری خۆیان کەوتوون، بازگەکان، پۆلیس و ئەمن، پاسەوان و پیاوکوژ، دڵڕەق و شەلاتی هەموویان ئاگادار کرانەوە دوو کەس، کە ناموسی دنیایان بردووە، لە دین دەر چوون تفیان لە ڕابردووی خۆیان کردووە، هەڵاتوون، تا هەموو دنیایان بەدخوو نەکردووە بیانگرن. هەموو کوڕ و کچێکی پێکەوە پرسیاریان لێ کرا، عاشقەکانی کۆرنیش و ئەبو نوئاس و کەڕادە داخیل

و مەنسوور هەتا ماڵە پڕگوڵە وەنەوشەکانی بەتاوین و حەیدەرخانەشیان بەسەر کردەووە. دەیان کوڕ و کچ، بووک و زاوای تازە بەهەڵە گیران. تەنها سەردار لە خۆوە دڵخۆشە، "کوا جریوەی چۆلەکە دەگیرێ" دەشێ ڕاستیش بێت، دەشێ ئەو خۆشباوەڕییەی سەردار ڕاست بێت و هەرگیز نەگیرێن.

بەڵقیس نەیدەویست سەردار لێی دوور کەوێتەوە بۆنی نیانی پێوە دەکرد، تا کە ڕقی هەستا تفبارانی بکات و کە ویستیشی باسی نیانی لێ بپرسێ.

"ئا زۆر هاوڕێم بوو، هەموو شتێکی تایبەتە، ڕۆیشتنی، پێکەنینی، گاڵتە و قسەی خۆشی، قژە ئاوریشمەکەی، چاوی، خولق و زەردەخەنەی ژیان بۆ مردوو دەگێڕیتەوە. هەتا ئێستا مردووە هەزار ساڵ مردووەکانی گۆڕستانی مەلەکی سەر هەڵدەبڕن بزانن نیان نەهاتۆتەوە سەردانیان، ئەو مەلیکەی کە هەر بەگەنجی مرد یان کوژرا نازانم، بە دەنگی بەرز گوتوویەتی، "نەماوم دەنا تاج و تەختی خۆم بە پێکەنینی ئەو کچە کوردە دەگۆڕییەوە."

بەڵقیس گوتی، "تەنها پێکەنینەکەی هیی من بوو، دەنا چووبۆوە سەر باوکی."

سەردار بە بۆنی نیانەوە کە لە بەڵقیس دەهات دەیویست ساڵێک قسەی بۆ بکات، گوتی، "کچێکی عاشقی بەتەمەن هەیە لە وەزیرییە، هەموومان دەیناسین، بیست ساڵ پێشتر عاشقەکەی لە سەربازی نەگەڕاوەتەوە، هەتا ئێستا بەنیازە بێتەوە، هەتا ئێستا بن دارەودار بەدوای دەزگیرانەکەیدا دەگەڕێ نەک بێتەوە و بەهەڵە دوای کچێکی دیکە بکەوێ، ئەو کچە دەڵێ، "نیان هەموو شتێکی جوانە، تەنها دڵی

نەبێ، ئەو کوڕانە هەڵدەبژێرێ وەک زەروو بە ڕەگی دڵیەوە دەنووسێن و هۆشی دەبەن."

بەڵقیس دەڵێ، "لەو کچە فریشتە و غەیبزانە گەڕێ، ئەو ڕاستی کردووە، بەڵام پێم بڵێ، کوڕە جوانەکەم لێت ئەپاڕێمەوە پێم بڵێ، نیان بۆکوێ هەڵاتووە، من و تۆ بەتەنها ئەچینە لای، پەیمان بێ، پەیمانی ژن یارمەتیان بدەم، ناوچاوانی ماچ ئەکەم و ئەگەڕێمەوە، هەرگیز شوێنەکەیان بە کەس ناڵێم. کوڕێکی مەرد بە و متمانەم پێ بکە، سەردار کە بیزانیبا نیان و سەردار لەکوێن، ئەو ژنە خانومانەی لە کۆڵ دەکرد، بەبێ ئەوەی کەس بزانێ، دەیبرد بۆ لایان. خۆ کەسیش نازانێ تاوان خۆی لەکوێ مات داوە، تا بیاندۆزێتەوە و ئەو ژنە بەرێتە لایان، چونکە سەردار دڵنیایە نەشیان دۆزێتەوە بۆخۆیان پەیوەندی پێوە دەکەن، کە ئەو ژنە بەرێتە لایان ئاشکرایان ناکات؟ کوا ژنی کورد ئەوەندە چاوپۆشە؟ ڕۆحی پیاوانەی ژنی کورد بەئاگا بێ ئەوەندەی ئەبو زەڕ توندوتیژە. سەردار پێی وا بوو، هەر ژنێکی کورد بە مۆدێرنەکانیشەوە ئەوەندەی شەش پیاوی ئەوروپایی دەماری پیاوەتی و غیرەتی تێدایە. خۆ دەشێ بۆ پەیمانەکەشی بەوەفا بێ، دەشێ ئاشکرایان نەکات، خۆ هەر دەشێ شەوێک لە خەودا هەردووکیان سەر ببڕێ، هەم وەفای بە پەیمانەکەی کردووە بە کەسی نەگوتووە، هەم تۆڵەشی کردۆتەوە. بۆیە خۆڕزگارکردن لەو فریشتە یان ئیزڕائیلە، لەو دڵە پڕ موحیبەتە یان ڕۆحی تۆڵەیە باشترین ڕێگایە. سەردار بڕیاری دا بە هەر بیانوویەک بێ خۆی بدزێتەوە. بە بەڵقیسی گوت، "تۆ لێرە بە، من سۆراغیان

دەکـەم و دێمـەوە."

بەڵقیـس کـە دەسـتی لـە سـینگی سـەردار بـەر نەدەبـوو، بەپاڕانـەوەوە گوتـی، "تـۆ نابـێ جێـم بهێڵـی، دڵـم ڕوونـە هەواڵێکی خـۆش هـەر لـە تـۆوە ئەبیسـتم. بۆ هـەر کوێ بڕۆی لەگەڵـت دێـم، هەمـووان جـێ دەهێڵـم و لەگـەڵ تـۆ دێـم، دڵـم ڕوونـە پێکـەوە دەیاندۆزینـەوە."

هێشـتا سـەردار خـۆی ڕزگار نەکردبـوو، دڵـی نەدەهـات لـە دەسـتی پەرۆشـی دایکێک خـۆی ڕاپسـکێنێ، دڵـی نەدەهـات دەستی دایکێک کە پەنـای بۆ هێنـاوە بـەزۆر لـە بەرۆکی خـۆی بکاتـەوە، کابـرای عـەرەب، هاوڕێکـەی کەمالـی بـەزاز دەسـتی خسـتە سـەر شـانی و گوتـی، "پۆلیسـەکان لـە ژوورەکە خەریکی لێکۆڵینـەوەن، داوای تـۆ دەکـەن."

# ١٥

بەڕێوەبەری ئوتێلەکە و پۆلیسەکان چەندان جار ژوورەکەیان پشکنییەوە، هەموو کەلوپەلەکانیان ژێرەوژوور کرد، پەیوەندییان بە بازگەکانەوە دەکرد، زووزوو لە مەفرەزەکانی ناوشار دڵنیا دەبوونەوە. تەلەفۆن و شەپۆلەکانی هەوا ئەو ڕۆژە تەنها ناوی نیان کەمال و سەروەر مەحموودیان دەگواستەوە. لە ترسی ناوی خۆگۆڕین شێوەشیان باس دەکردن، کچێکی تەمەن بیستودوو و بیستوسێ ساڵ، قژزەرد، چاوسەوز. کوڕێکی تۆزێک گەورەتر، ڕەش باریک، دەموچاو خروێلکاوی، کوردن. کە سەردار چووە ژووری ئەفسەرەکە بە دارەکەی دەستی ئیشارەتی بۆ دوو بوتڵی شووشەی بچووک کرد، لەسەر لێواری مێزەکە، "ئەوانە چین؟"

سەردار کە ئەو شووشانەی دیت حەپەسا، بە دەرمان و شتی تاقیگە دەچوون، ئەفسەرەکە دووبارە پرسییەوە، "خۆت گێل مەکە، ئەوانە چین بۆت هێناون؟"

سەردار کە هێشتا سەیری بوتڵەکانی دەکرد، ئەویش

پرسیی، "ئەوانە؟ من بۆم هێنابن؟ هەرگیز، نازانم، بۆچی ئەوانە چین؟"

ئەفسەرەکە دیسانەوە پرسییەوە، بەڵام ئەم جارە بە دارەکەی پاڵی بە سینگی سەردارەوە نا و گوتی، "باش دەزانی ئەوانە ژەهرن، بۆ خۆت و ئەوان باشترە زانیاریمان بدەیتێ، بۆخۆیان داوایان کرد؟"

"من هیچیان دەربارە نازانم ئێستا دەیانبینم. باوەڕم پێ بکەن." کەماڵی بەزاز و نەجم هاتنەوە ژووری، بە کوردی بە سەرداریان گوت، "کوڕی باش بە، با لەوە زیاتر لە بەردەم ئەو عەرەبانە سووک نەبین، شوێنەکەیان بە ئێمە بڵێ، ماندوو بووین، تۆ نازانی شەرەف مانای چییە! چیت دەوێ دەتدەینێ؟"

"دڵنیا بن نازانم، لە ئێوە پەرۆشترم، پێشنیار دەکەم وازیان لێ بێنن، خۆتان ئاسوودە بکەن، بۆکوێ دەڕۆن؟ هەر دێنەوە بەر دەستتان."

یەکێک لە پۆلیسەکان لە کاتێکدا چەکمەجەیەکی ناو کەنتۆرەکەی دەکردەوە، گوتی، "ئەوەش نامەیەکە لێرە."

دەبوو ئەو نامەیەیان زووتر دیبایەوە، وا دانرابوو ببینرێ، ئەفسەرەکە لێی وەر گرت، تەنها وشەی سەرداری پێ خوێندرایەوە، هەموویان بێ جووڵە وەستان، هەموویان سەیری سەرداریان کرد، خوێنی کەماڵی بەزاز کەس نەیزانی بۆکوێ چوو. ئەفسەرەکە وەک بەڵگەی تاوانی لەسەر سەردار دۆزیبێتەوە، وەک بەسەر تاوانەوەی گرتبێ، گوتی، "دەمزانی هەموو شتێک لەژێر سەری تۆیە، هەمووان وایان گوت،

ئێستا دەر کەوت، دەی بەوردی ئەم نامەیەمان بۆ بخوێنەوە، با هەر بۆخۆت شاهید بی بەسەر خۆتەوە.“

سەردار دەستوخەتی سەروەری ناسییەوە، بە گوێرەی کاغەزەکە نەدەبوو ئەوەندە قورس بێ، زۆر قورس بوو، ئەوەندەی ئەو بەردەی ئیمامی عەلی تا کەمەری خۆی بەرزی کردەوە گوایە هەموو دنیایە. خێرا دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

دنیا بۆ ئێمە بەیەکگەیشتن بوو، ژیان بوو پێکەوە ئەوەش دەرد و ژان بوو بۆ هەمووان، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی خۆشمان دەوێن، بۆ خۆشمان. بۆیە بڕیارمان دا بۆ ئەبەد دوور لە ئێوە بەیەکەوە بین. بە تایبەتی بۆ من کە بە دوو چاوی کوێرەوە تەمەنێک چاوەڕێی ڕووناکیی ئەو بووم.

من ژەهرم هەڵبژارد، بۆ ڕزگاربوونی هەمووان و مردنی ئێمە من خواردنەوەی ژەهرم هەڵبژارد، بۆ ئەوەی جەستەی قورسی خۆمان بە ژەهر و ژیان بۆ ئێوە جێ بهێڵین و بۆخۆشمان بۆ هەتاهەتایە پێکەوە بفڕین.

نیانیش ڕازی بوو، ئەویش حەزی لە مردنێکی هێمن بوو، لە ژوورێکی کپدا، شووشەکەشی لە لێوی نزیک کردەوە و یادی دایکی کرد و گوتی، ”ببوورە بەڵقیسەکەم دیدار ئاخیرەت بووم، دایکە گوڵەکەم، شاژنەکەی مەڵکەنی.“

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم ڕستەیە بەڵقیس گەیشتبووە ناو دەرگاکە، لە جێگاکەی خۆی کەوت، هیچ دایکێک نییە ئەو

قسەیەی گوێ لێ بێ و نەکەوێ، لەوێ کەوت بەبێ ئەوەی کەس بەلایەوە بچێ، تەنها کەمال تۆزێک خۆی سوورڕاند تا نەیبینێ. سەردار بەردەوام بوو:

نیان هێزی لێ بڕا و نەیتوانی ژەهرەکە بخواتەوە، بەڵام من سوور بووم، سوور بووم لەسەر خواردنەوەی ژەهرەکە، کە ئارامترین مردنت دەداتێ، نەمویست بۆخۆم بەدەمیەوە بکەم، چونکە ئارامی مردن بە ژەهر لەوەدایە بەویستی خۆت بیخۆیتەوە.

هەموویان ڕوانییانە دوو بوتڵە شووشە ژەهرەکەی سەر مێزەکە، تەنها بەڵقیس سەری تا ئەرزەکە شۆڕ کردبۆوە و وەک مانگای سەربڕاو لرفەی دەهات. سەردار بەردەوام بوو:

من حەزم نەکرد نیان بەو ترسەوە بۆ دیداری مەرگ لەگەڵم بێ، ئەو بەرگەگرتنی بۆنی ژەهرەکەی لە بەرگەگرتنی مەرگ پێ قورستر بوو. شووشە ژەهرەکانمان لە شوێنی خۆی دانایەوە، هەردووکمان دەمانزانی خۆری بەیانی چ ئابڕووچوون و ئەشکەنجەیەکی بۆ ئێمە پێیە. بۆیە بڕیارمان دا، پێش خۆرکەوتن، بچینە سەر دیجلە، لەسەر پردی کۆمارییەوە بفڕین، لەوێ نیان ژوانی لەگەڵ دوو کۆتر هەیە، دوو کۆتر نیازیان هەیە یەکەم تیشکی خۆر لەسەر پشتی ئەوان بدات، بۆیە ئەوەندەی بتوانن بەرز دەفڕن. (بەڵقیس نەیتوانی دوو کۆترەکەی سەیداوای بیر نەکەوێتەوە.)

ئەوە نیان تاکە گوارەیەکی خۆی کە زۆری خۆش دەوێت لەسەر پشتیەکە بۆ دایکی جێ دەهێڵێ، بەو نیازەی یەکێکیان لای ئەو بێت و ئەوی دیکەشیان لای نیان.

من عاشقی خۆکوشتنم بە ژەهر، لەبەر دڵی نیان بە مەرگی ئاو ڕازیم، بەیانی لەگەڵ ئەو جووتە کۆترە دەفڕینە ناو هەوا. پێکەوە، باوەش لە یەکتر دەدەین، دەفڕینە خوارێ، خۆمان بە یەکەوە دەبەستینەوە، خۆبەستنەوەیەک کەس نەتوانێ لێکمان بکاتەوە، ئەوەش جوانترین شێوازی مردنە تا ئێستا عاشقان هەڵیان بژاردبێ. نیان دەڵێ، "ماڵی خۆمان دەگوازینەوە ناو ئاو، با کەس بەدوامانـدا نەگەڕێت، با بۆ ئەبەد لەناو ئاودا بتوێینەوە،" هەست دەکەین لەوەتەی هەین، پێش ئەوەی هەشبین، هەر پێکەوە بووین و بۆیە دەمانەوێ لە زەمەنێکی گەردوونی نەبڕاوەشدا هەر پێکەوە بین، کەس بۆ ئێمە خەمبار نەبێت، ئێمە لە خەوداین و هەرگیز حەز ناکەین لەو خەوە بەئاگا بێین. بێ یەکتر ناتوانین هەبین.

ئەو نامەیە هێز و توانای لە هەموویان سەندەوە، لە کوشتن و وێرانکردن بەتاڵی کردنەوە. ئیدی هێزیان بۆچییە لە کاتێکدا هیچ شتێک نەماوە بیڕووخێنن. ئیدی دەنگیان بۆچییە لە کاتێکدا کەس نەماوە بەسەریدا هاوار بکەن. سەردار دانیشت، تەنهاتر لە تەرمی عاشقەکانی سەر کاغەزەکە دانیشت. وەک کەوتبێتە ناو بەتاڵاییەک لە دەرەوەی زەوی، وەک بۆشاییەک قووتی دابێ، جەرگ و دڵی خۆی دەدیت لە شوێنی خۆیان هەڵدەکەندرێن. سەربازەکان و ئەفسەرەکە و کابرای عەرەب و نەجم و کەمالی بەزاز لە شوێنی خۆیان

مۆمیا کراون. ئەوانیش ڕۆژێک لە ڕۆژان عاشق ببوون، بەڵام ئەو جورئەتە پاک و منداڵانەیان نەبوو. ئەوانیش ڕۆژێک لە ڕۆژان گوێیان لە هاواری هەرمێکەی ناو سینگیان ببوو، دڵیان پان کرابۆوە، بەدوای بێهوودەیی کەوتبوون و خوویان بە ژیانەوە گرتبوو و بوێرییان فڕێ دابووە ناو زبڵدانەوە.

کەمالی بەزاز هەموو ئەو شەڕانەی بیر کەوتەوە کە لەسەر بەڵقیس کردبوونی. ئەو ڕۆژەی ئامۆزا شەلاتییەکەی بەڵقیس چەقۆیەکی لە بنباڵی دا، دکتۆرەکان گوتیان بە موعجیزە ڕزگاری بووە، موعجیزەکە خۆشەویستی بوو مۆڵەتی دابووە ئەو دڵە بەرازەی، بەڵقیس جگە لە چاوەڕێکردن هیچی تری نەکرد، تەنها ئەوە نەبێ کە چاکەتە خوێناوییەکەی تا ئێستا پاراستووە، چونکە دەیزانی کەمال بەسەر ئاگردا بۆ لای دێ.

کەمال سەیرێکی بەڵقیسی کرد، کە وەک سیپاڵ لەسەر عەرزەکە پان ببۆوە و پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو بەڕێکردنی تەرمی ئازیزترین کەسی خێزانەکەی بەو کارەساتە دەبێ. بەڵقیس چاوی چووە سەر کەمال، هاواری کرد، "نا کەمال نا، نیان خۆی ناکوژێ، نیانی من ژەهر ناخواتەوە، نیانی من خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاوەوە. بۆم بدۆزەوە، ئێستا ئەو لە هەر شوێنێک بێ دیلە، هەر ڕزگاری بێ، تا باوەشی من ڕاناوەستێ. کەمال کچەکەم لە تۆ دەوێتەوە، تۆ زراوت برد."

دەنگی بەڵقیس ژیانی بە بەر مۆمیاکراوەکانی ژوورەکەدا کردەوە، ئەفسەرەکە گوتی، "ئێمە دەبێ پۆلیسی دەریاوان ئاگادار بکەینەوە، بچینە لای پۆلیسی پاسەوانی کەنارەکان."

سەردار لە دڵەوە لە قوڵپەی گریانی دا، بۆچی ئەوەندە باوەڕی بە وشەکانی ناو ئەو پەڕە کاغەزە هەیە! هەموو ئەو پێکەنین و گاڵتە و قسە قۆشمانەی هەڵێنایەوە لە باخچە بچووکەکەی ئاداب و لەلای پلیکانەکان و چێشتخانەی قوتابیان چووبووە ناو هەناویەوە، هەموو ئەو زەردە خەنانەی بەسەر قوتابییەکاندا دابەشی کردبوو. ئەو ڕۆژەی نیان بۆ یەکەم جار، وەک کەرویشکێکی سپی ناوچاوان سەوز، بە سەدەیەک بەرائەت و کالەیەکی سپی تەنکەوە هاتە ئاداب، قیفەی قاز لە هەموو شوێنێ بەرز بۆوە، نیانیش وەک بەچکە قازێکی زەردزەرد، زەردی تووکنەرم و کورت، سەری بە باڵی هاوڕێکەی کرد. ئێوە کردتانە قاز و دوو باڵتان دایە، کە فڕی بۆچی نیشانە لە سینگی دەگرنەوە. سەردار هەموو مێژووی گەنجیەتی ئەو وڵاتەی وەک بۆقێکی قوڕاوی هاتە بەرچاو سەگ پانی بکاتەوە.

بەڵقیس دیسان بە دەنگێکی نووساو و کوژراوەوە گوتی، "نا باوەڕ مەکە کەمال، نا، من کچەکەم لە تۆ دەوێتەوە."

ئەوان هەموو پێیە گەورەکانیان بەسەر بەڵقیسدا هەڵێنایەوە کە هێشتا لە بەردەرگایەکە کەوتبوو، تەپ تەپ دوور کەوتنەوە. سەردار وەک کوڕی ڕاستەقینەی ئەو ژنە بریندارە بێ، هات، هێواش و کۆستکەوتووانە هات، لە بەردەمی دانیشت، بەڵقیس وەک شێت باوەشی بە سەرداردا کرد و گوتی، "بۆنی نیانت لێ دێ کوڕەکەم، کچە زەردەکەم بە ڕاستی عاشق ببوو؟"

***

دوو کورە هەرزەکارە ماسیگرەکەش زانییان کوڕ و کچێک، کوڕێکی ڕەشتاڵە و باریک، کچێکی زەرد و پەشمەکی، کەمەری خۆیان پێکەوە بەستۆتەوە، بە جووتە خۆیان فڕێ داوەتە ناو ڕووباری دیجلەوە. ئەوانیش بۆنیان کردبوو ئەوانە هەر ئەو کوڕ و کچەن لەگەڵ ئەوان سواری بەلەم بوون و پیاسەی دیجلەیان کرد. باپیرە شەهوەتبازەکەیان کە لەو هەموو بەلەمی فریاکەوتنی پۆلیس و پاسەوانانی کاتی تەنگاوی و مەلەوان و تۆڕە فڕێدراوانەی ناو ئاوەکە ورد ببوەوە، گوتی، "بێسوودە، گەڕان بەدوایاندا بەلاشە، عاشقەکان ناکەونە ناو ئاو، پێش ئەوەی بکەونە ئاوەکەوە دەستێک ڕزگاریان دەکات."

کوڕەکان پرسیان، "جەدۆ تۆ ڕزگارت کردن؟"

باپیریان بەتەوسەوە گوتی، "نا من ئەو کاتە لەپاڵ داکتاندا بووم."

کوڕەکان گوتیان، "خۆ داکمان بووکی خۆتە."

ئەویش هەر وا فەرامۆشکارانە گوتی، "بابە گەوادەکانتان لەبەر قەحبەی شاری لووسی ناو بەلەمەکانیان ئاگایان لەوان نەماوە، منیش دەبێ بەوانیش ڕابگەم تا نەچنە باوەشی خەڵکی دیکە."

کورە درێژەکەیان، کە باریکتریش بوو، گوتی، "گۆشتی ماسی ئینسانخۆرت خواردووە، هەموو شتێکت لەدەست دێ."

پۆلیسەکان لەوانیشیان پرسی، "ئەورۆ بەیانی بۆ ڕاو دەر چووبوون؟ کوڕ و کچێکتان نەدیوە خۆیان فڕێ دابێتە ناو ئاو؟"

دیسان کورە درێژ و باریکەکەیان گوتی، "با، کوڕێکی ڕەشتاڵە و کچێکی قژزەرد بوون."

پۆلیسەکان نزیکتر بوونەوە و ئاسوودەی ئەوە بوون کارەکەیان بەئەنجام گەیشت، پرسییان، "لەکوێ؟"

کورە کورتترەکەیان دەستی بۆ خوارتر ڕاکێشا، "لەوێ، لای کەنارەکەوە بوون، ئەوە چەند ڕۆژ پێشتر، لەگەڵ ئێمە سوار بوون و بەو ناوەدا سووڕانمانننەوە."

ئەفسەرەکەیان توندتر پرسیی، "مەبەستمان ئەمڕۆ بەیانییە، ئەمڕۆ کەستان نەدیوە خۆی هەڵدابێتە ناو ڕووبارەکەوە؟"

دیسان کورە درێژەکە، "ئەمڕۆ نا، لە پێش خۆرکەوتنەوە لێرەین کەسمان نەدیوە."

"ئەی پیرەپیاو تۆش نەتدیون؟"

پیرەپیاوەکە وەڵامی نەدانەوە، نەوەکانی گوتیان، "لێی گەڕێن کەرە."

هەتاو بەقووڵی چووبووە ناو پێست و گۆشتی دەموچاوی پیرەپیاوەکەوە، گریان و پێکەنین لەسەر گۆشتی مردووی ڕوخساری دەر نەدەکەوتن.

کورە هەرزەکارە ماسیگرەکان دیسانەوە لێیان پرسییەوە، "جەدۆ بۆ وەڵامی ئەو پۆلیسانەت نەدایەوە، مردن ئەوەندەی بگەڕێن؟"

"بەلاشە، گەڕان بەدوایاندا بێسوودە."

هەستا و سووڕایەوە و ڕۆیی، بەرەو ناو کۆختەکەی ناو خانووە کۆن و ڕووخاوەکان ڕۆیی، کە ئەوەندەی ئەو ساڵانەی لەسەر سینگی هاڕوونە ڕەشید کەڵەکە بوون ئەو

بەس ژنی تێدا گابوون.

کورە باریکە درێژەکەیان هاواری کرد، "باپیرە پێش ئەوەی بمری پێمان بڵێ، شوێنەکەیمان پێ بڵێ."

"شوێنی چیتان پێ بڵێم حەرامزادەینە؟"

"شوێنی پارەکانت، بزانین لەکوێت شاردوونەوە."

***

مانگێکی تەواو گەڕان، ژێر پرد و گێژەئاو و بنکەندڕ و ئەشکەوتی ناو ئاوەکە گەڕان، تەواوی کەنارەکەش، ئەو تۆڕانەشیان بەسەر کردەوە کە هەر چەند کیلۆمەترێک بە قوولاییی دیجلە لەوبەروبەری ئاوەکە ڕایەڵ کرابوون بۆ ئەوەی لە کاتێکی ئاوادا لاشەکان بگرێتەوە. ئەو تۆڕانە وەک دیواری زەبەلاح، وەک دیواری کونکون لەوسەر بۆ ئەوسەری دیجلە ڕایەڵ کرابوون، هیچ شتێکی گەورەیان بەناودا تێنەدەپەڕی و دەیانگرتەوە، بەلام لەو ماوەیەدا هیچ لاشەیەکیان پێوە نەلکابوو، هیچ شتێکیان نەدۆزییەوە. سێ ڕۆژی یەکەم ئومێدێکیان هەبوو، مەلەوانە شارەزایەکان دەیانگوت،

"لاشە دوای سێ ڕۆژ ئەستوور دەبێت و سەر ئاو دەکەوێ."

بەلام ئەوان نە ئەستوور بوون و نە سەر ئاو کەوتن

دوو کورە هەرزەکارەکەش گەڕان، باریکترەکەیان پرسیی، "بەچیدا بزانین ماسییە ئینسانخۆرەکان نەیانبردوونە

ئەشکەوتە قووڵەکانی خۆیان. دەڵێن،
پادشا سەر چەکوچەکەیان دێتەدەرێ و تا تەواویان دەکەن، لەژێر پایە گەورەکانی پردەکە وەک پاسەوان دەسووڕێتەوە."
کوڕە بچووکترەکەیان گوتی، "من ئەو پادشا پیرەم دیوە، چاوێکی سەوزە و ئەوی دیکەی سوورە."
"نا ئەوەیان شاژنە ماسیی پاسەوانە، نێرەکەیان وەک گوللە دەر دەپەڕێ و نابینرێ."

***

عاشقەکانی بەغدا هەواڵەکەیان زانی، دەستی یەکتریان دەگرت و بە کەنارەکەدا هاتوچۆیان دەکرد. دیجلە وەک جەستەی دوو عاشقە ونەکە دەهاتە بەرچاو، کە ئەوەندەی دەکرێ درێژ ببۆوە.
کەمالی بەزاز چاوەڕوانی و مەرگی ونی کچەکەی شەکەتیان کردبوو، وەک منارەیەک بەسەریەکدا ڕووخابوو، لە بەڕێوبەری پۆلیسی پرسیی، "ئێستا چی، ئێستا دەتوانن چیمان بۆ بکەن؟"
بەڕێوبەری قاڵبووی کارەکەی گوتی، "من ئیدی هیچم لەدەست نایەت، بە پێی نامەکە و دیار نەمانیان خۆیان فڕێ داوەتە ناو ئاوەکە، بەڵام مەلەوانەکانم، شارەزاکانم هیچیان دەست نەکەوت و ئەوەش شتێکی دیکە دەڵێت."
"چی تر دەڵێت؟"
"تەنها جەستەیان بۆ ئێمە بەڵگەی مردنیانە کە نییە.

ناتوانین نامەی وەفاتیشیان بۆ بکەین."

بەڵقیس کە لەو ماوە دوورودرێژەدا لە نزیک ڕووبارەکە دوور نەدەکەوتەوە، شەو و ڕۆژ تەنها بانگی نیانی دەکرد، ئیدی بەتەواوی دەنگی کەوتبوو، تەنها بەئاستەم لێوی دەجوولایەوە.

ئەو خێزانە جەنگاوەرە وەک پاشماوەی سوپایەکی شکاو لە شەڕێکی خوێناویدا گەڕانەوە، بە هێزێکی نادیاری عاشقان هەلاهەلا ببوون، کەسێک نەبوو پێشوازییان لێ بکات، کەسێک نەبوو چیرۆکی پڕئازاریان بگێڕێتەوە، دۆڕانێکی بێدەنگ و ئەژنۆشکانێکی ترسێنەر، ئەو مەدالیا وەهەمیانەشیان لەدەست چووبوو کە پێیان وا بوو بە گوللەبارانکردنی عاشقەکان دەستیان دەکەوێ. نەیانتوانی کۆلان کۆلان بگەڕێن و بانگەوازی سەرکەوتنیان بە گوێی خەڵکدا بدەن. شاریش ئەوەندە ماندووە تاقەتی بیستنی هیچ کۆستێکی دیکەی نییە.

بەڵقیس وەک شاژنی مەملەکەتێکی دۆڕاو بەناو وڵاتی ڕووخاوی خۆیدا دەگەڕا، پایەکانی تەمەن و دیوار و ساپیتەی سەربانەکانی ژیانی بەسەر یەکدا تەپیبوون. وەک شارێکی دوای شەڕێکی کۆلان بە کۆلان هەموو شوێنێکی جەستەی دووکەڵ و تۆز و پاشماوەی ئاگری لێ بەرز دەبۆوە. بەڵقیس بە بالایەکی بەرز بەلام چەماوەوە، بە هەنگاوی هێواشەوە بەناو ئەو وێرانەدا تێدەپەڕی.

وەرزی گریانی بەڵقیس لەگەڵ ئەو وێرانەیە هاتبوو، وەرزێک تایبەت بە ژن، بەلام ئاخ بەڵقیس دڵۆپەفرمێسکێکی پێ نەمابوو. بە پێچەوانەی ئەو هەموو خەیاڵە سەمەرانەی کەمالی بەزاز، سلێمانی ماتەمێکی قووڵ و نهێنی و پڕشکۆ

بۆ کچە عاشقەکەی دادەنێ، ناوی ئەو کچە لە پەلکەزێڕینە دەنووسێ و بۆ هەمیشەش ناوی کەمالی بەزاز و کوڕەکانیشی لەبیر خۆی دەباتەوە.

کەمالیش ئیدی نایەوێ ناوی بێت و دوکانەکانی دەفرۆشێت و کوڕەکانی هەریەکەیان ڕوو لە وڵاتێک دەکەن. زەمەن هەموو شتیک دەهاڕێ، ئەوان هەموویان پیر بوون و تەنها عاشقەکەی نیان و سەروەر هەر وا بە گەرموگوڕی و گەنجی مایەوە. هەموو کچێکی قژزەردی زانکۆ کە بـــا قژە زەردەکەی دەلەراندەوە لای بەڵقیس، نیان بوو.

ئەو وڵاتە چەند شەڕی دیت و چەند کوشتاری تیدا بەرپا بوو، بەڵقیس هەستی پێ نەکرد، وردەوردە زەمەن لاق و دەست و گوێی لێ دەستاندەوە، ئەویش تەنها لە ساڵی کۆچی خۆیدا دەژیا، ساڵی کۆچی ئەو ئەو ڕۆژە بوو کە تا گەراج لەگەڵ نیان چووە گەراجی بەغدا. ئەو ڕۆژەی بەڕێی کرد بۆ بەغدا بۆ ئەوەی بخوێنێ، زەمەن لەو ساڵەوە دەستی پێ دەکرد، گەردوون لەو ساڵەوە جووڵا بۆ وردکردن و وێرانکردن. لەگەڵ نامەکەی سەروەر دیجلەش درێژ دەبۆوە. چاڵی دڵی دایک بەبێ تەرمی منداڵەکەی هەرگیز پڕ نابێتەوە.

دەتوانێ بەلارە لار بڕوات، ڕەش و سپی دەبینێ، کوورکوورِ بۆتەوە و گۆشتی پێوە نەماوە. بەڵام هێشتا سەردانی هەولێر دەکات، دەچێتە لای تانکییەکەی سەیداوا، ناڵێ (ئەڵێم) و دەڵێ (ئەرێم) ناڵێ (وەکو) دەڵێ (وەکی). هەر لەو شوێنە دادەنیشێ کە یەکەم جار لێی دانیشت و چاودێری ماڵی سەروەری دەکا، خۆ ئەوانیش لەوێ نەماون، ئەو گەڕەکە بەتەواوی شێواوە. تەنها کۆترەکان هێشتا بە

ئاسمانی دووکەلاویدا دەسووڕێنەوە، هێشتا کۆترێکی ڕەش وەک قیرووبنێشت بە کۆترە سپییەکەی دڵی ئەوەوە نووساوە.

کە سەردار گەڕایەوە هەولێر دوو شت گۆڕابوو، یەکەمیان خۆی، پێستی پیر و چەرمی گەردن و قژی ڕووتابۆوە و لاجانگ و سمێڵی سپی بوون، هەموو کچەکانی ئەورووپا نەیانتوانیبوو سمێڵە ستالینیەکەی پێ بتاشن. دووەمیان هەولێر بوو لەبەر قورسی کووڕ ببۆوە. ئەوەی وەک خۆی مابۆوە تەنها چیرۆکی ژنەکەی لای تانکی سەیداوا بوو، ئەو ژنە چەند مانگ جارێک دێت و بەرامبەر کۆلانەکان دادەنیشێ.

سەردار ماوەیەک بەدیاریەوە ڕادەوەستا، ئاخر ئەو ژنە چی پێ ماوە سەردار دەیەوێ لێی بستێنێ، چەند جار دەیەوێ بڕوات و نەیدوێنێ. بەڵقیس سەر بەرز دەکاتەوە، ئەوەندەی دەکرێ چاوی بچووک دەکاتەوە تا سەردار ببینێ. دەموچاوی دەگۆڕێت وەک ئەوەی سی ساڵی تەواو بگەڕێتەوە، دەیەوێ هەستێ، بەڵام هێزی لاقەکانی ئەو هەواڵەیان نەبیستووە و ناگەڕێتەوە، بۆیە ناتوانێ هەستێ، سەردار دەست دەخاتە سەر شانی، لەسەر زەویەکە لای دادەنیشێ، دەستە وەک کاغەز تەنکەکانی ماچ دەکات، سەد جار دەیخاتە سەر سەری، ڕاستە کانیی فرمێسکی دەمێکە وشکی کردووە، بەڵام سەردەمی گریانی بەڵقیس تەواو نەبووە، ئەوەی سەردار چاوەڕێی ناکات، ئەوەیە کە دەڵێ، "سەردار کوڕم جارێکی دیکە نامەکەم بۆ بخوێنەوە."

سەردار لەو هەموو عەزابە سەری دەسووڕمێ کە ئینسان دەتوانێ هەڵی گرێت و لە دڵیدا جێی بکاتەوە. کە سەردار نامەکە تەواو دەکات، بەڵقیس دەست بۆ خانووە کۆنەکەی

ماڵی سەروەر ڕادەکێشی، دەڵێ، "ئەو ژنە سەر ئاسنینە فێڵی لێ کردین، تۆش هاوکار و بەشداری بووی؟"

سەردار گوتی، "فێڵی چی؟"

"هەمووی فێڵ بوو، نامەکە، دیجلە و مردنەکە، هەمووی فێڵ بوو، دەمەوێ سۆراغێکیان بکەم بزانم لەکوێی شاردوونەوە."

سەرداری بێچارە چاوەکانی وشک نەدەبوونەوە، گوتی، "مەبەستت لە ئەو ژنە کێیە؟"

"مریەم، مریەمە ڕەش، دایکی ئەو هەتیوە."

"ئەو ژنە، دایکی سەروەر بیست ساڵیش دەبێ مردووە."

بەلقیس ئارامتر، 'ئەوانەی منیش هەموویان چوون، تەنها ئەو کچەم ماوە."

**٢٠١٦\١١\١٥ دەستم بە نووسینی کرد و**
**٢٤ تەمووزی ٢٠١٧ تەواو بوو**

سەردەمی گریانی بەڵقیس دووبارە نووسینەوەی داستانێکی ترە لە چەشنی لەیلا و مەجنون و لاس و خەزاڵ و مەم و زین. نەمرکردنی عەشقێکە کە پێنەگەیشتنی ئازارێکی ئەبەدی و پێگەیشتنی تیاچوونی جەستەیی و فیزیکییە.

سەردەمی گریانی بەڵقیس گێڕانەوەی چیرۆکی نیان و سەردارە لە چەشنی شیرین و فەرهاد. گێڕانەوەی قەدەغەبوونی عەشقێکی بێگەردە.

٨٠٠٠ دینار

